61

سۆن-تزو

# هونەری جەنگ







وەرگێڕانی

ڕەوف حەسەن

# هونـــەری جـــەنگ

لە شاکارە نەمرەکانی فیکری بەشەری

دانانی

سەرکردەو داناى دێرینی(چین)

سۆن - تزو

وەرگێڕانی

رەوف حەسەن

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان
www.roshnbiri. org
khanaywargeran@yahoo.com

- ناو کتێب: هونەری جەنگ
- ناوی نووسەر: سۆن – تزو
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ڕەوف حەسەن
- بابەت: عەسکەریی
- نەخشەسازی کۆمپیوتەر: جیهان محەمەد
- نەخشەسازی بەرگ: کەمال حامد
- زنجیرە: ٦١
- تیراژ: ١٥٠٠
- ژمارەی( ٤٠٠ )ی وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی پێدراوە.
- چاپخانەی :ژیار

## پێشەکی وەرگێڕ

نا.. نا... لە ناونیشانی کتێبەکەوە بەدگومانی داتنەگرێ و لێی مەسڵەمێوەو.. ختووورەی خراپیش بە دڵتدا نەیەت.. وای لێکنەدەیتەوە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ زمانی کوردی.. هاوبەشیکردنێك بێت بۆ گەشاندنەوەی ژیلەمۆی شەڕی میللەتکوژیی.. ناو هەرگیز ئەمە کاری ئێمە نەبووە.

جارێ راستییێك هەیەو با وەبیرتانی بێنمەوە.. سەرەتا دەپرسم: ئایا ئێمە خوا بۆئەوەی خولقاندووین هەتا هەتایە هەر خەریکی خۆخۆری و شەڕی خۆکوژی و کوڕکوژی و میللەتکوژی بین!؟

ئەی ئەوە نییە لەگەڵ سێ سیستمی جۆراوجۆرداو.. بە حوکمی قەدەرێکی قەرەقوشیانەو پیلانی نێونەتەوەیی بێمروەتانەو.. هەروەها بە حوکمی بوودەڵەیی و ساویلکەیی و بزری هەستی نێوکۆیی نێوخۆشمان ساڵەهای ساڵە لەتەکیاندا خراپ تێوەگلاوین!؟

سیستمی عەلمانی کۆماری تورکیا و.. رژێمی (سیۆکراتی)و ئاخوندەیی کۆماری ئیسلامی ئێران.. هەردوو رژێمی تاکە حیزبیی– بەعسیی– لابراوی کۆماری عیراق و– بەعسی بەردەوامی– کۆماری عەرەبیی سووریا.. وێڕای جیاوازیی هێجگار زەقی نیوان پێکهاتەی سیستماتیکی و سیاسی و ئایدولۆژییاندا..هەروەها لەگەڵ دوژمنایەتی و ململانێی دێرینی نیوانیاندا.. هەمیشە سیاسەتی

شــوڤێنیانەی نەتــەوەی باڵادەســتیان دەرهــەقمان پیــادەکردووەو دەشــیکەن.. شەڕیشــیان لەگەڵــدا نەکــەین ئــەوان ڕێبــازی شــەڕ پێفرۆشتنمانیان گرتۆتەبەر.. راستە ئێمەی کورد تا نها هێندەی (میرنشین‌و ئاییخوازو حیزب)ەکانمان ڕێبازی کوردکوژی‌و کورد بەکوشتدانیان گرتۆتەبەر.. هێندە لە بەرامبەر شەڕفرۆشتنەکانی سیستمە دەرودراوسیێ‌و.. (برا!) گەورەکانمان وەجواب نەهاتوون‌و.. بۆیان وەمەیدان نەکەوتوون.. خۆ ئەگەر دەستەوتاقم‌و لایەنێك لێبڕاوانە چاکی مەردایەتی‌و جوامێرانەیان لیکردبێ بەلاداو.. بۆ سەندنەوەی مافە هەرە سەرەتاییە ئینسانییە پێشێلکراوەکانمان هاتبنە مەیدان.. ئەوا هەر زووبەزوو دەستەو تاقم‌و حیزب‌و لایەنی خۆمانەی دی.. لێبڕاوانە وەپێش داگیرکەر کەوتوون.. تاکو نەهێڵن شەرەفی وەدەستهێنانی ماف‌و چارەنووسی نەتەوەکەمانیان پێببڕێت‌و.. لەم شەرەفەدا وەپێشیانکەون.. من بەشبەحاڵی خۆم.. تەنانەت لەم هەڵوێستەشدا کەمتازۆر هەق بەوانەشدەدەم.. بەمەرجێ ئەوانە ددان بەوەدا بنێن.. کە دەسبەرداری کێشەی بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەکەیان بوون‌و.. تەنیا ململانێیێکی ئاسایی لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییە تایبەتییێکانی خۆیاندا دەکەن‌و.. لەم حاڵەتەدا کێبەرکێی رەوای خۆیان بۆ مانەوەو دەسەڵات دەکەن.. هەر ئەم دژوارییانەش بوو وایکرد.. بەدرێژایی مێژووی سەدان ساڵەی شۆڕش‌و راپەڕین‌و یاخیبوونی(میرنشین‌و ئاییخوازو حیزب) نەتوانن قەوارەییێکی سیاسی مەعقوول پێکبهێنن‌و.. کەچی لە هەلومەرجێکی تایبەتمەندو لەبارداو.. لە مودەتی چەند رۆژێکدا.. میللەت رابوو..

راپەڕینە جەماوەرییێکەی هێند بە زەبرو بەعس تۆقێن بوو.. پیلانی کۆڕەوو شەڕە قێزەونە بەردەوامەکەی دەسەڵاتە فیفتی فیفتییێکەش نەیانتوانی ئەو قەوارەو دەسەڵاتە سەربەخۆیە بەرەو باوەشی بەعس بەرنەوە.

بە هەر حاڵ و لە لاوازترین حاڵەتدا.. ئەگەر هەر لەسەر شەڕی چەپەڵی میللەتکوژیش بەردەوامبووین.. خۆ هەر هیچ نەبێت دانەری ئەم کتێبە چەردەییێك لە پرەنسیپەکانی ئەخلاقی شەڕمان فێردەکات کە تا ئێستە پێمان نەزانیون و.. جەختیش لەسەر پێڕەوکردنیان دەکات.. کە تا نەهۆ پێڕەومان نەکردوون.. ئەی ئەوەنییە هەر شەرکەرێك و دەرەجەدارێکی عەسکەریی و حیزبیی هەڵدەستێ و.. نە هەر سەبارەت بە جەنگ.. بەڵکو لەمەڕ سیاسەت و تەنانەت ژیانیش دەمدەکاتەوە.. یێکسەر پێماندەڵێ: برالە شەڕو سیاسەت ئەخلاقیان تیانییە!!.. بێگومان مەبەستیان لەم بیانووە گەوجانەیە.. -کە وادەزانن فەلسەفەیە!!- دەخوازن شەرعییەت بە بێمروەتی و تاوانکاریی و درندەیی و وەحشێتی خۆیان بدەن.. جا ئیدی ئەم هەمەجێتییە بەنێوی رێسای ئایین و ئاسمانەوە بێت.. یان بەنێوی عەلمانی و مۆدێرنەو یاسای زەمیینەوە بێت.. لە دێرزەمانەوە -وەك لە بەندو برگەو ئێمارژەکانی نێو ئەم کتێبەدا دەیبینین- لەلایەن زەمین و ئاسمانیشەوە بەنەفرەتکراوە.. وابزانم زێدەڕەوی ناکەم گەر بڵێم: ئەم شاکارە فیکرییە -وێڕای زانستە دانسقەو هونەرە مەزنەکانی جەنگ- هەوڵدانێکی بەرزو پیرۆزیشە لە پێناوی گەشەپێدان و گواستنەوەی ژیان لە قۆناغی ئاژەڵیی و جەنگەڵستانەوە بۆ قۆناغی مرۆڤایەتی.

(هونەری جەنگ) نوسراوێکی کۆنی زێتر لە دووهەزارو پێنجسەد ساڵ لەمەوبەرەو.. بیریارو داناییێکی مەزنی (چین)ی ئەو سەردەمە (سۆن-تزو) دایناوە.. لەمەیشدا گەلێ مەبەستی هەبووە.. یێکێ لەوانەش کە لە زۆر بەش و پەرەگرافی ئەم کتێبەیدا جەختی لەسەر کردووە.. ئاکارو رەفتارە مرۆییێکانەو.. دەبێ لە جەنگیشدا فەرامۆشیان نەکەین.. چونکە بەلای ئەوەوە دەبێ جەنگ لە پێناوی ئامانجێکی بەرزو پیرۆزدابێت.. نەك بۆ بەرژەوەندیو تەماحو تالآنیو تیرۆرو خوێنرشتنو داگیرکردنی خاكو نیشتمانی میللەتانی دی بێت.

مەبەستی سەرەکی ئێمە لە وەرگێرانی ئەم شاکارە نەمرەی فیکری بەشەریی ئەوەیە.. رۆڵەکانی نەتەوەکەمانو هەروەها سەرکردەو دەسەلآتدارانی شەرەنگێزیش- ئەو هەقیقەتە تێبگەن.. هەزاران ساڵ لەمەوبەرو.. بەبێئەوەی جارِی گەردوونی مافەکانی ئینسانو.. رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتیو.. رێکخراوی چاودێریکردنی مافی ئینسانو.. رێکخراوی ئازادی ویژدانو.. سەدانو هەزاران دەزگەو دادگەو راگەیاندنی نێوخۆییو جیهانیی دی بۆ هەمان مەبەست لەکاردابن.. کەمتازۆر پێرەوی ئەو پرەنسیپە مرۆڤایەتیانە کراوە.. کە ئێستەو لەسەردەمی جیهانگەراییو تەکنۆلۆژیای سیستمی ژمارەیی راگەیاندنو پێوەندیکردندا.. لە زۆر رووەوەو زۆر لایەنیشەوە.. نە هەر لە جەنگدا پێرەویی ئەو پرەنسیپانە ناکرێ.. بەڵکو لە سیاسەتو ژیانی ئاساییشدا مامەڵەو رەفتاری تا سەر ئێسقان درِندانەو وەحشیانە دەرهەق بە یێخسیرو زیندانیو خەڵکی سڤیلو بێدیفایش لە ئارادایە.

راستە کتێبی (هونەری جەنگ) پڕێتی لە زانستو هونەرە جۆربەجۆرەکانی شەڕو پێکداداناو هێرشو گەمارۆدانی شارو بەرگریکردنو کشانەوەو هەڵاتنو.. هەروەها زاراوەو ئیدیۆمو رووداوو نموونە جۆراوجۆرەکانی شەڕ.. بەڵام هەر لە دووتوێی ئەمانەدا.. فێری ئەوەش دەبین چۆن بژین! چونکە ژیان بۆ خۆی جۆرێکە لە جەنگو ململانێ.. بەڵکو ململانێو جەنگێکی حەقیقی بەردەوامە.. بەڵام بە بیرو نەخشەوچەكو تفاقو کەرەسەی جیاواز.. لەپێناوی هەمان مەبەستی شەڕی پیرۆزدا.. بۆ لێسەندنەوەی مافی زەوتکراو لە ملهوڕانو گەڕاندنەوەی ئەو مافانە بۆ خاوەنە شەرعییەکانی.. جا ئیدی هەر کاتێ ئەم ئامانجە مەزنوپیرۆزە داوای قوربانیدانیش بکات.. مرۆڤی سڤیلی بێ چەكو جبەخانەش بەدەم بانگەوازییەوە دەچێ.. ئەمە پرەنسیپێکی سەرەکیو ئامانجێکی ئاشکرای ئەم کتێبەیە.

بەپێی سەرچاوە دێرینەکانی (چین).. کاتێ دانەر دەسنووسەکانی ئەم نوسراوەی پێشکەش بە شاهەنشای وڵاتی (چی) دەکات.. لە گفتوگۆ لەگەڵیدا پێناسەی جەنگ بەمشێوەیە دەکات:

جەنگ: خەتەرناکترین ساتەکانی ململانێی مانەوەی ئابڕوومەندانەیە بەرامبەر دوژمنو مێژوو.

شەڕیش بەلایەوە دوو چەشنە:

(یێکەمیان: جەنگی بەرگری لە کەرامەتو.. پاراستنی ئاسایشی وڵاتو.. تۆڵە لە دوژمن سەندنەوەو.. گەڕانەوەی ئەو شتانەی دزیونیو داگیریکردوون.. لە خاكو ئازووقەو گیانو تالانی -خاکی

باوباپیرانمان و خێزانمان و کولتوورمان و گۆڕی باوباپیرانمان و بەشێك لەو کەلەپوورانەی مایەی شانازیمانن.

جۆری دووەم: جەنگەکانی فراوانکاری و داگیرکردن:

ئەمەشیان جۆرێکە لە شکۆمەندیی.. گشت ئەوانەی تەبیعەتی چاوچنۆکی و هەڵپەهەڵپیان تێدا زاڵە لە دوورو نزیکەوە شالاو بۆ راوکردنی خەڵکی دەبەن.. ئەمەش لەپێناوی بەرز راگرتنی شکۆی ئاسماندا نا.. بەڵکو لەپێناوی سەروەرییێکی ساختەو نەخۆشانەی نێو زەینی خۆیان.. بۆ دزین و بەزۆر لێسەندنی ئەو زەوی و میراتی و کەرامەت و مافانەی ئاسمان بە خەڵکی بەخشیون.)

دانەر لە گەڵێ شوێنی ئەم کتێبەدا ئێماژە بە لایەنی پیرۆزی و پرەنسیپە ئەخلاقییێکان و رەوایی جۆری یێکەمی جەنگ و دەدات و.. دژی جۆری دووەمیان دەوەستێنەوەو.. بە رەفتارێکی دڕندەو وەحشیانەی دادەنێت.

لە بەشی هەشتەم بڕگەی ١٦ دا دەڵێت :

"دەبێ لە خەسلەتی دوژمناندا ئەوە هەبێت.. کە قەومێکن و مافی تۆیان دزیوە.. یان خۆیان بۆ دزینی ئەو مافەت مەڵاسداوە.

ئەگەر دوژمن مافتی دزیبوو.. ئەرکی ئەستۆتە بۆ سەندنەوەی ئەو مافە.. دەسبکەیتە هێرشبردنە سەری.

ئەگەر دوژمن هەڕەشە لە هەق و سەلامەتیت دەکات.. پێویستە لەسەرت هەمیشە لەوپەڕی ئامادەباشیدا بیت بۆ نابووتکردنی هێرشەکانی."

دانەر لەوە بێگومانە.. کۆشکی شکۆمەندیی و مەزنی شاهەنشاو سەرکردەکانی سوپا لەسەر جومجومەکانی پیرو ژن و منداڵ و پەککەوتەو خەڵکی بێدیفاع و سڤیل بنیاتنانریٚ و.. ئەنجام هەر ریسوایی و نەفرەت چنینەوە دەبێت.. بۆیێ ئەو چاوچنۆك و لاسارو لەخۆباییبوانەش بە گەوج دادەنیٚ و لە برگەی(١٤)ی هەمان بەشدا پێیاندەڵیٚ:

"ئەوەی هەرەشە لە هاوسێکەی دەکات و دەیتۆقێنیٚ.. ئەوە ناتوانیٚ بەسەریدا زاڵبێت.. بەم کارە گەوجانەیەی کێشە بۆخۆی دەخولقێنیٚ و.. ئازارو زیان بەخۆی دەگەیێنیٚ."

(سۆن-تزو).. هێندە وێنەو ئیماژەی جوان و ئەوپەڕی مرۆڤپەروەرانەمان لەمەڕ چەك و جەنگ و کوشتار نیشاندەدات.. (مۆ-تۆ)ی گەورە دانای ئەو سەردەمە دێرینەی (چین).. لەمەڕ فەرموودەکانی برگەی (٨)ی هەمان بەشدا بڵێت:

"شەڕو پێکدادان و چەکەمەنییەکان.. بەهاو سامی خۆیان هەیە.. چونکە مەبەست لە چەك ئەوەیە.. کارو کردەوەیێکی وای پێهەڵسووڕێنی.. نەریت و رەوشتی بەرز پێی قایل نەبێت.. وەك کوشتن (بەنوونە).

سەرکردەی سوپا (وەزیری مەرگ)ە.. هاوەڵ و سەربازانی دەست و پێوەندگەلێکی دەسەڵاتدارن بەسەر دوژمنەوە .

ئەرکی جەنگ ئەرکێکی پیرۆزە.. بە مەرجیٚ ئامانجەکانی بەرزو پیرۆز بێت و.. ئاسمان لێی رازیبێت."

کاتێ (سۆن تزو).. جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەرچەنیش جەنگەکە ڕەواو پیرۆزیش بێت.. وەلێ هەردەبێت ئاگاداربین بەها مرۆڤایەتییەکان وەژێر پا نەخەین و.. وانەزانین شەڕ هەر کوشتوبڕو وێرانکارییەو.. لە بەشی سێیەمدا دەفەرموێت:

"پەسەندترینی سیاسەتە عەسکەرییەکان و کارامەترین شێوازی جەنگ ئەوەیە: سوپا بە کەمترین وێرانکاریی بتوانێ بەسەر هەموو خاکی دوژمندا زاڵبێت.

ئەو سەرکەوتنە عەسکەرییە کاولکارییەی بەئێجگاری خاکی دوژمن بەتوورەکە دەبێژێ و دەیکاتە وێرانە.. ئەمە نزمترین پلەی سەرکەوتنە لەنێو پلەکانی سیاسەت و کارامەیی عەسکەریدا."

هەروەها لە برگەییەکی دیکەدا بەجۆرێکی زانستیانەتر دووپاتیدەکاتەوە:

"لە بنەماکانی کارامەیی عەسکەریدا.. وا بەپەسەند دانانرێ سوپاییێک بە صەد پێکداداان ئەمجا بەسەر دوژمندا زاڵبێت.. بەڵکو واچاکترە بە کەمترین زیان و کورتخایەنترین شەڕ دوژمن تێکدەیت و.. بەسەریدا زاڵبیت."

دانەر هەر بۆئەوەی کەمترین خوێن بڕێژرێ.. هانی سەرکردە ئازاو بە سەلیقەکان دەدات.. هەوڵی بێخسیرکردن بدەن نەك کوشتن:

"وا پەسەندترە هێزی دوژمن بێخسیربکەیت نەك تێکیشکێنی.. سوپاییێك یان فەصیلێك یان هێزێکی عەسکەریی بە هەموو تفاقەکانییەوە بگریت باشترە لەوەی بە تفاقەوە تێکیشکێنی."

بۆ مامەڵەی یێخسیری جەنگ.. کەسمان نییە نەزانیٚ و بۆ خۆیشی نەیدیبیٚ چ بەدەست جەندرمەکانی سبستمە داگیرکەرەکانی کوردستانەوەو.. چ لە سەروبەندی شەڕە نێخۆییێکانماندا.. چەند نامەردانەو بێمروەتانە نە هەر پەتپەتی بە یێخسیرەکان کراون.. بەڵکو بە هەمەجیانەترین شێوەش کوژراون.. کەچی سەرکردەیێکی جوامێری وەك (سۆن–تزو).. لەو مێژووە دێرینەوە داوامان لێدەکات و دەڵێت:

"لەگەڵ یێخسیرەکانی جەنگدا جوامێرو میهرەبانبە !"

دانەری (هونەری جەنگ).. بایێخێکی هێجگار زۆرو لە هەموو روویێکیشەوە بە کەسی سەرکردەی سوپا دەدات.. هەر لە دانایی و لێهاتوویی و بەسەلیقەیی و زۆرزانی و دادپەروەری و.. هەروەها جۆری شەخسییەتیشی.. تا چەند رێزدارو خۆشەویست و بەهەیبەت و دڵسۆزی سەربازو ئەفسەرەکانەو.. چۆن خۆی لێیان جیاناکاتەوەو بەرلەوان زەبری جەنگ دەچێژیٚ و یێکەمینە ماندوودەبیٚ و....هتد.

(سۆن–تزو) بەر لە هەر شتێك باسی گیانی لەخۆبوردەیی سەرکردە دەکات و.. قوربانیدانی بە بەرژەوەندییێکانی لەپێناوی نەتەوەداو دەفەرمویٚ:

"بەرزو بەهادارترین نموونەی سەرکردەی عەسکەریی ئەوەیە.. ناوبانگ و شکۆمەندیی شەخسیی خۆی مەبەست نییە.. بەڵکو سەرکەوتنی نەتەوەیی مەبەستە."

کاتیٚ دیٚتە سەر باسی پیٚوەندیی نیوان سەرکردەو سەربازەکانی.. جەخت لەسەر ئەوە دەکات هیٚندەی باوك‌و فرزەن بەتەنگ یێکەوە بیٚن‌و.. دەفەرمویٚ:

"پیٚوەندیی سەرکردە بە سەربازانەوە.. دەبیٚ وەك پیٚوەندیی باوك‌و کوڕبیٚت.. ئەگەر دڵسۆزانە بایێخی بە کاروباریان دا.. ئەوا ئەوانیش ریٚزو خۆشەویستیان بۆی دەبیٚ‌و.. تا مردن پشتگیری دەکەن."

لە شرۆڤەکردن‌و تاوتویٚکردنەکانی (مۆ-تۆ)ی دانادا.. بۆ پشتگیری ئەم بیرو بۆچوونەی (سۆن-تزو).. ئەم نموونەیەدیٚنیٚتەوە:

"لە سەروبەندی شەڕوشۆڕی (میرنشینە بەشەڕهاتووکان)دا.. نیٚودارترین‌و لیٚهاتووترین‌و سەرکەوتووترین‌و لە هەموویان براوەترین سەرکردە لە جەنگەکاندا.. (ڤۆ-چیٚ) بوو.. ئەم سەرکردەیە.. هەموو شەویٚك کون‌و قوژبنی ئۆردووگەکەی دەگەڕا.. بە دەستی خۆی خۆراکی بۆ ئەو ئەفسەرانە دەبرد لە شەڕدا دوژمن پیٚکابوونی‌و.. بەخۆی دڵنەوایی دەکردن.

ئەم سەرکردەیە سادەو بیٚفیزبوو.. خۆی ئازووقەی خۆی هەڵدەگرت.. بەردەستەکانی بۆ کاروباری تایبەتیی خۆی بەکارنەدەهیٚنا."

ویٚرای ئەم نموونانەو گەلیٚ نموونەی دی لەو لایەنە مرۆییی‌و ئەخلاقییە جوامیٚرییانەی لای ئەم دانەرە دانایەو بۆ ساتەکانی شەڕ ئاوڕیان لیٚدراوەتەوە.. بەلام سەرلەبەری کتیٚبەکە باس لە زانست‌و زانیاری‌و وردەکارییەکانی هونەرەکانی جەنگ دەکات.. ئەمەیشی

بەسەر سیانزە بەشدا دابەشکردووەو.. هەربەشێکیشی وەك لە ناو نیشانەکەیدا دەیبینین تەرخانە بۆ ییێکیٚ لە بابەتەکانی جەنگ.. وەك: هەلومەرج و ستراتیژیەت و هێرش و کشان و کشانەوە و فروفێڵ و هەواڵگری...هتد. پێدەچیٚ تاکو ئێستەیش هونەرەکانی جەنگ هەر لە بازنەی ئەو سیانزە بابەتەدا بخولێتەوەو.. بابەتی سەرەکی دیکەی نەچووبێتە سەر.. مەگەر بەتەنیٚ لەرووی بەکارهێنانی ئامێرە تەکنۆلۆژییێکانەوە نەبێت.

***

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەوەتان پێبلێم.. ئەم کتێبە لەزمانی سێیەمیشەوە -نەك دووەم- وەرمگێڕاوەتە کوردی.. چونکە -وەك وەرگێری عەرەبی (عمر حليق) لە پێشەکییێکەیدا دەلێت- تەنیا سەرچاوەییێکی غەیرە چینی و تاکە زمانێك لە چینییەوە ئەم دەقەی بۆ وەرگێڕرابێت زمانی ئنگلیزییەو..ساڵی ١٩٦٠(جەنەڕاڵ گریفیس) وەریگێڕاوەو.. بەشرۆڤەو پەراوێزلێدانەوە کردویێتییە نامەی دوکتۆراو.. پێشکەشی زانکۆی ئۆکسفۆردی کردووە.. (عمر حليق) وەر گێری عەرەبیش لەوەی جەنەراڵەوەو منیش لەوەی (حەلیق)ەوە وەرمانگێڕاوە.

مەتنی سەرەکی ئەم نوسراوە بریتییە لە ١٣ بەش و.. هەر بەشێکیش بریتییە لە چەند فەرموودەییێکی (سۆن-تزو)و..هەر فورموودەییێکیشی ژمارەی تایبەتی دراوەتیٚ.. ئەمجا وێڕای بۆچوونەکانی خۆی و.. هەر لە سنووری مەتنەکەشدا.. دوای هەر

خاڵێـك‌و بـه‌پێی پێویسـت.. فـه‌رمووده‌و ئـه‌زموون‌و نموونـه‌و بـیرو بۆچـوونی دیكـه‌ی دانایـان‌و بیرمه‌نـدان‌و سـه‌ركردانی عه‌سـكه‌ریی به‌سـه‌لیقه‌و بـه‌هره‌دارانی كـۆن‌و نـوێی ئـه‌و سـه‌رده‌مه‌ی وڵاتـی چینی كردوونه‌تـه سه‌رچـاوه.. وه‌ك﴿(مـۆ-تـۆ)و (هـو-یـان-هسـی)و (لی-شوان)و (چانگ-یو)و (تساو-تساو)و (چانگ-هاو)و (چانگ-لی)و.. گه‌لێكی دی﴾و.. بابه‌ته‌كه‌ی پێ ده‌وڵه‌مه‌ندكردووه.

وه‌رگێـڕی عـه‌ره‌بییش.. دوای وه‌رگێڕانـی سـه‌رجه‌می ئه‌وانـه.. به‌خۆیشـی‌و بـه سـوودوه‌رگرتن لـه گـه‌لێ سه‌رچـاوه -پێموایـه كرینگترینیـان ئـه‌و تۆژینـه‌وه‌و په‌راوێزلێدانانـه‌بن.. لـه تێـزی دوكتۆرینامـه ئنگلیزییێكـه‌ی(جه‌نـه‌ڕاڵ گریڤیـن)دا هـاتوون‌و.. (حلیـق) به‌ڕاشـكاوی ئێمـاژه‌ی پێنـه‌داون- ئـه‌ویش چـوار به‌شـی دیكـه‌ی نووسیوه‌و له‌دوای كورته پێشه‌كییێكه‌یه‌وه دایناوه.

وه‌رگێڕی عه‌ره‌بیی له‌مه‌ڕ ژیان‌و رۆژگاره‌كه‌ی(سۆن-تزو)ی دانـه‌ر.. هه‌نـدێ راو بۆچـوون‌و زانیـاریی گومانـاویی سـه‌رده‌می(چین)ی كـۆنی نووسـیوه‌و خـۆی لێیـان دڵنیـا نییـه.. به‌تایبـه‌تی لـه‌و رووه‌وه ئـاخۆ دانه‌ری(هونـه‌ری جـه‌نگ).. خـۆی سـه‌ركرده‌یێكی بلیمـه‌ت‌و بـه‌هره‌دارو به‌سـه‌لیقه‌ی عه‌سـكه‌ریی بـووه.. یـاخود هـه‌ر بیریـارو دانـا و تـۆژه‌رێكی ئه‌و بـوارو مه‌یدانـه بووه!!.. ئـه‌م گومانـه زێتر ته‌شـه‌نه‌ده‌كات.. تا ئـه‌و راده‌یه‌ی خۆی له‌وه ده‌دات.. ئاخۆ ئه‌م(سۆن-تزو)ه به‌ڕاستی هـه‌بووه‌و كه‌سـێكی ناسـراو بـووه.. یـان هـه‌ر نـاوێكی وه‌همیـی یـان نـاوێكی خواسـتراوه‌و.. خاوه‌نه‌كـه‌ی رووی نـه‌هاتووه یـان نـه‌یوێراوه خـۆی ده‌رخـات!.. چـونكه لـه‌و رۆژگـاره‌دا -وه‌ك ده‌ڵـێن- سـه‌ركرده‌ی

عەسکەریی هێندە خۆی بە مەزن و زۆرزان و لێهاتوو زانیوە.. ڕێنمایی و زانیاری لە کەس قوبووڵ نەکردووە.

وەلێ نازانم چۆن(حليق) هەر هیچ نەبێت ئەو گومانەی پێشووتری لەمەڕ دانەر روون نەکردۆتەوە... ئاخۆ (ئەهلی قەڵەم بووە یان هی شمشێر)!.. چونکە(سۆن-تزو) خۆی لە هەندێ لە بڕگەکاندا ئێمارژە بەوە دەدات.. سەرکردەییێکی عەسکەریی بووە.. بەتایبەتیش لە خاڵی (٢٥)ی بەشی یانزەهەمدا.. بەراشکاوی باسی ئەو هەڵمەتە عەسکەرییانە دەکات بەخۆی سەرکردایەتی کردوون و دەڵێ:

"لە هەڵمەتە عەسکەرییێکانمدا.. بەوە شادمانبووم ئەفسەرانێکم لەتەکدا بوون.. وەدووی دەوڵەمەندبوون نەدەکەوتن.. لەبەرئەوە نا رقیان لە پارەو سامان بوو.. بەڵکو فەزڵی ئەرکەکەیان بەسەریدا دەدا.. باکیشیان لە مەرگ نەبوو.. لەبەرئەوە نا ژیانیان دەبوغزاند.. بەڵکو رەزامەندیی ئاسمانیان دەویست."

وەرگێڕی عەرەبی سەرباری هەندێ بەراوردکاریی لەنێوان ئەو رۆژگارە دێرینەو ئەم سەردەمە نوێیەو.. باس لە بەهرەمەندبوونی گەلێ سەرکردەی عەسکەریی وەك (ماوتسی-تۆنگ و ستالین..)و.. ئەوجا گەلی جوولەکەش.. لەم درێژەپێدانەیدا توانج و تەنانەت سووکایەتیش بەخۆیان و بیروبۆچوونیشیان دەکات و.. سەرباری ئەمانەیش هەر لەنێو مەتنەکەیشدا تاوەناتاوێ نموونەو باسێکی شەڕی (فەلەستین-ئیسرائیل)ی تێکەڵدەکات.

منیش لەمبارەیەوە وام بەپەسەند زانی.. هەر (١٣) بەشەکەی دەقەکە بەتەنێ و بە پاکی و بەبێ ئەو تێبینی و بۆچوونانەی (حليق).. هێندەی لەتوانامدابێت و هێندەی بابەت و وەرگێڕانە عەرەبییێکەش دەرفەتم بداتێ بەزمانێکی رەوان بیگەیەنمە خوێنەری کورد.

لە کۆتایدا بە پێویستی دەزانم جەخت لەسەر ئەوە بکەم:

"ئەو رۆژەی نەفیری جەنگ لێدەدرێ.. چەند دڵۆپێ فرمێسك دەڕژێنە سەر گۆناكان."

با ئێمەیش لەم سەردەمە مۆدێرن و پۆست مۆدێرنەدا ئیدی بەس چاومان بە خوێن سووربێ و..با بەر لە هەڵمەتە دڕندانەكانمان بۆ سەر یێكدی.. تەنیا بۆ چركەساتێك بیر لەو فرمێسكانەی دەڕژێنە سەر گۆنای ئازیزان و نازداران و دڵداران بكەینەوە.. كە نە هەر تەنیا دڵۆپێكی زۆر لەو تەخت وتاراج و كورسی و دەسەڵات و سامان و فیزلێدانەكانتان مەزنترە.. بەڵكو دەشبێتە لافاوی نەفرەتی مێژوو بەدوای ملهوڕانەوەو.. ئیدی لێبوردنیش مەحاڵە.

**ڕەوف حەسەن**

**سلێمانی/ ٢٠٠٤**

# بەشی یێکەم

## هەلومەرجی جەنگ[1]

---

[1] مەبەست لە (خەملاندن) یا(هاندەرەکان) یا (هەلومەرجەکان) یا (پێچوپەناکان)ەی جەنگە

( سۆن - تزو ) دانەری ( هونەری جەنگ ) فەرموویەتی :

١-جەنگ چالاكییێكی دەوڵەتەو.. كێشەی مان و نەمانو گەشەو وێرانبوونی گەل و نەتەوەیە.. بۆیێ دەبێت بەوردیو لەهەموو روویێكەوە باری عەسكەریی هەڵسەنگێنرێت .

( لی - شوان )ی دانا فەرموویەتی :

"پێدەچێت چەك پاچی خراپەكاری بێت".. وەلێ جەنگ كێشەییێكی گرینگەو.. گەر كەوتە دەستی پیاوانی نەزان.. ئەوە كارەساتێكی مەترسیداری (نەتەوەییە)

٢- كەواتە پێویستە چارەسەری هەلومەرج و پێداویستییێكانی جەنگ لەسەر پێنج هۆكاری سەرەكی بكەین و.. ئەمجا بە حەوت پێوەری دی.. دواتر باسیاندەكەین.. بەراوردییان بكەین، یان بیانكێشینو ئەندازەیان بگرین.

دەتوانین پێگە بنەرەتییە وەبەرچاوگیراوە عەسكەرییێكان لەم چێوەیەدا دەستنیشانبكەین.

٣- یێكەم هۆكار (لەم پێنجە) هۆكاری ئاكارییە.. لایەنی (مەعنەوی، دەروونی، بەهێزی، لاوازیی و.. پێوەندییان بە فەرمانڕەواوە -دڵسۆزیو بەتەنگەوەهاتنی گەل بۆی- دەگرێتەوە .)

دووەم هۆكار كەش و هەوایە

سییێەم چۆنییێتی تەبیعەتی زەوییە

چوارەم سەركردایەتیو

پێنجەم بڕوایە [٢]

**( چانگ-یو ).. داناییکی دی ( چین )ی کۆنە فەرموویەتی :**

ئەو پۆلێنکردنەی باسکرا.. (پێنج هۆکارەکە).. پۆلێنکردنێکی دروستە .

تەیارکردنی هێزی عەسکەری بۆ دەرزدادانی ئەوانەیە گاڵتەو لاقرتێ بە حورمەتی گەل و وڵات دەکەن .

هەر لەسەرەتای دەستدانە کاروباری بەرگریکردنی عەسکەریو.. خۆ ئامادەکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن.. پیاو ماقووڵو دەم سپیانی وڵات لە پەرستگەکەیاندا بۆ راوتەگبیر کۆدەبنەوە.. تا ئەوە ساغبکەنەوە.. ئاخۆ ئەو فەرمانداریێتیو دەسەڵاتداریێتیەی لە وڵاتدا لەسەر تەختە دروست و رەوایە .. یان نا؟! خەڵکیش تا چەند بڕوای بە دەسەڵاتدارییێکە هەیە!.

ئەوجا باسی بارودۆخی کەشوهەواو ئاڵوگۆڕەکانی لەو وەرزەی ساڵدا.. دەکرێت.. (ئاخۆ لەگەڵ کاروباری عەسکەریدا دەگونجێو لەبارە.. یان بە گرفت و کێشەیە؟!).. دواتریش لەمەڕ تەبیعەتی زەویو نەبەردەکانی جەنگ (تۆبۆگرافیا) دەئاخڤن.

---

[٢]- دانەری کتێبەکە مەبەستی لە بڕوا (بنەما فکریو پێڕەوەکانی باوەڕو ئیمانە.. چ لای کاربەدەستان و چ لای خەڵکی.. هەندێ توێژەرانی (چین)ی کۆن وای لێکدەدەنەوە.. مەبەست لە (بڕوا) لەم کتێبەدا وأتا ئایین.. یان (رێگەی راست).. یاخود (بەربەستە ئاسمانییێکان) .

دوای هەڵسەنگاندن و تاوتوێکردنێکی وردو تێروتەسەلی ئەم سێ هۆکارە.. سەرکردەی عەسکەریو بەرپرسی هێرشبردن و دامرکاندنەوە هەڵدەبژێرن .. ئیدی هەر کە هەڵمەتی عەسکەری لە سنووری وڵات بەودیودا چوو.. سەرجەم بەرپرسییە یاساییو شتەکانی دیکەیش دەکەونە ئەستۆی سەرکردەی عەسکەریی.

٤- مەبەستم لە هۆکاری (ئاکاری- ئەخلاقی- مۆراڵی) ئەوپەڕەنسیپانەیە پێوەندی خەڵکی بە دەسەڵاتدارانی حوکمەوە رێکدەخات.. تا چەند هەردوولا (گەل و دەوڵەت) پێکەوە تەباو گونجاون.. تاکو بەراستیو دروستی پابەندی ئەرکەکانی حوکومەت بن و.. لە ژیان و گوزەراندناو.. هەروەها لە قوربانیدان و فیداکاریدا.. بەبێ هیچ دوودڵیو ڕاڕاییو سڵەمینەوەو ریاکارییێك پشتگیریبکەن .

**( چانگ-یو ) وتویەتی :**

"ئەگەر ڕەفتاری دەوڵەت بەرامبەر خەڵکی لەسەر بنەمای دڵسۆزیو دانایيو دادپەروەریو ویژدان و میهرەبانیبوو.. ئەوا گشت بڕواو متمانەی خۆیانی پێدەبەخشن و.. بە دڵو بەگیان لەتەك سوپاشدا یەکانگیر دەبن و.. هەمووشیان (حکومەت و گەل و سوپا) یەکدی تەواودەکەن و.. لە هەڤاڵبەندییێکی ڕەسەنی یێکگرتوودا لە خزمەتی یەکدیدا دەبن.

لە (کتێبی ئەحواڵ)دا [٣] هاتووە:

---

[١] نوسراوێکی ئایینی دێرینە

"بــەختیاریی‌و ئاســوودەگیی وا لــە خــەڵکی دەکــات بەســەر گرفتەکانیـدا زاڵبێـت و.. بەمـەیش دەتـوانن بێسڵەمینەوە رووبـەڕووی مەرگ ببنەوە."

٥- مەبەستیشــم لــە هۆکــاری (کەشــوهەوا) کــارتێکردنی رەگــەزە سروشــتییێکانە.. لــە زەبــری ســەرماو ســۆڵەی زســتان و گــەرمای هاوینـەو.. رۆنـانی کـارە عەسـکەرییێکانە بـە رەچـاوکردنێکی ژیرانـەی کەشوهەوا جۆراوجۆرەکان .

٦- کـاتێکیش لەمـەڕ (تەبیعــەتی زەوی) دەدوێــم..مەبەســتم لــە سەختی‌و سانایی هاتوچۆی کاروانە عەسکەرییێکەیە.. ئاخۆ ئەو پێچ وپــەناو بــەرزی‌و نشــێویانەی زەوی (بــاری جــوگرافی) .. دەبنــە یاریــدەدەری کــارە عەســکەرییێکان.. یــان دەبنــە لەمپــەرو گرفـت لــە رێگەیاندا ! .

**( مای-یاو-چان ) وتوێتی:**

"کاتێ سەرباز بۆ کوشتار دەنێررێ.. پێویستە پێشەکی تەبیعەتی زەوییێکــە.. نەبــەردەکانی جــەنگ و ئــەو رێگەیانــەی دەیگــەنێ شارەزابین‌و.. بزانین چۆن بە ئازادی هەڵسوکەوتیان تێدا دەکەین.. یان بە فێڵ‌و تەڵەکەبازیی بەسەر گرفت و گرێوگۆڵەکانیاندا زاڵدەبین.

ئەگـەر خەملاندنـە پێشـوەختییێکانمان لەمـەڕ مـەوداو دوورایێکـان وەدروســت گــەڕان.. ئــەوا لــە تواناداەبێــت پەســەندترین ریــێ بەرەوپێشچوون وەبـەربگیرێت.. چ راسـتەوخۆ یـان ناڕاسـەوخۆ- رێـی بەپێچ و پەنا.. یان رێك و راست.

ئەو سەرکردەیەی پێشوەخت شارەزایی تەواوی لە تەبیعەتی زەوییێکەدا هەبێت.. دەتوانێ پەی بە لایەنە باش و دروستەکانی بەکارهێنانی هێزی پیادە، یان ئەسپسوار بەرێت.. هەروەها کاتێ سەرکردە شارەزایی پێشوەختی لەمەڕ گرێوگۆڵەکانی خاك و رێگە ئاوەڵاکان هەبێت.. دەتوانێت حسابی وردو دروست بۆ قەبارەی ئەو هێزە عەسکەرییە بکات بۆ مەیسەرکردنی جەنگکاریی پێویستە.

هەروەهاش کاتێ بە وردی شارەزای تەبیعەتی زەوییێکە دەبێت.. دەتوانێ نەبەردی کوشتار هەڵبژێرێ و.. هێزەکەی تێدا دابەشبکات.. یان ئەو هێزەی لە جێییێکدا خڕکاتەوە.

٧- مەبەستم لە هۆکاری (سەرکردایەتی) بەهرەو لێهاتوویی سەرکردەیە لە "دانایی"و "دڵسۆزی"و "مرۆڤپەروەری"و "دلێری"و "توندوتۆڵی"دا .

( لی-شوان ) فەرموویەتی :

"ئەم پێنج بەهرەیە.. ئەو شکۆمەندیانەن بۆ سەرکردەی عەسکەریی پێویستن.. تا بۆ سوپا بلوێ نازناوی (پیاوی رێزدار)ی پێببەخشێت."

( مۆ-تۆ ) فەرموویەتی :

"ئەگەر سەرکردە "دانا" بێت.. دەتوانێ پەی بە گۆڕان و گەشەسەندنی هەلومەرجەکە بەرێت و.. چۆنی بوێت وای هەڵسووڕێنێت.

ئەگەر سەرکردە دڵسۆزبوو.. سەربازەکانی هیچ دڵەڕاوکێ و گومانێکیان لە سزادان و خەڵاتکردن و رەفتارەکانی نابێت.

ئەگـەر لـەنێو دەروون و ئاکـارو رەفتـاری سـەرکردەدا خەسـڵەتی مرۆیانـە جێگیربـوو.. دەتـوانێ لەگەڵیانـدا بـەلوتف و میهرەبـان و بەویژدان بێت و.. رێزو بەهای شایستە بۆ چالاکی و ماندوێتییێکانیان دابنێت

"ئەگەر سەرکردە توندوتۆڵبوو.. ئەوا رێکوپێکی لەنێو ریزەکانی سەربازەکاندا بەردەوامدەبێت.. چونکە پەی بەوە دەبەن کە بڕیارو فەرمانـەکانی ئـەو سـەرکردەیە دادپەروەرانـەن و.. لـە زەبـری سزادانەکانیشی دەسڵەمێنەوە."

**(شین-باو-هسۆ) فەرمووێەتی:**

"ئەگەر بوێری و دلێری کەسێتی لە هەناوی سەرکردەدا نەبوو.. ئـەوا نـاتوانێ بەسـەر گومـان و ڕاڕاییێکانیـدا زاڵبێـت و.. لـە بەدەسـتهێنانی ئامـانج و دانـانی نەخشـە مەزنەکانـدا دەستەوساندەبێت."

٨- مەبەسـتم لـە هۆکـاری (بـاوەڕ) شـتگەلێکە.. لەوانـە: بـڕوای دەروونـی.. هـەروەها: رۆشـنبیریی ویـژدانی.. هـەروەها: تێگەیشـتنی فراوانـی مەبەسـت و ئامانجـەکان و.. وهـەروەهاش: بـەتوانایی لـە تێگەیشـتنی فیکـری عەسـکەریداو.. چـالاکی لـە رێکخسـتن و دابەشکردنی ئەرك و بەرپرسێتی بەسەر ئەفسەرەکانداو.. دابینکردنی پێداویستی و ئازووقەو زەخیرە و تفاق -چەکەمەنی- بۆ سوپا.. کە زەخیرەی رۆحیش دەگرێتەوە.. تا جەنگاوەر بزانێ جێگەی لە شەڕو پێکدانەکەدا چۆندەبێت و.. بۆچی قوربانی دەدات و.. ئەو ئامانجە

نەتەوەییانەو ئەو ئەرکە پیرۆزانە چین کە پێویستە بیانپارێزێت.. یان لە دوژمنی داگیرکەریان بسێنێتەوە !

٩- سەرکردەی عەسکەریی نییە ئەم پێنج خەسڵەتە پەسەندەی نەبیستبێت.. ئەوانەی ئەم خەسڵەتانەیان تێدایە هەردەم سەرکەوتوون.. ئەوانەش نییانە بەشیان شکستهێنان و هەناسەساردییە.

١٠- کەواتە دەبێ بەتەنگ ئەم رەگەزو خاڵانەی خوارەوە ببیت و بەهەند وەریانبگریت و.. نەخشەو پیلانە عەسکەرییەکانتیان پێ بەراوردبکەیت و ..بەوردی هەڵیانسەنگێنی.

١١- ئەو فەرمانڕەوایەی (دەوڵەت) کێیە پەسەندترین وزەی ئەخلاقی تێدایە !؟

کوا ئەو سەرکردە عەسکەرییەی خاوەنی تواناو سەلیقەو بەهرەی پێویستە !

ئەو هێزە عەسکەرییانەی سوپا کامانەن کە دەتوانن کۆنترۆڵی تەبیعەتی زەوییەکە بکەن و.. بەپێی هەلومەرجەکانی کەشوهەوا هەڵسوکەوت بکەن !

پەسەندترین ئەو نەخشەو رێبازو هونەرە عەسکەرییانەی بۆ جەنگ دەشێن کامانەن!

خەسڵەتەکانی سوپاییێکی جەنگاوەر لە رووی باوەڕەوە.. لە بەرامبەر خەسڵەتەکانی سوپای دوژمندا چین !

(شیان-یو) وتوێتی:

"کاتێ گالیسکەو بارهەڵگرەکان تۆکمەو تەواو ئامادەن.

کاتیێ ئەسپەکان بەهێزو گورج و چالاکن.

کاتیێ سەربازەکان خاوەنی پتەوترین ئیمان و باوەڕو.. مەشق و بوێرین .

کاتیێ چەکەکان تیژو کاریگەرن .

ئیدی هەر تەپڵی جەنگ و هێرشبردن لێدرا.. هەموو بەخۆشیو پەرۆشەوەو بەهەموو تینوتاوێکەوە ئامادەی قوربانیدانن‌و.. بەرگەی نارەحەتییێکان دەگرن‌و بەسەریشیدا زاڵدەبن.. خۆ ئەگەر فەرمانی ئاگربەست یان کشانەوەیان پێدرا.. ئەوا پەست و تووڕە دەبن.

ئەم تەرزە سوپایانە هەمیشە لە جۆری سوپا بەهێزەکانن."

١٢- دەبیێ هەمدیسان بپرسین: ئایا لە رووی مەشقی ئەفسەرو سەربازییێوە.. کام تیپ لەو دوو تیپە بەشەڕهاتوانە باڵادەستن !؟

**(تۆ-یۆ) فەرموویەتی:**

"ئەگەر ئەفسەران لەسەر مەشقی سەخت و بەردەوام و دروست رانەهاتبن.. ئەوا هەردەم لەنێو گومان و ڕاڕاییو ورەبەردان و بەزیندا دەتلێنەوە.

ئەگەر سەرکردە سوپاییێکان خاوەنی بەهرەو توانای فیکریو کەسێتی رەسەن نەبوون.. ئەوا لەبەردەم دوژمندا هەناو کەنەفت و دەروون ئفلیج دەبن."

١٣- هەروەها دەبیێ ئەوەش بزانین.. کام لەو دوو تیپە بەشەڕهاتوە.. لەنێو وڵاتەکەی خۆیدا کاروباری خەڵکەکەی باشتر هەڵدەسووڕێنیێ! کامیان پەسەندتر رابەرییو خزمەتیاندەکاتو.. زێتر بەتەنگ بەرژەوەندییێکانیانەوەیەو.. ئاسایشیان بۆ دابیندەکاتو..

مافــــەكانیان دەپارێزێـــــتو.. گوزەرانیـــــان و داهـــــاتی وڵات گەشەداردەكاتو.. هەل بۆ كەسانی شایستە دەڕەخسێنیٌو.. ژیانێكی سەربەرزو رێزدارانەیان بۆ دابیندەكات !؟

**(مۆ-تۆ) وتویەتی:**

"بـا كـۆت و پێوەنـدەكانی میللـەت لەمـە زێـتر تێپـەڕ نـەكاتو بەسـبێت.. ئیـدی بـا بـەس بـەدووی ئـەنگاوتن و كـەموكووڕییەكانی میللەتدا بگەڕێین.. ئەمەیە بەڵگەی فەرمانڕەوایی چاك."

١٤- لەتوانامدایە پێشبینی ئەوە بكەم.. یان هەر لەسەرەتاوە پەی بەوەبەرمو بزانم.. كام لەو دوو دەستە بەشەڕهاتوانە سەردەكەوێت.. بە مەرجیٌ لەم زانیارییانەی خوارەوە دڵنیابم:

١٥- ئەگــەر ســـەركردەی عەســـكەریی بــە رێنمـــایی بلیمـــەتێتی (ستراتیژی) كاریكرد -دواتر لەم بەشانەدا ئەمە روونەدەكەمەوە- ئەوا سەركەوتوانە شەڕەكە دەباتەوە.. ئەم جۆرە سەركردانە شایانی ئەوەن شەرەفی سەركردایەتیان پێبسپێردرێن.. خۆ ئەگەر رێنماییو راوێژی رەتكـردەوەو.. ئـەو ستراتیژەی پشتگوێخسـت.. ئەمـە نـە هـەر خـۆی دەیدۆڕێنیٌ.. كوێرەوەریو شەرمەزاریش بەسەر میللەتدا دێنیٌ.. دەبیٌ نموونەی وا وەلاخریٌ.. دەركریٌو.. میللەت لە دەستی قوتاركرێت.

١٦- كـە سـەركردە پـەیڕەوی ئـەم زۆرزانیـی (سـتراتیژی)یـە دەكات..دەبێت هەلومەرجی لەباریش بۆ راپەڕاندنی ستراتیژییەكەی بخـولقێنیٌ.. لەمەیشـدا دەبـیٌ نـەرمونیان بێـت و.. خـۆی لەگـەڵ ئـەو

بارودۆخەدا بگونجێنیٚ.. بۆئەوەی بتوانیٚ بە شێوەییێکی پەسەند ئەم ستراتیژییەی راپەڕێنیٚ.

کاتیٚ ئامۆژگاریی سەرکردەدەکەمو دەڵێم : "با هەلومەرجی لەبار بخولقێنیٚ".. مەبەستم ئەوەیە سەرکردە بەوردیو بەپێی ئەو حاڵەتانەی دێنە پێشی دەرەنجامگیری خۆی بکات.. تا بتوانیٚ _لە کاتەکانی بەرگریکردن، یان هێرشبردن، یان پاشەکشێ، یان خۆقایمکردندا_ کۆنترۆڵی هەڵوێستەکە بکات.. لە سەرجەم بارودۆخە لەناکاوو کارەساتاوییێکاندا.. لەنگەرو هاوسەنگی خۆی لەدەست نەدات.. چونکە جەنگ لەخۆیدا بارودۆخگەلێکی کارەساتئامێزی لەنکاوە.

١٧- هەموو جۆرەکانی جەنگ پشت بەفێڵو تەڵەکەبازیی دەبەستن .

١٨- لەبەر ئەمە هەرکاتیٚ هێزو توانات لەخۆتدا بەدیکرد.. هەر بۆ فریودانی دوژمن خۆت لاواز نیشاندە.. گەر سەرقاڵی خۆ بۆ جەنگ ئامادەکردنبوویت.. خۆت بەپێچەوانەوە نیشاندە .

١٩- ئەگەر لە هێزەکانی دوژمن نزیکبووبیتەوە.. وا خۆت بنوێنە.. نە دەتەوێت لێی نزیکبیتەوەو.. نە لەگەڵیشیدا بەشەڕ بێیت.

ئەگەر لە هێزەکانی دوژمن دووربوویت.. بیکەرە هەراوزەناو جرتوفرتێکی ئەوتۆ دوژمن سەری لێبشێوێت و.. وابزانیٚ وای بەتەك هێزەکانییێوە.

٢٠- ئەگەر بەڕاستی دەتەوێت بەرامبەر دوژمنەکەت بجەنگیت.. هەوڵی هەڵفریواندنی بە فریودەرە (عەسکەرییو سیاسیو...هتد)ەکان

بده.. تا وای لێبکەیت.. ئەو بکەوێتە شەڕپێفرۆشتن و بێزارکردنت.. هەوڵبدە ئاژاوەو پشێوی (سیاسیو عەسکەرییو دەروونی) بخەیتە نێو ریزەکانییەوە.. ئەمە کاتێ بتەوێت زرمەی ئێجگارەکی لێهەڵسێنیت.

**(مۆ-تۆ) وتویەتی:**

کاتێ سەرکردەی سوپای دەوڵەتی (چاو) لەگەڵ سوپای دەوڵەتی (هسیۆنگ)ی دوژمنیدا پێکهەڵپژان.

چەندین رانەمەڕو ماڵاتو بە شوانەکانیشیانەوە بەرەو هێزەکانی دوژمن بەرەڵاکرد.. سەرکردەش وا خۆی نیشاندا بەنیازی کشانەوەیەو.. قوربانی بە هەزاران لە سەربازەکانی داوەو.. لەنەبەردی جەنگدا بۆ مەرگ و کوشتن جێیهێشتوون.

(خان)ی سەرکردەی سوپای دوژمن ئەم هەواڵی پاشەکشەیەی بیست و.. بەهەلی زانیو.. بە سەرکردایەتی هێزێکەوە بەپەلە بەخۆیکەوت.. تا بکەوێتە راوی پاشماوەی ئەو سوپا شکستخواردوەو.. هەزارانی لێ بکوژێت.

"بەڵام ئەو سەرکردە داناو قاڵبووی هونەری جەنگەی خۆی بە بەزیوو لە مەیدانی جەنگ هەڵهاتوو نیشاندابوو.. هێزەکانی لە چەندین تیپی بەهێزو چالاکدا بەسەر باڵی راست و باڵی چەپدا دابەشکردبوو.. یێکسەر هێرشێکی لەنکاوو توندوتیژی بردە سەر هێزەکانی خان (دوژمن)و.. تەفروتووناى کردنو.. نزیکەی سەد هەزار سوارەی لێکوشتن."

٢١- ئەگەر دوژمن هێزەکانی گردکردەوە.. تۆش گورج و چالاکانە وەخۆتبکەوە.. ئەگەر هێزەکانت لە هی ئەو لاوازتربوو.. خۆت لە پێکدادان لەگەڵیدا بپارێزە.. تا ئەو کاتەی خۆت کۆدەکەیتەوەو.. هێزەکانت لە بەرامبەری قاییمدەکەیت .. بەجۆرێ بتوانیت بەسەریدا زاڵبیت.

٢٢- تووڕەبوون ریسواییە.. دەبێ سەرکردە خۆی لێبپارێزێ..چونکە دەبێتە مایەی شێرازەتێکدانی فیکرو گەندەڵ رەفتاری سەرکردە.

**( لی-شوان ) فەرموویەتی:**

"سەرکردەی گەوج هەردەم نێچیری رەفتارە رەمەکیو سەرپێییکانێتیو.. لە ئاکارو ویستەکانیدا توندوتۆڵیو بوێری نامێنێ."

**( چانگ-یو ) وتوێتی:**

"ئەگەر سەرکردەی دوژمن کەللەڕەقو تووڕەوتڕۆبوو.. تەنیا هێندەت بەسە بەسووکایەتی پێکردن رقیهەڵسێنیت.. ئیدی بە هەست و نەستێکی شپرزەو هەژاوەوە.. هاوسەنگیی خۆی لە کردارو رەفتاریدا لەدەست دەدات.. ئەوسا ئەگەر تەنانەت پیلانێکی تەواو مەحکەمیشت بۆ هەڵمەتبردن نەبوو.. دەتوانی هێرشێکی سەختی لەنکاوی بکەیتەسەر."

٢٣- بۆئەوەی هانی دوژمنە گەوجەکەت بدەیت.. لەسەر خۆهەڵکێشان و لەخۆباییبوونی بەردەوامبێت.. خۆت بە لاوازو هیچ لەبارانەبوو لە بەرامبەریدا نیشاندە."

**(مۆ-تۆ) وتوێتی:**

"لە کۆتایی فەرمانڕەوایی سەردەمی ماڵباتی (چین)دا.. (مۆ-تۆن)ی سەرکردە توانی دەست بەسەر گشت ناوچەکانی دەوروبەریدا بگرێت.. نوێنەر (باڵوێن)ی ئەو دەوڵەتۆکانەی لە ناوچەکەدابوون هاتنە لای.. تا تەگبیروڕای پێبکەن و.. ملکەچێتی خۆیانی پێڕاگەیەنن و.. بچنە ژێر رکێفی سیاسی و عەسکەریی ئەوەوە.

"نوێنەرانی ویلایەتی (هو)ی رۆژهەڵاتی هاتنە لای و پێیانوت:

داوای هەزار ئەسپی رەسەنت لێدەکەین.[4]

(مۆ-تۆن)ی سەرکردە راوێژی بە ئەندامانی سەرکردایەتییەکەی کرد.. پێیانوت:

"هەزار ئەسپی رەسەن !؟.. داواکارییێکی گرانەو.. هێزێکی ئەوتۆمان لەدەست دەچێ.. هەروا بەسانایی دەست ولات ناکەوێتەوە.. ئەسپی رەسەن شتێکی دەگمەنیشە."

سەرکردە وەڵامیدانەوە: باشە ئەسپ هەرچەند لامان شیرینیش بێ.. چۆن دەبێ بەرامبەر ئەو دۆست و پشتیوانانەمان پیسکەو رژدبین!؟

سەرکردە هەزار ئەسپە رەسەنەکەی بۆ ناردن.

زۆری نەخایاند.. نێردراوەکانی هەمان دەوڵەتۆکە هاتنەوە لای (مۆ-تۆن)ی هەمان سەرکردەو پێیانوت:

---

[4]- ئەمجۆرە ئەسپانەی ئەو سەردەمە.. دەیانتوانی بەبێ ئالف و بێ ئاوخواردنەوە سێصەد میل ببڕن و بەرگەشبگرن.

"ئەی خانی مەزن ! هاتووینەتە داخوازی شازادە خانمی کچت"
سـەرکردە راوێـژی بـە یـاوەرانی کـرد.. پێیـانوت: وادیـارە کاربەدەستانی ئـەم دەوڵەتۆکەیـە دەستەییێکی زۆر هیچوپووچـن.. نـە ئوسـوولی حـوکم دەزانـن و، نـە بەرپرسـیارێتی.. تەواوشـوولیان لێهەڵکێشاوەو.. نازت بەسەردا دەکەن.. کارگەیشتۆتە ئەوەی داوای کچەکەیشت بکەن ! تەگبیرمان ئەوەیە بۆت.. دەبێ سنوورێك لەبۆ ئەم گاڵتەجارییانەی ئەم دەوڵەتۆکە نەگبەتە دابنێیت.

سەرکردە وەڵامیدانەوە:

"چـۆن دەبێـت کیژۆڵـەییێك بۆئەوانـەی ملکەچـیو هاوپشـتیوانی خۆیانیان بۆ راگەیاندووین.. بە زۆر بزانین ؟!"

سەرکردە شازادە خانمی پێشکەشکردن.

هەمدیسان هێندەی نەخایاند.. نێردراوانی هەر ئەم دەوڵەتۆکەیە گەڕانەوە لای (مو–تون)ی سەرکردەو پێیانوت:

"هـەزاران دۆنم زەویتـان هەیـەو.. ئێـوە بـۆ کشـتوکاڵ بـەکاری ناهێنن.. هاتووین پێمانی ببەخشن."

سـەرکردە پرسـوڕای بـە یـاوەرانی کـرد.. هەنـدێکیان وتیـان ئـەوە داواکـارییێکی پەسـەندەو.. ئـەوانی کـەش وتیـان.. داواکـارییێکی گوماناوییو نابەجێیە.

سەرکردە تووڕەبوو و وەڵامیدانەوە:

"زەوی کۆڵەکـەی دەوڵـەتو میللەتـە.. چـۆن بـە خـەڵکی دیکـەی دەدەیـن؟! فەرمانـدەدەم سـەری هـەموو ئەوانـە بـبڕن وتیـان زەوی وڵاتەکەمان ببەخشرێتە ئەو دەوڵەتۆکەیە.

سەری هەموو ئەو راوێژكارانەی بڕی.. كە لەنێو ئەنجومەنی سەركردایەتییێكەیدا بەوە قایلبوون

چەند پارچە زەوییێكی وڵات ببەخشرێنە° دەوڵەتۆكەكە.

(مو-تون)ی سەركردە وەبان ئەسپەكەی كەوت و.. شیری لێهەڵكێشاو.. وەپێش سەربازەكانی بەرەو ناوچەی دەوڵەتۆكە خاكەسارە خۆ بەنازفرۆشەكە ملیناو.. هەرچی دەسەڵاتدارانێتی لەنێوییبردن.

بەمەیش هەموو ئەو دەوڵەتۆكانەی نازونوونزو لاقرتێیان زێتردەبوو.. لەهەمان كاتیشدا لە دڵسۆزیو ملكەچیدا بۆی بێباربوون.. تەمێو چاوترسێنیكردن.

گەرچی هەندێ لەو دەوڵەتۆكانە.. لە دەوڵەتەكەی (مو-تون) خۆی گەورەترو گرینگتریشبوون.. بەڵام هەر خۆی بووە سەركردەو مەزنە رزگاركەری ئەو ناوچە بەرینەی وڵاتی (چین).. كە دوای رووخانی ئەو بنەماڵە رەسەنەی ئەوسا حوكمی هەموو ئەو ویلایەتانەی دەكرد.. پەرەوازەبوون.. ئەم دەستی بەسەردا گرتنەوەو.. هەموویانی خستنەوە پاڵ یێك و.. سەروەریی بۆ گێڕانەوە.

٢٤- گرینگترین شتێ لەو شتانەی لە جەنگدا بەهەند وەردەگیرێ ئەوەیە: با دوژمنەكەت هەمیشە لەژێر فشاری تۆدابێت.. تا ئاوەزی لەدەست دەداو.. نازانێ چۆن رەفتار بكات.

---

° - بە زمانی عەسكەریی ئەمڕۆ.. بە واتای (بنكەی عەسكەریی.. یان ئیمتیازاتی تایبەتی)یش دێت

ئەگـەر تـۆ ئامـادەی جـەنگبوویت و.. دوژمنەکـەت ئامـادە نـەبوو.. هەوڵبـــدە بـــە هـــەموو شـــێوازەکانی هێرشبردنەســـەری ناوبـــەناو وەرسیبکەیت.. تا تووشی دڵەڕاوکێ دەبیّو.. بەبێ خۆئامادەکاریی بۆ جـەنگ رووبـەڕووی هەڕشـەکانت دەبێتـەوەو.. ئیـدی هـەر هەڵتکوتایـە سەری..دەبێتە نێچیرێکی ئاسانی هێزەکانت.

(لی-شوان) وتویّتی:

"ئەگەر دوژمن سرەوت و ئاسوودەبوو.. بۆژۆی بکە."

(مۆ-تۆ) وتویّتی:

"لـە دوادوایێکـانی سـەردەمی دەوڵـەتی (هـان)داو.. دوای ئـەوەی سوپاکانی بە سەرکردایەتی (لیو-بای) بە دەستی (تساو)ی سـەرکردە شـکان و.. سـەرکردەی بـەزیو بەرەوناوچـەی (یـوان-شـاو) هـەڵات.. سـەرکردەی عەسـکەریی ئـەوێ ویسـتی بـەهانای بـەزیوەوە بچـیّو.. رووبـەڕووی سـوپای سـەرکەوتوو ببێتـەوە.. ئەفسـەرێکی هـەرێمی (یـوان-چاو) لـە راپۆرتێکیـدا بـۆ سـەرکردەی سـوپاکەی.. رایگەیانـد: (سـەرکردەی سـوپای دوژمنـە -سـەرکەوتووکە- پیـاوێکی عەسـکەریی کارامەو پسپۆرێکی جەنگیی بەسەلیقەو زۆرزانە.. ئێمە لای خۆمانـەوە نابێـت بـەم پەلەپروزێیـەو.. بـێ ئامادەباشـیو نەخشـەی وردو تفـاقی تەواوەوە بۆی بچینە مەیدانی جەنگەوە.

وام پێباشـە خۆمـان لـەو شـوێنانەدا دابمـەزرێنین.. کـە دەتـوانین - ئێسـتە- تێیانـدا بـەرگریو پارێزگـاری لـە خۆمـان بکـەین و.. نەیـەڵین بەرەوپێشـتر بـێن و داگیرمانبکـەن.. هەوڵبـدەین لەگـەڵ دوژمنـدا لـە

دوورایێکی دیاریکراودا بمێنینەوە.. تا ئەو کاتەی بەتەواوی خۆمان بۆ جەنگ تەیاردەکەین.

ئەی سەرکردەی گەورەم ! قایمکردن وپاراستنی ئەو شوێنانەی خۆمانیانی تێدا دادەمەزرێنین دەکەوێتە ئەستۆی تۆ.. بە گشت شاخ و دۆڵو روبارو ئەو ناوچانەی دیکەیش کە بۆ خۆپاریزیو خۆدامەزراندن لەبارو گونجاون لە هەر چوارلا (جوگرافی)ێکەی هەرێمەکەمانەوە.

با لەم کاتی دەسبەخۆداهێنانەوەو خۆدامەزراندن و بەرگریکردنەدا.. هەولبدەین هەڤالبەندیی‌و سوێندخۆری لەگەڵ سەرکردایەتی‌و سەرچاوە عەسکەرییە دەرەکییێکاندا ببەستین.. ئەمە بەنیسبەت کاروباری دەرەکیمانەوە بۆ ئەم قۆناغە ئەرکی سەرشانمانە.

شانبەشانی ئەمەش.. لە بواری رێکخستنی کاروبارو وزەو توانا عەسکەرییە ناوخۆییێکاندا.. پێویستە لەم ماوەیەدا وەخۆکەوین بۆ دروستکردنی (کێڵگەی عەسکەریی)[٦] لەو سەرسنوورو مەرزانەماندا کە لەژێر هەرەشەی هێرشی دوژمندان.

لە قۆناغی واوەتردا.. پێویستە چەند تیپێکی پوختەو نایاب لە هێزە عەسکەرییێکانمان.. بۆ مەشقپێکردنێکی زۆر تایبەتمەند هەڵبژێرین.. بەمەبەستی ئەوەی دواتر ئەو تیپپانە بۆ هێرشبردنە سەر

---

[٦] -ئەو کێڵگە کشتوکاڵییە سەرسنوورییانەن بۆ هەردوو مەبەستی عەسکەری‌و کشتوکاڵی بەکاردەهێنرێن.

چەند مەوقیعێکی عەسکەریی لاوازی نێو بەرەی دوژمن.. لەو شوێنانەی دوژمن پشتگوێی خستوون و بە لاوازی هێشتوونێتییەوەو.. چاوەڕیی ئەوە ناکات هێرشبکەینە سەریان.

ئەم هەڵمەتانەی تیپە عەسکەرییە باشئامادەکراوو نایابەکانمان دەیکەنە سەریان.. پشێوی و شڵەژان دەخاتە نێویانەوەو -ئەگەر ویستی بەهانای ئەو شوێنە عەسکەرییەوە بچێت کە لە رۆژهەڵاتەوە لێمانداوە.. دەبینێ لەملاوەو لە هەمانکاتدا لە خۆرهەڵاتەوە شاڵاومان کردۆتە سەری.

بەمجۆرە کاتێ دوژمن شپرزەو سەرلێشێواو دەبێو.. هێزەکانیشی شەکەت و پەرشوبڵاودەبنەوەو.. حەیشیان لێ تاڵدەبێ.. لەو کاتەدا ئێمە خەریکی خۆ تەیارکردنو.. پیاوو تفاق کۆکردنەوەدەبین و.. هاوپەیمانێتیو دۆستایەتی دەرەکی بۆخۆمان وەدەستدێنین.

ئیدی جەنابی سەرکردەی گەورەم ! ئەگەر ئەم رێنماییە (ستراتیژییە)ت رەتکردەوەو.. پەلەپرووزێیانە بڕیارتدا سەرچڵێتی بەم هێزە نا کامڵەتەوە بکەیت.. کە نە نەخشەو پیلانێکی پوختت بەدەستەوەیەو.. نە ئامادەباشییێکی تۆکمەت بۆ جەنگ هەیە.. جا ئەگەر بەمشێوەیە گرەوی شەڕە سەرچڵانەکەت دۆڕاند.. ئەوا دەبێ لەدواییدا بەدیار شکست و دۆڕاندنەکانتەوە هەناسەی سارد هەڵکێشیو.. ئیدی نە پەشیمانی دادت دەداو نە بڕوبیانوو هێنانەوە.)

سەرکردەی گەوجی ئەم سوپایە.. بەگوێی ئەم ئەفسەرە دانایەی نەکردو.. بەپەلەپەل بۆ دوژمن چووە مەیدانی جەنگەوەو.. بەپەلەپەلیش شەڕەکەی دۆڕاندو.. ولاتەکەیشی داگیرکرا..

٢٥- ئەگەر یێکێتی (نەتەوەیی) دوژمن تۆکمەبوو.. هەوڵدە دووبەرەکییان تێبخەیت.. ئەگەریش یێکێتی (نەتەوەیی)یان هەر لە بنەڕەتدا ناتەباو شلۆقبوو.. کێشەو رکابەرێی دیکەی بۆ بخولقێنە.

**(چانگ- یو) وتوێتی:**

"هەوڵبدە ناکۆکی بخەیتە نێوان فەرمانڕەوای دوژمن و ئەو وەزیرانەی هاریکاری دەکەن.. یان هەر لەنیوان ئەوو ئەو فەرمانڕەوایانەی دی کە هاریکاریی عەسکەریی دەکەن.

هەروەها هەوڵدە لە سوێندخوارو هاوپەیمانانی جیایبکەیتەوە.. یان نەیێڵیت دەستی پێیان بگات.. یا پەنا وەبەر هاوپەیمانانێکی بەهێزی ئەوتۆ بەرێ.. کە لە ئۆردوگەی دوژمندا بەرژەوەندییان هەبێت.

هەوڵبدە بەدگومانی بخەیتە نێو ئەو هاریکارییە نێوخۆییەی هاوپەیمانە ناوچەییێکانییێوەو.. هەروەها بیشیخەیتە نێو هاریکارییە دەرەکییێکانی لەگەڵ هاوپەیمانە بێگانەکانیدا.

ئیدی .. دەتوانی بە ئاسانی راویبکەیت و گورزی کەمەرپسێنی لێدەیت."

٢٦- لەکاتێکدا هێشتا دوژمن وەخۆی نەکەوتووە.. هەڵمەتی بۆ بەرەو لێیبدە.. لەمەدا ئەو شوێنانە هەڵبژێرە لە رووی خۆقایمکردنەوە لاوازنو.. لەو بڕوایەدا نییە هێرشیان بکرێنەسەر.

**(هو-ین-هی) وتوێتی:**

"سەرکردەی هەرێمی (نانگ) دە -١٠- نەخشەی عەسکەری پێشنیارکرد.. تاکو لە جەنگی دژ بە هەرێمی (هایۆ) بەکاربهێنرێن.

سەرکردەکە (کە ناوی لی-چینگ بوو) ماوەی هەشت مانگ خەریکی کۆکردنەوەی هێزە عەسکەرییەکانی بوو لە ناوچەیێکدا (کۆی-شو)یان پێدەوت.

وەرز وەرزی پاییزەو.. لافاوی روباری (یانگسی) رێگەو پێچەڵانەکانی بە جۆرێك تەنیوەتەوەو.. دەوری شانشینەکانی ناوچەکەی داوە.. سەرکردەی ئۆردووگەی دوژمن (هسا-یو) وا زەنبکا.. بەهۆی ئەم لافاوانەوە.. سوپای هێرشهێنەر توانای پێشەوەچوونی نەبێت.. بۆیێ بەجارێ گوێی خۆیان لێخەوان.

لە مانگی نۆیەمدا (لی-چینگ)ی سەرکردەی سوپا کشاوەکە.. گوتارێك بۆ سەربازەکانی دەداو.. تێیدا وتبوی: "گرینگترین شتێ لە پرۆسەکانی جەنگدا پێرەوبکرێت.. ئەوپەری گورجوگۆڵییە.. هەرگیز نابێ رەخنە لە هۆکاری گورجوگۆڵی بگرین.

خۆمان و هێزە عەسکەرییەکانمان لێرەدا کۆکردۆتەوەو.. دوژمن بەتەواوی ئەمە نازانێ.. یاخود بەهیچمان نازانێو.. لەبەر چەندین هۆی جیاواز گاڵتەی بە وزەو توانای هێرشەکەمان دێ.. لەو هۆیانە: لێشاوی ئەم لافاوەیەو.. هەروەها بە چاوی سووك بۆماندەروانێو بەلاواز دەمانبینێ.

دەبا ئەم هەلە بقۆزینەوەو.. لەسەر سنوورەکانی پایتەختەکەیان غافڵگیریان بکەین.. بەپێی ئەو پەندەباوەی دەڵێت: کە هەورە گرمە هات.. گوێ ئاخنین بێسوودە.. تەنانەت کاتێ دوژمن پێماندەزانێو.. بەسەر مەرزەکانی پایتەخەکەیەوە دەمانبینێ.. بەو پەلەپەلە هیچی

پێناکرێو ناتوانێ نەخشەیێکی دروست بۆ ڕووبەڕووبوونەوەمان دانێو.. من دڵنیاتان دەکەم بەم شێوازە دەتوانین دوژمن بشکێنین."

ئەم سەرکردەو سوپایە.. بەگورجیو بێ گوێدانە گرفت و سەختییەکانی ڕێگەوبان.. بەرەوپێشەوە چوون.. دوژمن درەنگ هەستی بە خێرایی بەرەوپێشەوەچوونی ئەمانی کرد.. هەوڵیدا کۆمەکی عەسکەریی لە هەموو لایێکەوە بێنێ.. بەڵام فریا نەکەوت و.. سوپا کشاوەکە گەمارۆی پایتەختی دا.. تا کەوتو خۆی بەدەستەوە دا.

"ئەگەر لە و شوێنانەوە پەلاماری دوژمنت دا کە لێی چاوەڕوان نەدەکردی پەلاماریان بدەی.. ئەوە مانای بلیمەتیو بەسەلیقەیی عەسکەرییە.

"لە دوادواییێکانی فەرمانڕەوایی خانەوادەی (ئاوی)دا.. هەردوو سەرکردەی عەسکەریی.. (شۆنگ-هۆی)و تانگ-ئی)یان نارد.. تا لەگەڵ سوپای دوژمندا لە هەرێمی (شۆ)دا بجەنگێ.

(تانگ-ئی) سەرکردە.. لە وەرزی زستاندا سوپاکەی بە لاڕێییێکی پێچوپەناو نائاشنادا (٧٠٠) حەوتصەد فرسەخ برد.. ئەم ڕێگەوبانە ڕێی هاتوچۆی ئاسایی خەڵکی نەبوو.. هەمووی بەرەوخوارو سەرەوژوورو بەرزیو نشێوی کەژوکێوو دۆڵی تێکچڕژاوبوو.. سوپاکەی وێڕای ئەم ڕێکردنە سەختەی.. پردی کاتینەو.. گەلێ کارو چاکسازیی دی بۆ حاڵەتی نائاسایی هاتوچۆکردن دروستکرد.

ئازووقەی سوپا ڕووی لە کەمبوونەوەو دواتر نەمانکرد.. برسێتی داکەوت.. وەلێ ئەم بارە سەختەی ژیانو ئەم شەکەتبوونە ورەی

(تـانگ–لی) لەقنـەکردو.. لەسـەر شـالاوە عەسـکەرییە بـەرەو ئامـانج کشاوەکەی بەردەوامبوو.

هەنـدێجار ناچـاردەبوو خـۆی لـە بەرەیێکـدا لوولـداو.. لەسـەر کێوەکانەوە خۆی بەرەو دامێنـەکان بەگورجی خلۆرکاتـەوە.. تا بگاتـە ئاسـت راسـتەڕێی نێـو نوالـەکان .. تـا لەملایشـەوە سـوود لـەو کاتـە دەسـتکەوتە بـۆ بەرەوپێشەوەچـوون وەرگـریٚو.. ئەفسـەرو سەربازەکانیشـی لـەم کارانـەدا وەدووی سـەرکردەکەیان دەکـەوتن.. تا ئەو رێگەوبانە شاخاوییە سەختە ببڕن.. جاری وا هەبوو بە ناچاری‌و لەبەر وێڵگەو پێچوپەنای تەسك و باریکی رێگـە شـاخاوییەکان..یێك بە دووی ئەوی کەیاندا مێرووولەئاسایی رێچکەیان دەبەست.[٧]

بـەمجۆرە (تـانگ–لی) سـەرکردە بـە یێکـەمین ئامـانجی لـە بـەرەی دوژمنـدا گەیشـت‌و.. غـافڵگیریکردن‌و.. بەسـەر بنکـە دامەزراوەکانیـدا سەرکەوت.. بەرەی دوژمن لەو قۆڵەوە خۆیـان بەدەسـتی ئـەم سـەرکردە لێزان و گورجوگۆڵەوە دا.

ئیـدی وێـڕای کۆسـپ و تەگـەرەو کەمئازووقـەیی‌و سـەختی رێگـەوبان.. ئـەم سـوپایە سـەرکەوتن بـەدووی سـەرکەوتنی –بەسـەر دوژمنـدا– بەدەسـتیهێنا.. تـا هـەموو ناوچـەو هێزەکـانی دیکـەی تـەنییەوە.. چـونکە ئـەم سـەرکردەیە تـوخمی خێرایـی‌و نکاوکـاریی کردبووە سەرمەشقی خۆی‌و.. هەر بەمەیش سەرکەوت‌و بردییەوە.

---

[٧] – لـە دەقەکـەدا دەڵێت: زێتر لە قاڤلەکانی ماسی دەچوون کـە چۆن یێك لەدووی ئەویدی رێچکەدەبەستن.

٢٧- گەرچـــی ئەمانـــە کلیلـــە ســـتراتیژییە عەســـکەرییەکانی سەرکەوتنن..وەلێ نابێو ناکرێ هەموو جارێو بۆ هەموو حاڵەتێ پێڕەویانکەین.. مەحاڵیشە ئەو ڕێنماییانە لە چێوەیێکی فکریی تەنگەبەردا گیریانبدەین.

**(مای-یاو-چان) وتوێتی:** [٨]

"ئەگەر دوژمن بەرەنگارت بۆوە.. با وەڵامدانەوەکەت (ڕەفتارت) لەگەڵ گۆڕانکارییێکانی بارودۆخ و هەلومەرجە کتوپڕو لابەلاییێکاندا گونجاوو لەبارییێت.. تا بۆت دەکرێت بەدووی ئەو ڕێبازو ڕێچارانە بکەوە کە بۆخۆت هەڵیاندەهێنجیو دەیاندۆزییێوەو.. جگە لە دانایی و وردبینییو بنەماو چەمکەکانی ئەرکی عەسکەریی.. خۆت بە هیچ شتێکی دیکەوە مەبەستەوە.

کەواتە: چۆن دەتوانین بۆچوون و ڕێنماییە عەسکەرییێکان لەنێو قاوغێکی فکریی تەسك و تەنگدا گیردەین؟!

٢٨- گشـــت ئـــەو بـــیروڕاو بۆچـــوونانەی باســـکران.. لـــەنێو پەرستگەییێکی ئایینیداو بەر لە دەستپێکردنی پرۆسەی جەنگ باسدەکران.. ئەگەر ئەنجامی باس و هەڵسەنگاندنە عەسکەرییێکان بە باری سەرکەوتندا شکانەوە.. واتا گفتوگۆو تۆژینەوەکان زەفەریان

---

[٨]- لەجیاتی بەکارهێنانی وشەی (وتی) لەبەرامبەر وشەی (قال) عەرەبییێکە..وام بە ڕەوانتر زانی وشەی (وتوێتی) یان (فەرموویەتی) بەکاربێنم.

بەوە بردووە: هێزی دوژمن لە رووی بەرەنگاربوونەوەو خۆڕاگریدا لەچاو هێزی سوپای نەتەوەییدا کەمتواناو لاوازترد.

ئەگەریش هەڵسەنگاندنەکان بەو بارەدا کەوتنەوە کە ئەگەری سەرکەوتن گوماناوییە.. یان کزە.. واتای وایە تۆژینەوەو خەملاندنەکان پەییان بەو راستییانە بردووەو.. ئەوجا بەپێی هەقیقەتە عەسکەرییەکان بڕیاری خۆ لە جەنگ لادان.. یا دواخستنیان داوە.. یاخود بڕیاری گرتنەبەری هەر رێبازێکی دی.. بۆ خۆقوتارکردن لە شکستو بەزین بەهانایانەوە بێت.

بەبێ تۆژینەوەو چوونە بنجوبناوانی وردو دروستەوەو.. بەبێ راوتەگبیری راشکاوانە.. بەرپرسێتی عەسکەریی وەئەستۆ ناگیرێو.. تێکۆشانیش دروست نابێو.. سەرکردایەتی سەرکەوتوو وەبەردەست ناکەوێو.. نەتەوەش لەو جەنگە سوودمەند نابێت .

شوورای نێو پەرستگە ئایینێکان.. (ئەنجومەنی جەنگ.. یان پەرلەمان.. یان ئیجتیهاد لە رایگشتیدا.. یاخود هەر نموونەو جۆرێکی دی شووراو بیری کراوەو ئازاد) ئەرکێکی بنچینەیی کاروباری عەسکەریی بوو.. لەپێناوی گەشەپێدانی فیکرو رۆشنبیریی عەسکەرییو بەرپرسێتی سیاسی نیوان دەوڵەت و نەتەوەدا.

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- لە جەنگە (کۆن)ەکاندا وا باوە.. هەر شالاوێکی عەسکەری پێویستی بە هەزار گالیسکەی خۆشڕەوی چوار ئەسپیو.. هەزار گالیسکەی بارهەڵگری بە چەرم داپۆشراوی چوار ئەسپی دیکە هەیە.. سەرباری صەدهەزار جەنگاوەر بە هەموو زەخیرەو تفاقێکەوە.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"ئەو گالیسکانەی لە شەڕە (کۆنە)کاندا ئەسپ ڕایدەکێشانو.. بۆ کوشتارو گواستنەوەش بەکاردەهێنران.. هەردوو جۆرەکەیان سووکەڵەو خۆشڕەوبوون.. بارهەڵگرەکان بۆ گواستنەوەی تفاق و زەخیرەو بەرگو کالاو پێویستییێکانی دی سەربازەکان بوون.. کۆنە مێژوونووسێك بەمجۆرە وەسفیان دەکاتو دەڵێت:

"ئەو گالیسکەیەی بۆ شەڕ بەکاردەهێنرا.. سێ ئەفسەری هەڵدەگرتو.. حەفتاو دوو سەربازی پیادەی وەدوودەکەت."

ئەم هێزە عەسکەرییە پچووکەی دەکەوتە دووی گالیسکەی شەڕ.. دەبوایێ دە ئاشپەزو نۆکەر خزمەتی بکردایە.. وێڕای پێنج کرێکاری بەرپرسی شۆردنو ئامادەکردنی بەرگوکالای سەربازەکانو.. پێنج مەیتەرەوان بۆ ئالفو ئاوپێدانی ولاخەکانو.. پێنجی دیکەیش بۆ ئاوهێنانو دارو چیلکە کۆکردنەوە.

واتا هەر گالیسکەییێکی گواستنەوە بیستوپێنج سەربازی خزمەتگوزاری لەگەڵدابوو.

بەمجۆرە هەر وەحدە (تیپ)ێکی شەڕکەر بریتیبوو لە سەد ١٠٠ جەنگاوەر (٣ ئەفسەر ٧٢ سەربازی دەوری گالیسکە ٢٥ی خزمەتگوزارو ئاشپەز بۆ گالیسکەکەو خزمەتی سەربازو ولاخەکان.)[٩]

٢- ئەگەر وامان دانا خەرجیی گواستنەوەی ئەم هێزە.. لەم جۆرە هێرشە عەسکەرییانەدا بۆ دوورایی هەزار فرسەخ -لە بنکەی سوپا لە پایتەخت (نیشتمان)ەوە بۆ مەیدانی جەنگ و.. خەرجیی دیکەشمان بۆ خۆشڕابواردنی سەربازەکان خستەسەر ئەوی پێشوو.. لەگەڵ کرێی نوێنەران و راوێژکارانی (مەدەنی)و.. هەروەها هی میوانی یاوەری هێرشەکەو[١٠].. خەرجیی جۆراوجۆری کەیش وەك صەمغ و مەی و.. خەرجییێکانی صیانەکردنی گالیسکەو چەکەمەنی.. ئەوا کۆی هەمووی دەکاتە هەزار پارچە (پووڵ)ی زێڕ لە رۆژێکدا.

ئەگەر ئەم بڕە پارەیە لە بودجە (گەنجینە)ی دەوڵەتدا لەبەردەستدا بوو.. ئەوسا دەشێ دەستبدرێتە هێرشە عەسکەرییێکە.

**( لی-شوان ) فەرموویەتی :**

"هەر سوپا بەرەو مەیدانی شەڕ بەڕێکەوت.. گەنجینەی دەوڵەت بەتاڵدەبێتەوە."

---

[٩] - لێرەدا رێژەی سەربازە جەنگاوەرەکان بۆ سەربازە خزمەتگوزارەکان (٣ بۆ ١) ن.

[١٠]- لە شالاوە عەسکەرییێکانی کۆنی(چین)دا.. وا باوبوو هەندێ لە پیاوماقوولانی دەڤەرەکە دەچوونە سەردانی ئۆردووگەکەو.. سەرکردەی سوپاش بە پارەو دیاریی رێزی لێدەنان.

٣- ئامـانجی سـەرەکیی جـەنگ (سـەرکەفتن)ە.. ئێکـەمین تـالآنی جەنگیش هەر (سەرکەوتن)ە.

ئەگـەر شـەڕ درێـژەی کێشا.. چـەك بێکەڵکـدەبیّو دەشـکیّ.. ورەی سەرباز دەڕووخیّو وێراندەبیّ.

ئەگــەر ســەربازەکان ناچــاربوون هێرشــبەرنە ســەر شــارەکان.. ئەمجۆرە هێرشانە بەجۆرێك ماندوویاندەکات بڕستیان لێبڕیّ.. (لەبەر ئـەوە وا پەسـەندترە.. لـە مەیـدانی جـەنگ خۆیـدا کارەکـە کۆتـایی پێبهێنریّو بڕێتەوە.

٤- گـەر سـوپا تووشـی بـوو بـە تووشـی جـەنگو پێکـدادانێکی عەسـکەریانەی درێژخایەنــەوە.. دەسـتکەوتو داهاتــە ئاســاییێکانی دەوڵەت خەرجییێکانی شەڕی پیّ دابین ناکریّ.

**( چانگ-یو ) وتویێتی :**

"شــەڕو پێکدادانــەکانی قــەراڵ -ئیمپراتــۆر-ی (دۆ) لــە وڵاتــی (هـان)دا درێـژەی کێشاو.. هـیچ تروسـکاییو نیشانەییێکی سـەرکەوتن بەدی نـەدەکرا.. خەزێنـەی وڵات هیچـی تێـدا نـەما.. قـەراڵ بـە ناچاری نابووتبوونی دارایی دەوڵەتی راگەیاند."

٥- کـــاتیّ لـــە ئـــەنجامی بـــەکارهێنانی زۆرو بەردەوامـــەوە.. چەکەکانت.. قەڵغانەکانت زیانیان پێدەگاو سـەقەتدەبن.. کـاتیّ بەهۆی شەڕو کوشتاری زۆرو بەردەوامو.. کـەمیی پشـوودانو مۆڵەتـەوە هێـزو توانـات لەبـەردەبڕێت.. کـاتیّ پـارەی نێـو گەنجینـەی دەوڵـەت بـەهۆی خــەرجیی زۆری پێداویســتییێکانی جەنگــەوە فــووی لێــدەکرێت.. دراوســـــیّ فـــــەرمانڕەواکانی ناوچـــــەکە ئـــــەم پرزەلێبڕانـــــەت

ئیستیغلالدەکەن و.. کێشەو ماندوێتی دیکەشت بۆ دروستدەکەن.. گەرچی ئەوانە دۆست و یاوەریشتبووبن.

تەنانەت ئەگەر راوێژکارو دانای زۆر کارامەشت بەدەوروپشتەوە بن.. کەسیان ناتوانن بەهاناتەوە بێن و.. ناتوانن نەخشەو پلانێکی پەسەندت بۆ دابنێن تا لەم قەیرانە قوتارتبکەن.

٦- لەبەر ئەمە پەسەندترین سیاسەتی عەسکەرییانە ئەوەیە.. هەوڵبدە بەوپەڕی خێرایی لە دوژمن بدەیت و تەختیکەیت.. داماوترینی ئەو سیاسەتە عەسکەرییەش ئەوەیە.. بە خنەخن خۆت بەرەو جەنگێکی درێژخایەنی شەکەتکەری ئەوتۆ بەکێشکەیت.. هیچ نیشانەو ئاسۆییێکی رۆژی سەرکەوتنی تێدا بەدینەکەیت.

(تۆ-یۆ) وتوێتی:

"دەشێت بە ناچاری و لەسەر بنەماییێکی نادروست و هەڵە هێرشێکت بردبێت.. بەڵام هەرچۆنێك بێت.. دەبێت ئەم هێرشەت بکەیتە هێرشێکی بەدەستوبردی لەناکاو.. تا زوو بگەیتە ئەنجامەکەی."

٧- لە مێژووی جەنگدا.. دەوڵەتێك نییە لە جەنگی درێژخایەنی شەکەتکەر سوودمەندبووبێ.. تەنانەت ئەگەر لە داهاتوویێکی دووردا سەرکەوتنیشی بەدەستهێنابێ.

(لی-شوان) وتویّتی:

"لە نێو-تۆماری بەهارو پاییز-[11] داو.. لە شرۆڤەکانیدا دەڵێت: جەنگ وەك ئاگر وایە.. ئەوەی نەتوانیّ بەزووترین کات کۆتایی بە بەکارهێنانی چەك بێنێت.. ئاگرەکە داغانیدەکات."

٨- بەمجۆرە ئەوەی لە مەترسییێکانی هێرشبردن تێناگاتو.. نازانیّ چۆن سەربازەکانی بۆ شالآوبردن بەکاربێنیّ.. ئەوە هیچ لە تایبەتمەندییێکانی جەنگ نازانیّو.. لە چالاکیو هونەرەکانیشی تێناگات.

سەرکردە چەند پەی بە مەترسییە نهێنیو بەسەردا سەپێنراوەکانی نێو جەنگەکە ببات.. هێندەیش هەلی سەرکەوتن بۆ ئەو سەرکردەیە دەڕەخسێت.

٩- ئەوانەی لە هێرشبردندا بەڕاستی ئەهلی کارن.. ئەوانەن دەتوانن لە جەنگێکی کورتخایەندا بەتەواویو ئێجگارەکی سەرکەون.. نەك لە زنجیرە شەڕێکی خۆتڕێندا سەرو ماڵی دەوڵەت و میللەتیشی تێدا بچێت.

١٠- سوپا بۆ کارە عەسکەرییێکانی چی پێویست بێت لە پیاوومالّو تفاق.. میللەت پێشکەشیدەکات.. میللەت لەپێناوی بەرگریکردن لەخۆو.. تەمێکردنی دوژمندا.. هەموو داهاتو پاشەکەوتە مادیو بەشەرییێکانی بە هەڵمەتبردنە عەسکەرییێکەوە

---

[11] - تۆمارێکی مێژوویی جەنگە کۆنەکانی (چین)ە

گرێدەدات.. لە ئاوها حاڵەتێکدا .. ئەرکی سوپاش ئەوەیە سەرکەوتن بۆ میللەت وەدەسخات.. تا قەرەبووی ئەو قوربانیانە بکاتەوە میللەت بۆ پێداویستییەکانی سوپاو ئەرکە عەسکەرییەکانی پێشکەشیکردوون.

هەموو کاتێ میللەت هەرچی داواکاریی‌و پێویستی سوپا هەیە.. لە تفاق‌و پیاوو ماڵ‌و سامان‌و دەسەڵات پێشکەشیدەکات.. تاکە مەبەست‌و ئامانجیشی لەمانە تەنیا سەرکەوتنە.

ئەگەر سوپا ئەم ئاواتەی میللەتی لەسەرکەوتندا بەدینەهێنا.. مانای وایە لە راپەڕاندنی ئەرکی سەر شانیدا کەنەفتەو.. شایانی ئەوە نییە ئەمانەتی نەتەوەیی لە ئەستۆ بگرێ‌و.. ئیدی مافی ئەوەی نییە داوای قوربانیدانی زێتر لە میللەت بکات.. چونکە نوشوستیی بەسەر هێناوەو.. زیانێکی ئەوتۆی لە خۆی‌و میللەت داوە.. جارێکی دی‌و بۆ دەستەبەرکردن‌و پێکەوەنانی‌و قەرەبوو کردنەوەی بە ماڵ‌و گیانی نوێ‌و.. وزەوتوانای نوێ‌و.. ورەی نوێ.. کات‌و ماندووبوونێکی زۆر زۆری دەوێ.

میللەتان لە سەردەمە دێرینەکاندا.. جگە لە پێداویستییە زەرووریێکان زێتر.. هیچی دی بە سەرلەشکرەکان نەدەدا.. میللەت سوپای لەوە سەرپشکدەکرد ئەرکە عەسکەرییەکانی لەو هەڵمەتبردنانەدا چۆن رادەپەڕێنێ.. راییەڕێنێ.. میللەت گشت تفاق و ئازووقەییێکی دەدایێ.. وەلێ نیوە مووچەو قەرەبووی ئەفسەرو سەربازەکانی دەدا.. ئیدی تا بەسەرکەوتوویی نەگەڕایەتەوە ئەو نیوەکەی دی نەدەدایێ.

لەشکر، هەر پێداویستییێکی دیکەی زیاد لەوماڵو ئازووقەیەی بۆ هێرشە عەسکەرییێکە پێویستبوو.. (واتا جگە لەوەی بەر لە هێرشبردنەکە بۆیان خەمڵێنراوەو پێیاندراوە).. چیدییان ناداتیێو.. سوپا دەتوانێ -کاتێ دەچێتە نێو خاکی دوژمنەوە- ئەو پێویستییە زیادانە لە دوژمن بسێنێ.

١١- ئەگەر سوپا.. بە خەرجییە زۆرەکانەو.. زیانە یێك لە دوای یێکەکانی.. میللەتی بارگران و بێزارو ماندووکرد.. لە ئەنجامی کەمتەرخەمیو لێنەوەشاوەیی سەرلەشکرەکەیو.. فشۆڵی نێو ریزەکانی سوپاو.. بەدەست نەهێنانی سەرکەوتن بۆ میللەت.. ئەوا ئەنجامی ئەو شکست و زیانە دوولاییی بەسەریاندا دەشکێتەوە.. زیانی سوپاکە خۆیو.. زیانی میللەت لەمەڕ داهاتو وزەو توانادا.. کە وادەکات هەردوولا (سوپاو میللەت) لە تواناو دارایيو ورەیاندا هەژارو کەنەفتبن.. دواڕۆژی نەتەوەش لە جاران کلۆڵو کۆڵەوارتردەبێت.. دوژمنانیش دەتوانن بە ئاسانی بێحورمەتی بە میللەت بکەنو.. زێتر چۆکیان پێ دابدەنو.. زێتریش خاكو بەرژەوەندیو ئازادییان تالان و قۆرغبکەن.

**(چانگ-یۆ) فەرموویەتی:**

"ئەگەر پێداویستییێکانی لەشکر.. ئازووقەو تفاق و زەخیرە.. بۆ دووری زێتر لە هەزار فرسەخ [١٢] تێپەڕیو.. بۆ مودەتێکی زێتر لەوەی

---

[١٢]- لە جەنگە کۆنەکاندا دوورترین مەسافەیێ سوپا بڕیبێتی لە هەزار فرسەخ زێتر نەبووە.

بۆ هێرشە عەسکەرییەکە خەملێنراوە.. نە هەر لەشکر خۆی برسی دەبوو.. میللەتیش بە هۆیەوە برسی دەبوو...

"...سوپا دەتوانێ لەنێو خاکی دوژمندا بەسەر تالانییەکانەوە بلەپێتەوە.. وەلێ میللەت دوای ئەوەی هەرچی هەیەو نییە.. لەماڵو ئازووقەو پیاوو وزەوتوانای پاشەکەوتکراوی خۆی.. دەیداتە سوپا.. ئیدی هیچی بۆ نامێنێتەوەو.. لەنێو ماڵی خۆیدا ژیانێکی سەخت و گران دەگوزەرێنێ.

"ئەگەر لەشکر بەخێرایی بەسەر دوژمندا سەرنەکەوت.. ئەوا نەتەوە وێران و لاوازو سەرگەردان دەبێت."

١٢- کاتێ نەفیری سەربازگیری لێدەدرێو.. حاڵەتی ئامادەکاریی عەسکەریی نائاسایی رادەگەیەنرێو.. خۆ بۆ جەنگ سازدەدرێو.. لەشکر دەچێتە مەیدانی جەنگەوە.. ئیتر گرانی دادێو..نرخی هەموو پێداویستییەکانی ژیان بەرزدەبێتەوەو.. گرانی داهات سامانی میللەت کزو کەمدەبێتەوە.. سامانیش رووی لە کزی کرد.. یێکەمین کەسانێ تووشی ئازارو ئەندێشەو دەردیسەری دەبن هەژارو کەمدەرامەتەکانن.. چونکە حکوومەت باجی زێتر دەخاتە سەر شانی خەڵکی.. زوربەی خەڵکیش کەمدەرامەتن.. نکارن باجی زێدە بدەن.

(شیان-لین) فەرموویەتی:

"هەرکە لەشکر دەستیکردە هێرشبردن.. یێکسەر نرخی کەلوپەل بەرزدەبێتەوەو گرانی دادێت.. چونکە سوپا خۆی جەنگاوەرەو.. بایێخ بە خەرجیو مەسرەف و دەستپێوەگرتن نادات.

خەڵکەکە لەو شوێنانەی سوپا پێیاندا تێدەپەڕێت.. یان تێیاندا جێگیر دەبێ.. خەڵکەکە هەڵپەی ئەوەیانە سوود لە خەرجیو نەفەقاتی سوپاو بارودۆخە نائاساییێکە وەرگرن.. تەماحکارییو چاوچنۆکیو هەلقۆستنەوە.. دەبنە مایەی تەنینەوەی دیاردەی دەوڵەمەندبوونی ناشەرعیانە.. لە هەمانکاتدا ئەم بارودۆخە لەسەر ئاستی ژیان بەگشتی.. زیان بە ئاکارو خەڵکی هەژاریش دەگەیەنێ."

١٣- بەمجۆرە تاقەت و توانای نەتەوە لە رووی سامان و ئازووقەو ئەخلاقەوە.. بەردەوام بەرەو کزیو پووکانەوەو وێرانبوون دەچێت.. ئەو میراتیو هەوڵو رەنجانەی نەوەکانی پێشوو پاشەکەوتیان کردبوو.. هەموو پەرشوبڵاو دەبنەوە و بەبادەچن.. نەتەوە لاوازتر - نەك بەهێزتر-دەبێت.. ئەمەیش هەمووی بەهۆی کەمتەرخەمییو بێموبالاتیو بێتواناییو بەدبەڕێوەبردنی دەسەڵاتی عەسکەرییەوەیە.

( لی-شوان ) فەرموویەتی :

"ئەگەر شەڕ درێژەی کێشاو.. هیچ ئومێدێکی سەرکەوتن بەدینەکرا.. پیاوان و ژنان زێتر بێزاردەبن..چونکە هەندێکیان دەخوازن بە ئارامیو سەقامگیری زەواجبکەن.. هەندێکی دیان دەیانەوێت بەخێوکەر.. میرد.. کوڕ.. باوکیان بگەڕێتەوە نێویان.. زۆریان پێچوو.. لەمێژیشە لە ماڵو حاڵ بەدوورن.. لە جەنگ و نەبەردو شەڕگەییێکی عەسکەریی وادا نازانرێت کەی کۆتاییدێت.. هەروەها هیچ ئومێدێکیش بۆ سەرکەوتن و رزگارکردنی میللەت لە بەلای دوژمن نییە.. تەنانەت ئومێدی تالانیش لە خاکی دوژمنەوە بۆ میللەت نییە.

" سەرکردایەتیی سیاسیو عەسکەریی داناو کارامەی جەنگ.. ئەو سەرکردایەتیانەن بە مەبەستەوە دەیانەوێت دڵنیاییو ئارامیی بخەنەوە دەروونی نەتەوەوە.. ئەویش لەڕێی درکاندنی هەموو هەقیقەتەکانی شەڕ لای میللەت.. یان هیچ نەبێت ئاگادارکردنەوەیان لە زوربەی هەقیقەتەکان.. تا ورەو مەعنەویاتی نەتەوە بەبەرزی بمێنێتەوەو.. زێتر گیانی خۆڕاگرییان تێدا نەشونما بکات.. نەك بچن راستییێکان بشارنەوە.. یا بیانشێوێنن.. چونکە ئەمەی دوایی دەبێتە مایەی دڵەڕاوکێو بەدگومانیو بێزاریو پووکاننەوەی متمانەی نیوان گەلو سەرکردایەتییێکان."

١٤- ئەرکەکانی سەرشانی حکوومەت لە سەروبەندی جەنگدا ئەرکی گەورەو گرانن.. حکوومەت بەرپرسە لە دابینکردنی پێداویستییێکانی خەڵکیو هی سوپاش پێکەوە.. تەنها پیداویستییێکانی سوپا لە کاتی جەنگدا نزیکەی لە سەدا شەستی داهات -بودجە-ی حکوومەتە.. ئەوەی لەم داهاتەی حکوومەت دەمێنێتەوە.. بێگومان بەشی پێداویستییێکانی میللەت ناکات.. تەنانەت بەشی ئەو خزمەتگوزارییە زەروورییانەش ناکات کە پێویستە لە حاڵەتی دەسپێوەگرتن (تەقەشوف)دا بۆ خەڵکیی دابینکرێن.

١٥- لەبەر ئەمە .. سەرکردایەتی عەسکەریی داناو کارامە.. دەبێ بەهەموو توانایێکییێوە هەوڵبدات سەرکەوتنی خێرا وەدەستبێنێ.. یان دەبێت پێداویستییو کەموکوورییێکانی سوپا.. بەو تالانیانە پڕبکاتەوە کە خۆی لەنێو خاکی دوژمندا دەستیدەکەوێو.. لە رۆژانی

هێرشــبردن و پێكدانەكانیشــدا هــەر بەوتالآنیانــە گوزەرانبكــا.. تــا بەتەواوی بەسەر دوژمندا سەردەكەوێ.

چونكە هـەر تـەغارێ گـەنم سـوپای هێرشـبەر لـە خـاكی دوژمنـدا دەســتیدەكەوێ.. بەرامبــەر بیســت تــەغارە لــە كــۆی ئەوانــەی لــە نیشتمانەوە بردوونی.. گـەنمی نیشتمان پێویستی بەوەیە.. هـەر لـە خاكی نیشتمانەوە تا مەیدانی شـەڕی دوژمن مەسرەفی گواستنەوەو پاراسـتنی بۆبكـەی.. وەلێ گــەنمی تـالآنی نێـو خـاكی دوژمــن ئـەم مەسرەفانەی گەرەك نییە.

**( چانگ-یۆ ) فەرموویەتی :**

"لـە گواستنەوەی یێـك تـەغار ئازووقـە (گـەنم) بـۆ لەشـكرو.. بـۆ مەسافەی -بەنموونە- هەزار فرسەخ.. تەنیا كارگوزارانی گواستنەوەو چاودێریی لەو ماوەیەداو لەبۆ خۆیان بیست تەغار گەنمیان دەوێ !

"...تــا كێشــەو گرفتــەكانی گواســتنەوە زێتربــن‌و.. گەنــدەڵیی چاودێریكردنی عەسكەریی بەربلآوتربێ.. ئەم خەرجیو مەسـرەفانەش زێتردەبن."

١٦- بۆچــی ســەربازی جــەنگاوەر بەئەنقــەس ســەربازی دوژمــن سەردەبڕێ؟

وەلآم: چـونكە سـەربازێكی تـووڕەو داخلەدڵـەو.. دەیـەوێ تۆڵـە لـە دوژمن بسێنێ.[١٣]

---

[١٣]- لەم بڕگەی -١٦-یەدا.. هەست بەوە دەكەین جۆرێك لە ناسازی هەیە.. بەلآم بەگشتی مەبەستەكەی ئاشكرایەو.. لە سیاقی قسەكردنەكانی دانەری

(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:

"کاتیٚ لەشکری دەوڵەتی (یان) گەمارۆی سوپای (چیٚ-مۆ)ی دوژمنی دا.. لووتی هەموو بێخسیرەکانیان بڕی.

بەرامبەر بەمە لەنێو سوپای (لووتبڕاواندا).. تووڕەیی‌و ڕق گەیشتە رادەیێك لە کوشتاردا دەست نەپارێزن‌و.. لە بەرگریدا سلٚ لە مەرگ و قوربانیدان نەکەنەوە.

بۆ ئەم مەبەستە نوێنەریان ناردە ئۆردووگەی دوژمن تا پێیان بلێٚ:

(ئێوە .. ئەی سوپای (یان) ! بەم کارە دڕندانانەتان ترس و لەرزتان خستە دڵمانەوە.. دیارە ئەم رەفتارە چەپەڵەتان.. لە هەڵدانەوەی گۆڕی باوباپیرانیشمان و.. خاپوورکردنی میرات و کولٚتووریشمان دەست ناپارێزن.. ئەدی دەبیٚ چی لە ئێمە چاوەڕوانبکەن ؟! ئایا دەبینە نێچیری ترس و تۆقاندنەکانتان !؟ نا.. لە بەرامبەرتاندا ئێمەیش دڵ‌و بازوومان توندوتۆڵتر دەکەین.. ئایا وا دەزانن خۆمان لە بەرگری‌و هێرشبردندا نادەین بەکوشت‌و .. لێدەگەڕێین چارەنووسمان وەك هی ئەوانەبێت سوپاکەتان وەحشییانە کردی‌و دەیکات؟.)

---

کتێبەکەدا دەردەکەویٚ.. مەبەستی کەمکردنەوەی توندوتیژیی‌و.. پێڕەوکردنی ئاکارە.

سوپای (یان) ئەم قسانەی نەیارەکەی بەهەند وەرنەگرت.. دەستیکردە هەڵدانەوەی گۆڕی مردووکانو سووتاندنیانو.. ئەتککردنی شتە پیرۆزەکانیشیان.. ئەوانیش (سوپای بەرگریی لە نیشتمان و میراتییەکانی نەتەوە) لەسەر شوورەی شارەکەیانەوە.. بەچاوی پڕ لە ئەئەسرینەوە بۆ ئەم هەموو گلاوکاریو وەحشەتگەرییەیان دەڕوانی.. لە رق و لە داخانا خەرکبوون دەتەقین.. بۆیێ هەموو بەجاریێ بڕیاری تۆڵەسەندنەوەو سزادانی داگیرکەریان دا.. بێ سڵکردنەوە لە مەرگو لە هەر قوربانیدانێکی بەنرخو بەهای دی.

بەمجۆرە هێزو ورەیان لە کوشتارو تۆڵەسەندنەوەدا دە هێندەی جاران زێدیکرد.. ئەمەیش بەهۆی ئەو رقە پیرۆزەو.. ئەو ئیستەرەمکردنەیان لەسەر تۆڵەسەندنەوەو سزادانی دوژمنبوو.. بێ گوێدانە ئەوەی ئەوان (داگیرکەر) چەندێك لە رووی عەسکەرییەوە زاڵو سەرکەوتوون.

سەرلەشکر ئەم ورە بەرزو قەشەنگەی نێو ریزەکانی سوپاکەیو خەڵکی شارە گەمارۆدراوەکەی ئیستیغلالکردو.. هێرشێکی سەرسەختانەی خۆکوژیانەی بۆ بردن.. دوژمنی بەجاریێ تێشکاندو.. تۆڵەی خۆیو سومعەی سوپاکەیو ئابڕووی میللەتی سەندەوە".

١٧- بۆچی سەرباز خاکی دوژمن تالاندەکات ؟

وەڵام: چونکە سەرباز بۆخۆی سەرکەوتن دەخوازیۆ..سوودی ماڵیو شکۆمەندیی نەتەوایەتیش بۆ میللەتەکەیو.. هەروەها تێشکان

و وێرانکردنــی وزەو توانــاو دارایــی دوژمنەکەیشــی مەبەســتە.. تــا جارێکی دی نەتوانێت هەڕەشە لە ئاسایيشی نیشتمانەکەی بکات.

وەڵێ نابێ تالآنی ببێتە مەبەست و ئامانجی سەرکەوتن.. یان هی جەنگ بەگشتی.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"...لە کۆتایی فەرمانڕەوایی خانەوادەی (هان)دا.. سەرکردەی سەربازگە (حامیە)ی (چین-چۆ) هێرشێکی بردە سەر یاخیبوانی ئەو ناوچەیەی خۆیان لە پاراستنی بەرپرسبوون.. کاتێ دای بەسەر یێکێ لە قەلآکانی یاخیبواندا.. هەرچی گەنجینەو ئەموالیان هەبوو تالآنیکردو.. بەسەر سەربازەکانیدا دابەشیکرد.. سەربازەکان بەمە شادمانبوون و.. بەو کەلوپەلانەی تالآنیانکردبوو خۆیان خەریکدەکرد.. بێ گوێدانە وریایی پێویست و ئامادەگییە عەسکەرییێکان.. بەمەرجێکیش هێشتا هێزە یاخیبووکان بە تەواوەتی تێنەشکابوون.. بەڵکو جارێکی دی بۆ کارە عەسکەرییێکان دژ بەو سەربازگەیە خۆیان رێکخستەوە.

سەرکردەی سەربازگەکە ویستی سەربازەکانی تێبگەیەنێت.. یاخیبوان هێشتا بەتەواوی تێنەشکاون و هەرەسیان نەهێناوەو.. ئەوانە لە مارەی ئەو دە ساڵەی رابردوودا لەگەڵ شەڕو پێکدادانندا سەردەرچوون و.. لە کوشتاریشدا قاڵو ورە بەرزن.. بەلآم ئەم قسانەی بەفیڕۆچوون.

ئەمجا سەرکردەی سەربازگەکە ویستی هاوکارەکانی لە سەربازگە عەسکەرییێکانی دیکەی ناوچەکە لە مەترسییە نادیاردکانی یاخیبوان

بـۆ سـەر ئاسایشـی وڵات ئاگادارکاتـەوە.. چـونکە هێشـتا بەتـەواوی تێنەشـکاون.. بۆیێ حاڵەتەکە وا دەخـوازێ.. هـەموو سـەربازگەکان بـۆ تێشکاندنی یاخیبوان هاریکاریبکەن.

بەڵام سەربازانی خۆیو (سەربازگەکانی دیش).. لـەم وریاکرنەوەیـە بێئاگـاو.. سـەرقاڵی ئـەو تالانیانـەبوون لـە قـەڵاکانی یاخیبوانـەوە چنگیان کەوتبوون.

سەرکردەی سەربازگەکە ناچاربوو پـەنا وەبـەر فرۆفێڵێك بـەرێ.. تا بەهۆیەوە سەربازەکانی ناچاربکات بچنە شـەڕی یاخیبوانو بەتـەواوی پاکتاویان بکەن.

بـۆ ئەمـە هـات چـەند کەسـێکی دڵسـۆزی لـە داروەدەسـتەی خـۆی راسـپارد.. بچـنە نێـو سـەربازگەکەی خۆیانـەوەو.. هەرچـی دەواری سەربازەکانە بە کەلوپەلەکانیشیانەوە بیانسووتێنن.. بەمـەیش هـەموو تالانییێکانی ئەو سەربازانە سووتا.. سەربازەکان بەم زیان لێکەوتنـەیان زۆر تووڕەبوون.

سـەرکردەکەیان بـە درۆ پێیـانی راگەیانـد.. یـاخیبوان ئـەم کەتنـەی پێداونو.. لەو ناوچانەدا بۆ ئاژاوەنانەوەو گەندەڵکاریی هێشـتا هـەر ماون.

ئـەمجا سـەربازەکان ورەیـان بـۆ تۆڵەسـەندنەوە لـە یـاخیبوان وەبەرهاتـەوە.. سـەرکردەش ئـەم ورەو.. لەسـەر شـەڕ سـووربوونەی سـەربازەکانی ئیسـتیغلالکردو.. جـارێکی دی بـەرەو قـەڵای یـاخیبوان وەپێش خۆی دان.

بەمجۆرە توانی یاخیبوان لە رەگوڕیشەوە هەڵکەنێ...."

لە ڕووداوێکی دیدا (چانگ-یو) دەگێڕێتەوە..

"(هان)ی دامەزرێنەری خانەوادەی شاهانەی هەمان سەردەم -کە باسکرا- فەرمانی بە هەموو هێزە عەسکەرییێکانی خۆی دا:

"لە گشت ئەو شارو ناوچانەدا کە دوژمنیان تێدا دەبەزێنن.. هەرچی ماڵو گەنجی نێو گەنجینەی دەوڵەتی بەزیو هەیە تالانیانکەن.. هەرچی ئازووقە لە ئەمباری دەولەتەکەیاندا هەیە تالانیکەنو.. بەسەر سەربازو ئەفسەرەکانتادا دابەشیانبکەن.

ئێمە تەنیا خاکەکەیانمان گەرەکە.. تا ببێتە موڵكو میراتی نەوە دوای نەوەی نەتەوەکەتان."

١٨- لەگەڵ یێخسیرەکانی جەنگدا جوامێرو میهرەبانبە !

(چانگ-یو) وتوێتی:

"پێویستە سوپای سەرکەوتوو میهرەبانو جوامێرانە مامەڵە لەگەڵ سەربازە یێخسیرەکانی دوژمندا بکات.. تا دواتر بتوانین بۆ پێداویستییێکانمانو لە خزمەنی سوپاو هێزو تواناماندداو.. بۆ مەبەستی سیاسی دیکەش بەکاریان بێنین."

١٩- ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە سوپای سەرکەوتوو بەهێزترو سەرکەوتووتردەبێتو.. لە مامەڵە جوانیی یێخسیرەکاندا دەیانکاتە پشتیوانی خۆیو..دەتوانێ چی زانیاریان لەمەڕ ئۆردووگەکەی خۆیانەوە پێیە لێیان وەرگرێتو.. وەك هێزو توانایێکی زێدەیش بۆ سوپای سەرکەوتوو سوودی لێوەردەگرێت بۆ سەرکەوتنەکانی دیکەی.

٢٠- هــەروەها ئەمــەیش پێکــەوەلکانی هێزەکــانی ســوپای سـەرکەوتوو و تفاقـەکانی دەگەیـەنێت.. لەگـەڵ ئـەو تفاقانـەی لـە ئۆردووگـەی دوژمـن و.. یێخسـیرەکانەوە دەسـگیرکراون و.. بێگومـان بەمەیش سوپای سەرکەوتوو بەهێوتردەبێت.

٢١- بـەکورتی لـە (هونـەری جـەنگ)دا.. ئامـانجی گشـت کـارە سەربازییێکان هەر سەرکەوتنی گورجوگۆڵانەیە.. نەك خۆخـەریککردن و ماندووکردنی درێژخایەنی بێئەنجام.

لەبـەر ئەمـە.. ئـەو سـەرکردە عەسـکەرییەی لـە واتـای ئـەرك و بەرپرسـیارییێکانی خـۆی تێـدەگات و.. فیکـرو هونـەری عەسـکەری دەزانێت.. ئەوا لە دوو لاوە خزمەتی میللەتەکەی دەکات:

بەرگریی لـە شـکۆمەندی و مافـەکانی و.. دابینکردنـی چارەنووس و چارەسەری دواڕۆژی نەتەوایەتی.

**(هو-یان-هسی)[١٤] فەرموویەتی:**

"ئـەو تایبەتمەنـدی و مـەرج و وردبینیانـەی پیـاوە دێرینـەکان لـە هەڵبـژاردنی سـەرکردە عەسـکەرییێکاندا رەچاویاندەکرد.. هـەر هـەمان مـەرج و وردبینـی و تایبەتمەنـدین ئێستەش لـە هەڵبـژاردنی سـەرکردە عەسکەرییێکاندا پێڕەودەکرێن."

---

[١٤]- مێژووناسی چینی (هو_یان_هسی) کە ئەم قسانەیکردووە.. لە ١٠٥٠ ساڵی بەر لە زایینی مەسیح ژیاوە.. واتا سێهەزار ساڵ بەر لە ئێستە.

( سۆن-تزو ) فەرموویەتی :

١- پەسەندترینی سیاسەتە عەسکەرییەکان‌و کارامەترین شێوازی جەنگ ئەوەیە: سوپا بە کەمترین وێرانکاریی بتوانێ بەسەر هەموو خاکی دوژمندا زاڵبێت.

ئەو سەرکەوتنە عەسکەرییە کاولکارییەی بەئێجگاری خاکی دوژمن بەتوورەکە دەبێژێ‌و دەیکاتە وێرانە.. ئەمە نزمترین پلەی سەرکەوتنە لە نێو پلەکانی سیاسەت‌و کارامەیی عەسکەریدا.

(لی-شوان) وتوێتی:

"جەنگ بە تەنێ پێشبڕکێیێك نییە بۆ خەڵکی کوشتن‌و کاولکردنی ئاوایییەکان.. بەڵکو جەنگ دوژمن شکێنی‌و تالانی دەستکەوتنە."

٢- وا پەسەندترە هێزی دوژمن بێخسیربکەیت نەك تێکیشکێنی.. سوپاییێك یان فەصیلێك یان هێزێکی عەسکەریی بە هەموو تفاقەکانییەوە بگریت باشترە لەوەی بە تفاقەوە تێکیشکێنی.

٣- لە بنەماکانی کارامەیی عەسکەریدا.. وا بەپەسەند دانانرێ سوپاییێك بە صەد پێکداداان ئەمجا بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵبێت.. بەڵکو واچاکترە بە کەمترین زیان‌و کورتخایەنترین شەڕ دابینکارییەکانی دوژمن تێکدەیت‌و.. بەسەریدا زاڵبیت.

٤- لەبەر ئەمە یێکەمین‌و مەزنترین ئەرکی جەنگ ئەوەیە.. هێرشبەریتە سەر نەخشەو پیلانە ستراتیژییەکانی‌و.. پووچەڵیان بکەیتەوە.

( مۆ-تۆ ) وتویێتی:

"بە بۆچوونی شاجەنگاوەری پێکەم: بلیمەتیی و زۆرزانیی ژیان لەوەدایە گرفتەکان بەر لە روودانیان چارەکەیت.. هەروەها لە جەنگیشدا.. زۆرزانیی تەواو لەوەدایە هێزەکانی دوژمن بەر لەوەی مەترسیی بخەنەوە پووچەڵ و شپرزەیانکەیت."

( لی-شوان ) وتویێتی:

"لەسەرەتای نەخشە داڕشتنی دوژمندا هەڵمەتی بۆ بەرە.

لە رۆژانی کۆتایی مەملەکەتی (هان)دا.. وابوو یێکێ لە سەرکردەکانی گەمارۆی پایتەختی یێکێ لە دەوڵەتە دوژمنەکانی دا..پاشای ئەو دەوڵەتە گەمارۆدراوە.. کارامەترین راوێژکاری خۆی ناردە لای سەرکردەی سوپای گەمارۆدەر.. تا بۆ چارەی ناکۆکییەکان دانوستانی لەگەڵدا بکات.. سەرکردە لە ئاخاوتنی لەگەڵ راوێژکارە بەسەلیقەکەدا.. نە هەر وشك و بێتام و قیزداربوو.. بەڵکو فەرمانیدا سەریشی ببڕن.

ئەمجا خەبەر بۆ پاشای پایتەخت گەمارۆدراو دەنێرێ تا پێیبڵێ:

نوێنەرەکەت بێئەدەبانە رەفتاریکردو.. هیچ ئوسوولێکی دانوستانی تێدانەبوو.. لەبەر ئەوە سەرم بڕی.. تۆیش یا ئەوەتە خۆت بەدەستەوە دەدەیت.. یان بەباشی خۆت دامەزرێنەو ئامادەبە! چونکە ئێمە بەتەماین هێرشێکی خوێناویت بێنینە سەرو.. پایتەختەکەت کاولکەین.

پاشای پایتەخت گەمارۆدراو.. بەبێ شەڕو کوشتار تەسلیمبوو.

یاوەرانی سەرکردە سەرکەوتووەکە.. ئەمەیان بەلاوە سەیربوو.. لێیان پرسی:

-چۆن ئەو کەتنەت گێڕاو تیایشیا سەرکەوتیت؟! ئەو نێردراوەی هاتە لامان.. هیچ بێئەدەبی و بەدمەبەستییێکی لە دانوستانەکەدا لێنەوەشایەوە.. کەچی تۆ سەرت بڕیو.. بەبێ هیچ کوشتارێکیش بەسەر ئۆردووگەی دوژمندا سەرکەوتیت.. ئەمە چۆن؟!

سەرکردە وەڵامیدانەوە:

ئەو پیاوەی بۆ دانوستان نێردرابووە لامان.. وێڕای ئەوەی بەسەلیقەترین پیاوی نێو پایتەختە گەمارۆدراوەکە بوو.. خاوەنی گەورەترین عەقڵی کاریگەریش بوو.. پاشای وڵات.. لەو کاتە تەنگژاوییەی بەسەر وڵاتەکەیدا هاتبوو.. لە دانانی گشت نەخشەوپیلانێکی بەرگریو.. لە خۆقایمکردنو هێرشبردنو راوتەگبیری زەرووریدا.. پشتی بەو دەبەستو.. متمانەی بەو قایمبوو.. لەبەرئەوە سەری ئەو نێردراوەیم بڕی.. تا پایتەختەکەیان لە شارەزایی و سەلیقەو زۆرزانی ئەو پیاوە مەحرووم بێ.

ئیدی کاتێ پاشای پایتەختەکە زانی بە سەربڕینی ئەو پیاوە باشترینو بەسەلیقەترین عەقڵی کارامەی لەدەستچوو.. پایتەختی تەسلیمکرد.

پەسەندترین هەنگاوو پلەکانی سەرکردایەتی جەنگ ئەوەیە.. هەر زووبەزوو نەخشەو پیلانەکانی دوژمن پووچەڵکەیتەوە.. ئێمەیش بە سەربڕینی ئەو پیاوەی نەخشەدانەری دوژمن بوو.. هەموویمان بۆ پووچەڵکردنەوە.

٥- لە سەلیقە عەسکەرییەکانداو.. بە پلەی دووەم ئەوە دێت.. چۆن بتوانیت هەرچی هەڤاڵبەندیی و هاوپەیمانێتی نێوان دوژمن و پشتیوانەکانی لە ناوچەکەو دەرڤەیدا هەن.. هەڵیان بوەشێنیتەوە..

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"بواری دوژمن مەدە هاوپەیمانێتی ببەستێ و.. لەگەڵ پشتیوانەکانیدا وەخۆیکەوێت و گردوکۆببێت."

هەروەها(وانگ-هسی) وتویێتی:

"بەوردیی.. هەرچی هەڤاڵبەندیی و هاوپەیمانێتی و پێوەندیی دوژمن بە خزم و هاوسێ و.. دەوڵەتەکانی دەرەوەش هەیە.. هەموویان بەوردیی بخوێنەرەوەو هەڵیانسەنگێنە.. ئەگەر دوژمن هاوپەیمانێتی و هاوسێیەتی وای هەبوو کە هیچ گومانێك لە بەتەنگ یێکدییێوە هاتن و دڵسۆزی نیوانیان نەبوو.. ئەوە مانای وایە.. کێشە لەگەڵ وزەو توانای ئەمجۆرە دوژمنانەدا بەڕادەییێك مەترسیدارو ئاڵۆزدەبێ.. نەتوانرێت هەروا بەئاسانی تێکبشکێنرێ.

وەلێ ئەگەر دوژمن لەتەك یاران و هاوسێیانیدا ناتەباو بەگێچەڵبوو.. هەروەها هەڤاڵبەندیی لەگەڵ وڵاتە دەرەکییێکانیدا شلۆق و بەگرێوگۆڵبوو.. ئەوا راوکردن و زاڵبوون بەسەر ئەم تەرزە دوژمنانەدا ئاساندەبێ."

٦- سێیەمین پلەی بەسەلیقەیی و سەلاریی عەسکەریی.. مەسەلەی هێرشی راستەوخۆ بردنە سەر دوژمنە.

لەم بارەیەوە بیرو بۆچوون و ورباکردنەوەی پێویست هەن.

**(شیا-لین) فەرموویەتی:**

"بە بۆچوونی یێکەمین شای جەنگ[15]: ئەو سەرکردەیەی بەتەنیا پشت بە چەك دەبەستێ.. سەرکردەیێکی کلۆڵە."

**(وانگ-هسی)ش فەرموویەتی:**

"بەرپرسیارێتی گێمە جەنگییێکان لەوە تێدەپەڕێت بەتەنێ بریتیبێت لە کارامەیی لە هونەری کوشتاردا.. بەڵکو پێویستی بە فکری ڕەسەنیش هەیە."

**(چانگ-یو) وتوێتی:**

"ئەگەر نەتتوانی نەخشەکانی دوژمن هەر لەنێو لانکەوە هەڵبوەشێنیتەوە.. ئەگەر لە گرێوگۆڵ خستنە نێو هاوپەیمانێتیو پێوەندیو هەڤاڵبەندییێکانی لەگەڵ دۆستو پشتیوانەکانیداو.. لەگەڵ ئەوانەشدا دەتوانن بەهانایەوە بێن.. دەستەوسان بوویت.. تەنیا ئەو ساتە بچۆ چەکەکەت دەمەزەرد بکەرەوە.. بەڵکو سەرکەوتن بەدەستبێنی!"

---

[15]– لە دەقە ئەسڵییێکەی کتێبی (هونەری جەنگ)دا.. ئێمازە بۆ وتەکانی کەسێك دووبارە دەبێنەوە.. کە مێژوونووسە (چین)ییە کۆنەکان بە (یێکەمین شای جەنگ) ناویدێنن.. پێدەچێ مەبەست لەم ئێمازەیە.. سەرکردەیێکی عەسکەریی بەناوبانگبێ لە مێژوی هەرە کۆنی (چین)دا.. یاخود مەبەست لە کەسێتییێك بێت.. کە وەك سەرکردەیێکی بلیمەت لە هونەرەکانی جەنگدا بووبێتە نموونەی باڵا.

٧- بەدترینی سیاسەتە عەسکەییێکان ئەوەیە.. لە هەموو لایێکەوە گەمارۆی شارێ، یان ولاتێ بدرێت.

چونکە ئەو کاتە تەنانەت ترسنۆکەکانیش دەبنە شێری مەیدان.. لاواز لە قوربانیدان سڵناکاتەوە.. خەڵکی ئەو شارە.. یان ئەو ولاتەی لە هەر چوارلاوە گەمارۆدراوە.. پاڵەوانانە بۆ شکاندنی گەمارۆکە تێدەکۆشن.

لەبەر ئەوە.. وا باشترە لە گەمارۆی ئەو شارە، یان ئەو ولاتەدا.. دەرکەیێ.. یان دەربازگەیێ بهێڵرێتەوە.. تا ببێتە مایەی جۆرە خاوبوونەوەو داهێزرانێکی ورەی بەرگریی دوژمن.. تا هەموو نەبنە خۆبەختکەرو شێری مەیدانو.. هەرچی وزەو توانایێکی گیانفیدایانەیان تێدایە بۆ شکاندنی گەمارۆکە نەیخەنەکار.

گەمارۆدانی چرِوپڕی شارو ولاتان لە هەموو لایێکەوە.. بەنیسبەت سوپای گەمارۆدەر کارێکی سەختو گرانەو.. جەنگێکی درێژخایەنیش بەدووی خۆیدا دێنێ.

شار گەمارۆدان.. دەبێ دواهەمین رێچارەییێکی سەرکردایەتی سەلارو بەسەلیقە بێت.. بەناچاری پەنای وەبەردەبات.. ئەویش دوای تاقیکردنەوەو بەکارهێنانی هەرچیی رێبازو هونەری دی لە (هونەرەکانی جەنگ)دا بۆ تێکشکاندنو بەسەر دوژمندا سەرکەوتن هەن.. هیچیان دادیان نەدا.. ئەوجا نۆرەی گەمارۆدان دێت.

ئامۆژگارییۆ رێنماییێکانمان بۆ خۆدوورخستنەوە لە پرۆسەی گەمارۆدانی شار.. پشت بەم بنەمایانە دەبەستن:

٨- گەمارۆدان پێویستی بە چەند مانگێك هەیە بۆ گواستنەوەی زەخیرەو تفاق و.. خۆقایمکردن و.. چەکی قورس هاوردن بۆ بۆردومانی شوورەکانی شارو.. سەنگەرلێدان لەدەوری شار.. یا ناوچەکە.. لە هەموو لاییێکییەوەو.. دامەزراندنی بنکەی چەسپاوو گەڕۆك لەدەوری هەموو شوورەکانی شار (سنوورەکانی ولات)ە گەمارۆدراوەکە.

٩- ڕوودەدات.. سەرکردەی ئەو سوپایەی لە هەموو لاییێکەوە گەمارۆی دوژمنی داوە.. ئارامی لەبەر هەڵدەگیرێت و.. فەرمان بە هێزەکانی دەدات.. کۆمەڵ کۆمەڵ و دانە دانە.. لەلاییێکەوە یان لە چەندین لای سنوورەکەوە.. بە شوورەکانی شارە گەمارۆدراوەکەدا هەڵزنن.

بێگومان ئەمجۆرە هێرشبردنانە بۆ سەر شوورەکانی شار (یان سنووری ولات).. لە هەموو لاییێکەوە.. واتا ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ بەرگرییێکی سەرسەختانەو بەرەنگار بوونەوەییێکی بەهێزی خەڵکی شار (یان ولات)ە گەمارۆدراوەکەدا.. ئەمەیش لە ئەنجامی ئەو خۆقایمکردنانەوەیە بۆ بەرگریی لە هەموو شوورەو سنوورەکانیان دایانمەزراندووە.. لەبەرئەوە زیانەکانی ئەو سوپایەی دەیەوێ شوورەکان بڕووخێنێ.. یان بەسەریاندا هەڵزنێ.. جار لەدوای جار زێتردەبێت.. بەرلەوەی شارەکە داگیربکات.

(مۆ-تۆ) وتوێتی:

"لە کۆتاییێکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی (دای)دا.. ئیمپراتۆر بەخۆی سەرکردایەتیی هێرشێکی عەسکەریی لە صەدهەزار جەنگاوەر

پێکهاتوو سازکرد.. بۆهێرشبردنه سەر پایتەختی دوژمنەکەی لە (یۆ-سای).. ئیمپراتۆر گەمارۆییێکی سەرانسەریی توندی خستە سەر پایتەختەکە.

یێکەمین داواکاریی ئیمپراتۆر لە پاشای پایتەختە گەمارۆدراوەکە ئەوەبوو.. هەندێ شەرابی بۆ بنێرێ.[16]

پاشا بەسەر شوورەکەوە.. لەجیاتی شەراب.. شووشەییێکی بۆگەنی پڕ لە میزو پیسایی ئینسان‌و وڵاخ بۆ نارد.

ئیمپراتۆر لەم سووکایەتی پێکردنە زۆر تووڕەو تەنانەت دەهریش بوو.. فەرمانی بە سەربازەکانی دا.. بۆ هێرشبردنە سەر شوورەی شاری گەمارۆدراو.

لاشەی سەربازە کوژراوەکانی ئیمپراتۆر لە دامێنی دەرەوەی شوورەکانی شار کەڵەکە بوون‌و.. بەمەیش سەربازانی پاشای بەرگریکەر.. بەهۆی خۆقایمکردن‌و دامەزراوە تۆکمەکانیانەوە.. کە بە ناچاری‌و بۆ بەرگریکردن لە وڵاتەکەیان دایاننابوو.. هەروەها لەبەرئەوەی هیچ چارەییێکی دیکەیان نەبوو جگە لە مەرگی شکۆمەندانە.. نەك مردنێ یاخود یێخسیربوونێکی سووك‌و سەلیمانە.. لەمەدا زۆر بەچاکی سوودمەند بوون‌و.. بردیانەوە.

ئیمپراتۆریش.. وێڕای ئەوەی سێ رۆژ یێکبینە خەریکی هێرشیبردنە سەر شوورەکان بوو.. ئەنجام نوشستی هێنا."

---

[16]- لەو رۆژگارانەدا وا باو بوو.. هەردوو سوپای جەنگاوەر بەر لە دەسپێکی شەڕو پێکدادان.. هەندێ دیارییان لەنێو خۆیادا دەگۆڕییەوە.

١٠- بەمجۆرە.. ئەوانەی لە (پیشەو هونەری جەنگ)دا کارامەن.. دەتوانن بێئەوەی زیانی گەورە لە خۆیان بدەن.. دوژمن شکستخواردوو بکەن.. دەتوانن شار بەشاریش ولاتیان داگیربکەن.. بێئەوەی گەمارۆیانبدەن.. دەتوانن بیشیانخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە.. بێئەوەی بچنە نێو شەڕو پێکدادانێکی درێژخایەن و پرزەلێبڕاوانەوە.

**( لی-شوان ) فەرموویەتی :**

"کارامەترین سەرکردەی عەسکەریی ئەوەیانە لە ڕێبازە هونەرییێکانی چالاکییە (ستراتیژی)یێکاندا سەرکەوتووبێت.. نەك لە بەرپاکردنی جەنگی گەورەوگران و شەڕوکوشتاری زۆروزەبەندەدا.

لە کۆتاییێکانی سەردەمی (هان)دا.. وابوو میر (تسانگ-کۆنگ) ئابلۆوقەی یاخیبوانی لە شاری (یوان)دا دا.. مانگانێکی زۆر هەروا مایەوەو.. بەردەوام مەسرەفیشی دەکرد.. بێئەوەی بتوانێ شارە گەمارۆدراوەکە بخات و کۆتایی بێت.

دوای ئەوەی نەخۆشیی (قورحەی گەدە)یان تێدا بلاوبۆوە.. بێزارییێکی زۆر ئەفسەروسەربازانی داگرت.سەرکردەییێکیان چووە لای میرو پێیگوت:

-هێزێکی فرە گەورەت خستۆتە بەندی گەمارۆی شارەکەوەو.. لە هەموو لاییێکەوە ئابلۆوقەتداوە.. وات لە خەڵکی ئەو شارە کردووە.. هەموویان ئامادەبن لەپێناوی بەرگریی لەخۆکردندا خۆیان بەختکەن.. ئاخۆ وادەزانیت ئەم کارو کردەوەیەت لە زۆرزانییێکی (ستراتیژی)یانەی پەسەندەوەیە؟!

پێویسته تا زووه ئابلّووقه هەلْگرین‌و.. لێگەڕێین دەربازگەیێك بۆ خەلْکی شارەکه هەبێت.. تا بزانن ئومێدو دەرفەتی هەلاّتنیان هەیه.

ئیدی لەوەودوا.. هەر پۆلیسێك (یان گوندپارێزێك) دکاریێ وەدوویانکەویێ‌و یێخسیریانکا.. یان بیانکوژیێ.

میر.. بەگوێی راوتەگبیری ئەم سەرکردەیەی کرد.. ئابلّووقەی لەسەر هەندیێ لە دەروازەکانی شار هەلّگرت.. بەرگریی ناوخۆیی تێیدا خاوبۆوەو.. پەرۆشی‌و جەختی بەرگریکردن‌و خۆبەختکردن کزبۆوە.. ئەوجا میر هێرشی بۆ بردو گرتی."

١١- مەرج نییه ئامانجەکەت ئەوەبێت.. هەرچی خاکێکی ژێر ئاسمانی ئەو ناوە هەیه بیانخەیتە ژێر رکێفی خۆتەوە.. بەلْکو دەبیێ لە ئامانجەکانتدا لەخۆبایی‌و سەرکێش نەبی‌و.. کامەیان لەویدی گرینگترە ئەوەیان هەلّبژێری.. سەربازەکانت بە شەڕو کوشتاری درێژخایەنەوە شەکەت‌و پرزەلێبڕاو مەکە.. وزەو دارایی ولاّتەکەت مەخەرە پێناو خەرجی‌و مەسرەفی جەنگەوە.

ئەمانە ستراتیژییێتی هێرشبردنن.

١٢- چۆنێتی بەکارهێنانی سەرباز لە مەیدانی شەڕو لەژێر فەرماندەی سەرکردەدا.. بۆخۆی هونەرێکی تایبەتیی جەنگە.

-ئەگەر هێزەکەت دە هێندەی هێزی دوژمن بوو.. ئەوجا هەولّبدە لە هەموولاییێکی ئۆردووگەکەیەوە گەمارۆی بدەی."

(تا زۆرترین ژمارەی یێخسیرو تالاّنیت چنگکەویێ."

١٣- ئەگەر هێزەکەت پێنج ئەوەندەی هێزی دوژمن بوو.. هێرشبەرە سەری.

(چانگ-یو) وتویەتی:

"ئەگەر هێزێکی پێنج هێندەیی هێزی دوژمنم لەبەردەستدا بێت.. هەراسان و قوشقی دەکەم تا رایدەکێشمە نێو مەیدانی شەڕەوە.. لەنکاو لە پاشەنگ (موئەخەرە)ی دەدەم و.. هەراوزەناییێك لە قوڵ (بەرە)ی خۆرهەلاتی دوژمندا دەنێمەوە.. تا لە قوڵی خۆرئاواوە لێیدەم."

١٤- ئەگەر هێزەکەت دوو هێندەی دوژمن بوو.. هەوڵبدە هێزەکەی (ئۆردووکەی) بکەیتە دوو کەرتەوە.

(تۆ-یۆ) وتویەتی:

"ئەگەر رێژەی هێزی دوژمن یێك (١) بە دوو (٢) لە بەرژەوەندی تۆبوو لەچاو دوژمندا.. ئەگەر ئەو زیادە رێژەییەی هەتە.. نەیتوانی دەسەلاتت بەسەر رەوشە عەسکەرییێکەدا پێببەحشێت.. ئەوا پەنا وەبەر فرِوفێڵ و چاوورِاو بەرە.

موناوەشە لەگەڵ لاییێکی هێزی دوژمندا بکە.. تا وەدووت دەکەوێ.. بەمە هێزەکەی دەکەیتە دووبەشەوە.. ئەوجا لێیدە!

یێکەمین شای جەنگ وتویەتی: ئەگەر سەرکردە نەیتوانی هێزەکانی دوژمن پەرتپەرتبکا.. ئەوا ئەو سەرکردەیە لە ئەنجامگیریی زانیارییێکانی (هونەری جەنگ)دا کلۆڵ و دەسەپاچەیە."

١٥- ئەگەر هێزەکەت و هێزی دوژمن چونییێك بوون.. ئەوا خۆت سەرپشکیت.. ئەگەر پێت باشبوو لەگەڵیدا تێهەڵچۆ!

**( هو-یان-هسی ) فەرموویەتی:**

"لەمجۆرە حاڵەتانە (هاوڕێژەیی هەردوو هێزەکە)دا.. سەرکردەی کارامەو بەسەلیقە بڕیاری ئەنجامی شەڕەکە دەدا."

١٦- ئەگەر هێزەکەت بەژمارە لە هی دوژمن کەمتر بوو.. لانیکەم با هێندەت لە توانادابێ پرۆسەی کشانەوەو پاشەکشێی (تەکتیکی) بەباشی بەڕێوەبەریت.

**( مۆ-تۆ ) وتویێتی:**

"ئەگەر ژمارەی سەربازە مەیدانییەکانت لە هی دوژمن کەمتربوو.. هەوڵبدە بە شێوەییەکی کاتی هەلێکی بۆ بڕەخسێنی.. تا هێرشێکی لەنکاوت بکاتەسەر.. هیچ بە دووری مەزانە لەو کاتەدا لایەنێکی لاواز لە ئۆردووی دوژمندا بدۆزیتەوەو.. ئیدی بۆئەوەی هێرشێکی غافڵگیری بۆ بەریت.. گشت هێزەکانت بە ئومێدی سەرکەوتن خڕکەوەو.. سەرکەوتن یاوەرت دەبێ."

**هەروەها ( چانگ-یو ) وتویێتی:**

"گەر دوژمن بەهێزو من لاوازبووم.. خۆمی لێ دەپارێزمو.. بە مۆقەت لە شەڕ دەکشێمەوە.. بۆئەوەی هێزو تواناکانم پەرتەوازە نەبن.. ئەوسا شێوازێکی وردو گونجاو بۆ هێشبردن.. یان خۆقایمکردن بۆ بەرگریی دەدۆزمەوە.

لـەم حاڵەتـەدا.. ئـەوەی بڕیـاری کۆتـایی سـەرکەوتنەکە دەدات..
لێزانـی سـەرکردایەتیو.. ڕۆشـنبیریی سـەربازو.. ئەزموونـەکانیان لـە
هونەری جەنگو.. بەرزیو پتەویی ورەیانە.

ئەگەرئۆردوۆکـەم ڕێکوپێـكو.. ئاسـتی هێزەکـانم پەسـەندبوو..
هێزەکانی دوژمن بێنیزامو لـە ئاستێکی نزمدا بوون.. هـەروەها ئەکەر
فیکـرو جووڵـەم چوستوچـالاكو.. دوژمـن گـەوجو فیکـر پـەرتو
شێواوو.. جووڵە هەڕەمەکی بوو.. ئەوجا دەتوانم یێکسەر بۆی بچمە
مەیدانی جەنگەوە."

ئەگـەر هێزەکـەت.. بـە هـەموو پێـوەرێکی هێـز.. هاوشـانی هێـزی
دوژمـن نـەبوو.. لانیکـەم خـۆت دوورەپـەرێز بگـرە لێـیو.. بـوارو هـەلی
ئـەوەی بـۆ نەڕەخسـێنیت لەگـەڵتا بەجـەنگبیّ! چـونکە هـەر زیانێکـت
لێبکـەوێت _لەبەرئـەوەی تـۆ لـە دوژمنەکـەت لاوازتریـت_ ئـەوە بـە
دەسکەوتێکی باشی دوژمنەکەت دادەنرێت.

(چانگ-یو) وتوێتی:

"لەسەر ئاستی پیـاوو تفاقو چالاکیو ئامادەباشـیی.. نـە بچووك
بە گەورە پێوانە دەکرێتو..نە لاواز بە بەهێزو.. نە کەم لەگەڵ زۆردا."

١٨- سـوپا پـارێزەری نیشـتمانە.. ئەگـەر وزەو توانـاو چـالاکی
سوپا لـە پاراستنی نیشتماندا لاوازبوو.. ئـەوا نیشتمان لاواز دەبـیّ..
ئەگەر وزەو توانـای سـوپا بـۆ پاراسـتن پەسـەندو چالاكو جێـی متمانـە
بـوو..ئـەوا نیشـتمان ئـازیزو دڵنیـادەبیّو.. گـوڵزاری تێـدا
پەخشدەبێتەوە.

(چانگ-یو) وتوێتی:

"بەڕای یێکەمین شای جەنگ.. ئەگەر پاشای وڵات لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتی سوپادا لێزان و بەتوانا بوو.. نەتەوە گەشەدار دەبێ.. ئەو میللەتەیش سەرکردە خراپەکان بۆ سوپا هەڵدەبژێرێ.. تووشی نەهامەتی دەبێت."

١٩- سێ حاڵەت هەن حاکم تێیاندا نوشستی بەسەر سوپادا دێنێ.. یان سوپا نوشستی بەسەر حوکم و نەتەوەدا دێنێ.

٢٠- یێکەم : کاتێ حاکم فەرمان بە سوپا دەدات هەڵمەتبەرێ.. هەلومەرجی عەسکەریی لە حاڵەتێکدایە وا پێویست دەکات خۆیان قایمکەن.. یان بکشێنەوە.. وەیان هەڵوێستێکی بەرگریی وەرگرن.

یاخود بەپێچەوانەوە.. لە کاتێکدا پێویستە هێرشبەرن.. حاکم فەرمانی کشانەوە دەداتە سوپا.

(شیا-لین) وتویێتی:

"چالاکی عەسکەریی.. چ هێرشبردن و چ کشانەوە.. ئەرکێکن تەنیا لە ئەستۆی سەرکردەدان و.. بەپێی بارودۆخ و هەڵسەنگاندنی وردی هەلومەرجەکان هەر ئەو بەرپرسە لێیان.. لەو ئێش و ئازارە نەفرەتیتر نییە حاکم لە نووسینگەکەی نێو پایتەختەوە سەرکردایەتی سوپا بکات."

٢١- دووەم: کاتێ حاکم لە کاروباری عەسکەریدا نەفامبێت و..بەزۆریش خۆی تێهەڵقورتێنێ.. یان لە کاروباری عەسکەریدا شارەزابێ و.. لە بەڕێوەبردنی حوکمدا گەوج و نەفامبێ.

لە هەردوو حاڵەتدا هێزی عەسکەریی وڵات دووچاری ناشیرینترین و بەدترین ئازارو لاوازی و ئاژاوە دەبێت.

(تساو-تساو) فەرموویەتی:

"سوپا بە نازهەڵگرتنی لاقرتێکەران دابینناکریٚ"

(مۆ-تۆ)ش وتویٚتی:

"ئـەوەی لـە کێشـەکەدا پێوەنـدیی بـە ئوسـووڵی رەفتـارکردن و.. مەسـەلە یاسـاییەکان و نـەریت و رایبکـردن -ئیجرائـات-ە عەسکەرییەکانەوە هەیە.. ئەوا ئەرکەکانی هێزە چەکدارەکانی وڵات.. یاساگەلێکی عەسکەریی تایبەت رێکیاندەخات.. کە هەر بۆ هێزە چەکدارەکان دانراون و.. لە زوربەی حاڵەتەکاندا پابەندیان دەبن.

ئەگەر ئەو سیاسەت و ئیجرائات و پێداویستیانەی دەسەڵاتداری ئەو رۆژگارە پێرەویدەکات.. بیەوێت بەزۆر هێزە چەکدارەکانیشی ناچار بکات پێرەوی بکەن.. ئیدی ئەهلی کارو پیشە عەسکەرییەکە دووچاری شڵەژان و ڕاڕایی فیکری و گرفت و کێشە لە باوەڕو هەڵسوکەوتیاندا دەبێت."

(چانگ-یو) وتویٚتی:

"دەشێ بنەمای حوکمی وڵات لەسەر دادوەریی و ویژدان و میهرەبانیی دامەزرابێت و.. حاکمی وەختیش بڕوای بە ئایدیۆلۆژیاییەکی سیاسی بەهاداربێت و.. بەو پێیەش پێرەوی بکات.

هەروەها دەشێ پابەندبوون بەو بەهایانەوە بۆ کاروباری میللەت و سیاسەت دەستبدەن و باشیشبن.. لیٚ مەرج نییە بۆ کاروباری عەسکەریی دەستبدەن.

سەرکردایەتیکردن و کارامەیی و.. هەروەها کاروبارو چالاکی و ئەرکە سەربازییێکان.. پێویستیان بە نەرم و نیانی (جێڕی) و خۆگونجاندن و دەرئەنجامگیریی خێرایانە هەیە.. لە گشت ئەو بیروبۆچوون و گۆڕانکاریی و پێداویستی و ناکاوکاریانەی هەڵوێستی عەسکەریدا.

سوپاش پابەندی هیچ قاڵب و یاساییێك نابێت.. جگە لەوانەی لە هونەری جەنگ و ئەرکەکانی بەرگریی نەتەوایەتیدا هەن.. نەك پابەندبوون بە هەوەس و میزاجی پاشای وەختەوە.. بەتایبەتی ئەگەر ئەو پاشایە خۆی گیرۆدەی هەندێ ئایدیۆلۆژیای نامۆو نەشیاوو نەگونجاوبێت لەگەڵ ئەرکەکانی بەرگریی نەتەوایەتی و.. لانیکەم لەنێو بۆتەو سنووره عەسکەرییێکەیدا."

٢٢- سێیەم: کاتێ پاشای وەخت.. لەمەڕ هەڵسەنگاندنی کاریگەریی چاك یان خراپی تەبیعەتی گشتیی هەلومەرجەکە لەسەر ئەرکە عەسکەرییە پەتییێکان گەوج و نەزانبێ.. ئەوا هەر ڕێنماییێکانی خۆی بەسەر سوپادا دەسەپێنێ و.. سوپا دەخاتە ژێر باری گرانی ئەو مەبەست و هەواو هەوەسانەیەوە.. کە لەوانەیە لەگەڵ بارودۆخەکەدا نەگونجێ.. یان سنووری ئازادیی هەڵسوکەوتی ئەهلی کارو ئەرکە عەسکەرییێکان لە مەیدانی شەڕدا بەرتەسك بکاتەوە.. لە کاتێکدا ئەوان ڕووبەڕووی دوژمنێك بوونەتەوە.. بۆچوون و تەکتیکی تایبەتیی خۆی لە هەڵمەتبردن و هەلاتندا هەیە.

( وانگ-هسی ) وتویێتی:

"ئەگەر پاشای زەمان.. پیاوانێکی لە یاوەرە گەوج و نامۆ بە ئوسوولی ئەرکە عەسکەرییێکان.. بۆ سەرەوکاریی کارگێڕی و.. بۆ ڕێنمایی و دەسبەسەراگرتنی هێزە عەسکەرییێکانی ولات نارد.. ئاژاوەو بێزاری لەنێو ریزەکانی هێزە چەکدارەکاندا بلاودەبێتەوەو.. بیرکرنەوەی راست و دروست لە کاروبارو ئەرکە عەسکەرییێکاندا گەندەڵ دەبێت و.. سوپا.. وزەو توانا داهێزراو..ئەندێشە شێواو.. چالاکی و ئەرکە عەسکەرییە دروستەکانی ئفلیج.. ئیدی گومان و دەسیسەکاری بەربلاودەبێ: لەنێوان بەتەمابووی دەسەلات بەسەر حکوومەتداگرو.. داکۆکیکەر لە دەسەلاتەکەی نێو سوپا."

٢٣- کاتێ سوپا دووچاری گومان و دەسیسە نێوخۆییێکان دەبێ.. فەرمانڕەوایانی دەولەتە دراوسێکان کێشەو قەیران بۆ ولات دەخولقێنن.. بۆ ئەمەش پەندێکی باو هەیە دەڵێت "ئەو سوپایەی سواری ولات دەبێ.. یان ئەو ولاتەی سواری سوپا دەبێ.. دوژمن سواری هەردوکیان دەبێ.

( وانگ-هسی ) وتویێتی:

"بەڕای یێکەمین شای جەنگ "ئەو سوپایەی سکی بەگەندەڵیی ئاوسبووە.. جگە لە وەچەی یێك بەدووی یێکی شکستدا هیچ وەچەیێکی دی ناخاتەوە."

( لی-شوان ) فەرموویەتی:

"سەركردەییێك لەپێناوی.. یان لەجیاتی شكاندنی دوژمن.. بەتەمای نوشستهێنانی حكوومەتەكەی بێت.. نابێ فەرمانداریی سوپا بكات."

"ئەگەر هاتو سوپا چاوی بڕیبووە هەردوو دەسەلاتەكە: حوكمو جەنگ.. ئەوا وەك عوودی بەزمگێڕانی ژێ پساوی لێدێت.. نە بۆ ژەندنی ئاوازەكان دەستدەداتو.. نە بۆ لێدانی شت -چونكە تەپڵێكی بۆشە.

٢٤- لە پێنج حالەتدا دەكرێت پێشبینی سەركەوتنی عەسكەریی بكرێت:

٢٥- یێكەم: ئەو حاڵەتەیە بەرپرسارێتی عەسكەریی تێیدا دەرك بە لەباریی و شیاویی هەلومەرجەكە دەكات.. چ بۆ هێرشبردن.. یان بۆ دواخستنی شەڕ بۆ هەلومەرجێكی لەبارتر.

٢٦- دووەم: ئەو حاڵەتەیە سەركردایەتی بەڕاستیو دروستیو ئەمینی پەی بەوە دەبات.. ئاخۆ بارودۆخەكە سوپاییێكی گچكەی لێدەخوازێت.. یاخود سوپاییێكی گەورەو گران !

هیچ سوودێك لەوەدا نییە.. سامانو داهاتی نەتەوە بە مەسرەفو خەرجییەكانی سوپاییێكی زەبەلاح لەبەردبدەین.. سوپاییێكی ئەرك پەرشو بڵاو.. ژمارە زۆری دەستوپێگر.. لەو پشتیوانو وەدووكەوتوانەی بۆ كاروباری عەسكەریی بێكەڵكن.. ئیدی ورگی سوپا هەڵدەئاوسێو.. پەكی وزەو توانا بەدەستوبردو چالاكانەكەی دەخات.. سەركردایەتییێكەیشی خۆی بەو كێشە كارگێڕیی و سیاسیانەوە خەریكدەكات.. هیچ پێوەندییێكیان بە ئەركە

عەسکەرییێکانەوە نییە -کە ئەرکگەلێکی مەزنن-.. هەرچی بەهرەو تواناو تەکتیکی تایبەت بە پیشەی جەنگ هەیە.. هەمووی لێ بەتاڵدەکاتەوە... کە نابێت سەرکردایەتی خۆی بەو ئەرك‌و کێشە لاوەکیانەوە خەریکبکات.

(تۆ-یۆ) ئێماژە بە مەترسییێکانی ئەو حاڵەتە حەشووکردنەی سوپادەدات.. کە ئەو کەس‌و توخمانە هیچ سوودێکیان نییە جگە لە تێرکردنی حەزو خولیای سەرکردایەتییە عەسکەرییێکان.. بە قەبەیی ژمارەی پیاوو تفاقەکان.

لەم رووەوە ناویراو دەڵێ:

"حاڵەتی وا هەیە.. سەربازی بە ژمارە زۆر ناتوانێ لە ئۆردووگەی دوژمندا بەرامبەر کەمە سەربازێك بجەنگێ.

هەروەها حاڵەتی واش هەیە.. سوپاییێکی بە ژمارە کەم.. دەتوانێ بەسەر سوپاییێکی بەژمارە زۆرو بە چەکەمەنی گەورەی دوژمنیدا زاڵبێت.

سەرکەوتن هەر بۆ ئەوەیە.. لە هەڵسوکەوت‌و چالاکیدا بەدەستوبردو بەتوانایە.. بە بارو بارگەی ئەو ئەرکانەی پێوەندییان بە کارو پیشەی جەنگەوە نییە خۆی شەکەت ناکات.. ئەو تۆپەڵە بەشەرە لە سەربازی مەشق لاواز.. هەڵسوکەوت خاووخلیچك..خەرجی‌و مەسرەف گران- خاڵی لاوازی نێو سوپا دەخولقێنن.. نەك خاڵ‌و سەرچاوەی هێز.

٢٧- سێیەم: حاڵەتێکی دی لەوانەی دەتوانرێت بەڕاستی‌و دروستی پێشبینی سەرکەوتنی تێدا بەدیبکرێت.. ئەوەیە لەنێو

ریزەکانی سوپادا هەست بە یێك ئامانجیی و.. چارەنووس و گوزەران چونییێکی بکرێت.

( تۆ-یۆ ) لە زمانی ( مانشیۆس )ی دانای کۆنەوە وتویێتی:

"رەچاوگرتنی کەشوهەوای وەرزەکانی ساڵ.. لە رەچاوگرتنی تەبیعەتی (جوگرافی) خاك و مەیدانی شەڕ کەم بایێخترە.. هەردوکیشیان لە تایبەتمەندییە عەسکەرییێکاندا کەم بایێخترن لە گرنگیی پێوەندییە بەشەرییێکانی نێو ریزەکانی سوپا.

"سوپای هاوپەیمانی پێکهاتوو لە رەگەزە لکوپۆدارەکانی: رەچەڵەك و وڵات و سەرۆکایەتی و بیروبڕوا جۆراوجۆری پەرش وبڵاو.. ئەوە -وێڕای ئەوەی لە رووی ژمارەی پیاوو بارستایی ئازووخەو تفاقی عەسکەرییێوە گەورەو گران بێت- سوپاییێکی کلۆڵە.

ئەم خاڵانە -لەسەر ئاستی سەرباز- بە هاودژایەتی و ناکۆکی ناوکۆییان بەرامبە دوژمن دەستنیشان دەکرێت.. بەڵام لەوانەیە سەرکردانی سوپا.. یا سەرۆکانی ئەو وڵاتانەی ئەم سوپا هاوپەیمانەیان لێ پێکهاتووە.. لەنێو خۆیاندا تەبا نەبن.. ئەمجۆرە سوپایانە هیچ خێرێکی سەرکەوتنیان تیا بەدیناکرێ.

کێشەکەش هەر ئەوە نییە چۆن ئەم سەرکردایەتییە ناحەزانە لەژێر رکێفی تاکە سەرکردەییێکدا رێکدەخەیت.. بەڵکو کێشەکە لەو یێکفکری و یێکئامانجی و یێکباوەڕییەدایە کە سەرجەمی سوپا هاوپەیمانەکە بڕوای پێیەتی ــ چ لەنێو ریزەکانی سەربازەکانداو.. چ

لەپلــەو پایـــە ســـەرکردایەتییێکانداو.. چ لـــە سیاســـەتی ولاّتـــە هاوپەیمانەکانـــداو ســـووربوونیان لەســـەر تێکشـــکاندنی .. یـــا دەمکوتکردنی دوژمن."

٢٨- حالــەتی چــوارەم.. کــە دەتــوانرێ تێیــدا پێشــبینی سەرکەوتن بکرێ ئەوەیە.. زیتەڵی و هوشیاریی دوژمن هێندە داهێزراو بێت.. لە چوستی و وریایی سوپاکەمان کەمتر بێت.

(چانگ-هاو) وتویێتی:

"ســوپاییێکی بــەهێزو تۆکمــە رێکخــەن و.. چــاوەڕوانبن تــا خــاڵی لاوازی نێــو بــەرگریی دوژمــن هەســتپێدەکەن.. ئــەوجا لێیــدەن ! سەرکەوتن هی خۆتانە."

(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:

"پشتبەســتن بــە رووکەشــەکانی هێــزە عەســکەرییێکان بەتــەنێ.. چ رووکەشــە رەســەنەکان و چ ســاختەکان.. هەڵــەییێکی گەورەیــە.. هێــزی راســـتەقینە پشـــت بـــە دوو فاکتـــەر دەبەســـتێ: خۆتـــەیارکردنی عەسکەریی و.. زیتـەڵیی لـە دەستنیشـانکردنی هـەردوو خـاڵی لاوازی و بەهێزیی لەنێو وزەو توانای دوژمندا."

٢٩- حالەتی پێنجەم: کە سەرکەوتنی عەسکەریی لێدەکەوێتەوە.. ئـازادیی هەڵسـوکەوتی سـەرکردایەتی سـوپایە لـە راپەڕانـدنی ئەرکـە عەســـکەرییێکانیدا -بـــەبێ لاقرتـــێ پێکردنـــی سیاســـیانە لەلایـــەن حکوومەتەوە- بەمەرجێ سەرکردایەتیی عەسکەریی هەست بە ئەرکە پیشەییێکانی ئەستۆی خۆی لە هونەرەکانی جەنگدا بکات.

(تۆ-یۆ) وتویێتی:

"لەمەڕ پێوەندیی سوپا بە سیاسەتی حکوومەتەوە.. لە مامۆستای کۆن (وانگ-هسی)یان پرسی.. وەڵامیدایەوە:

-ئەرکی سەرشانی حوکم ئەوەیە لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتی عەسکەریدای سەرکەوتوو بێت.. ئەرکی سەرکردایەتی عەسکەریش.. ئەوەیە لە هونەری جەنگدا لێزانبێت.. بۆ بەرگریی لە وڵات دژی دوژمنی دەرەکی.. یان دامرکاندنەوەو بەربەستکردنی دوژمن لە دوژمنکاریی و پەلاماردانەکانی .. یان رزگارکردن و پوختکردنەوەی ئەو شکۆمەندیانەی وڵات کە لەوەوبەر دەستدرێژیان کراوەتە سەر.. یان پووچەڵکردنەوەی ئەو مەرامە شەڕەنگێزیانەی دوژمن نەخشەیان بۆ دەڕێژێ.

بەڵام سیاسەتی خۆجێی حوکم و.. کاروباری ئاساییشی نێوخۆ.. ئەمانە ئەرکێکن بە هێزەکانی ئەمنی نێوخۆیی وەك پاسەوان و حەسحەس و پۆلیسی نێوخۆ سپێرراون.

ئەگەر سوپای نیزامی دەستی لە کێشە نێوخۆییەکانی وڵات وەردا.. کە کێشەگەلێکی سیاسین و.. بەزۆری پێوەندیان بە ململانێی خۆویستانەییەکانی نێوان تەمادارو هەڵپەکەرانی حوکمەوە هەیە.. دیارە ئەو دەستێوەردانە لەلایەن سوپای نیزامییەوە.. دەبێتە مایەی خولقاندنی دووبەرەکی و کێشەوگرفت و حیزخیزبێنەو گەندەڵیی.

ئەرکی سوپا.. داکۆکی و پارێزگارییە لە شکۆمەندی هەموو میللەت لەپێشدەمی دوژمنە بێگانەکانیدا.. نەك بۆ خڕکردنەوەی دەستەییێك لە میللەت.. بەسەر تاقمێکی دیدا.. چونکە سوپا لە گشت دەستەو تاقمەکانی نێو میللەتەکە پێکهاتووە."

هەروەها (وانگ-هسی) فەرموویەتی:

"ئەو حوکمەتەی بەتەنگ بەرژەوەندییەکانی نەتەوەوەو.. هەروەهاچاکی و پاکی حاکمی وەختیشەوەیە.. دەبێت ئەوە بزانێت چۆن کەسێتییە عەسکەرییەکان بۆ سەرکردایەتیکردنی سوپا.. لەسەر بنچینەکانی بەتوانایی و کارامەیی و بەهرەمەندییە عەسکەرییەکان – بەر لە هەر شتێکی دی–.. هەڵدەبژێرێت.

"کەسێتی عەسکەریی خاوەن بەهرەو تواناو.. جێمتمانە لە ئەرکی بەرگریدا.. زۆر بەتەنگ ئەوەوە دەبێ.. دیراسەی فیکری سیاسی.. وەك بەشێکی تەواوکەری رۆشنبیری و زانستە عەسکەرییەکان بکات.. تابزانێ سنووری ئەرکە سیاسییەکانی خۆی لە حکوومەتدا چەندە.

فیکری سیاسی لە کاری عەسکەری جیاوازەو.. جۆرێکی دی لە کەسێتی –نا عەسکەریانەی– پێویستە.

ئەگەر پیشەوەرانی کاری سیاسی.. دەستیان وەردایە ئەرکە عەسکەرییەکان.. یان بەپێچەوانەوە.. هەردوو نیزامی حکوومی و عەسکەر پێکەوە گەندەڵدەبن.

لە کاتی قەیرانەکاندا.. سەلامەتیی وڵات لەوەدایە.. هەردوو نیزامەکە هەریێکەیان بەپێی بەهرەو توانای خۆیان کاربکەن و.. بشزانن ئەرکی هەرلایێکیان چییە.

گرانترین و بەزەبرترین قەیران لە ژیانی میللەتدا کەشوهەوای جەنگە.. لەبەرئەوە پێویستە بەهرە عەسکەرییەکان لەگەڵ بەهرە

سیاسییەکاندا لە هەموو قۆناغی ئامادەباشییی و راپەڕاندنی جەنگدا ببنەییەك.. ئەم پێکەوەلکانە تەنیا بەوە دێتەدی.. لێبگەڕێن ئەرکە عەسکەرییەکان بەدەست ئەهلی کارەکە خۆییەوەبن و.. ئەرکە سیاسییەکانیش بۆ خاوەنەکانیان."

(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:

"جەنگ لە قۆناغی خۆتەیارکردن و قۆناغی شەڕو کوشتارداو.. پێبەپێی زانیاری و لێهاتوویی و هونەرە عەسکەرییەکان.. پێویستی بە سەد هەموارکردن و ئاڵوگۆڕکردن لە هەر هەنگاوێکدا هەیە.

ئەگەر وایان بەسەر سەرکردایەتی عەسکەریدا سەپاند.. ببێتە بارگیرێك و.. کەسانێك کە بەتەمای دەسەلاتن و چاویانبڕیوەتە شکۆی سیاسی.. لێیخوڕن .. وەزعەکە وایلێدێت زێتر لەوەبکات.. یێکێك ئەرکی ئاگرکوژاندنەوەی گرتبێتە ئەستۆی و.. لە هەمانکاتیشدا ناچاری راوێژو رێنمایی بێت.. یان بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە خۆی بەجێبەجێکردنی ئەو فەرمانە سەیرو سەمەرانەوە خەریکبکات.. کە لە سەرچاوەی نەشارەزاوە.. یان نامەسئوولەوە.. یان لەوانەوەی لەگەڵیدا نین بۆی هاتووە.

پێکداچوونی کارە سیاسییەکەو کارە عەسکەرییەکە.. لەو کەسە دەچێت بنیاتنانی شەقامێك دەگرێتە ئەستۆو.. دەسەلاتی نییە رێبواران لە بەکارهێنانی شەقامەکە بۆ هاتوچۆ لەکاتی ئیشکردندا قەدەغەبکات.. هاتوچۆکەرانیش نایانەوێت تا جادەکە تەواودەبێت و.. بەکەڵکی بەکارهێنانی هەمیشەیی دێت دانیەخۆیاندا بگرن.. ئالەم حاڵەتەدا بنیاتنانی شەقامەکە سەرناگرێت.

ئەگەر كۆت و پێوەندی وامان بەسەر سەركردەی عەسكەری كارامەدا فەرزكرد.. هیچ پێوەندییێكیان بە كاروباری عەسكەرییێوە نەبێ.. یان ئەو سەركردە عەسكەرییە.. ئەوەی بەخۆ رەوابینی.. ئەرك و فرمانێ لە ئەستۆ بگرێ.. لە بنەماكانی پیشەكەیداو ئەركە عەسكەرییێكانیدا نەبێ.. ئەمەیش لەكاتێكدا دوژمنی فێڵباز خۆی بۆ شەڕی وڵات ناوەتەوە.. ئەوا سەلامەتیی وڵات لەبەردەم فڕوفێڵی دوژمندا بەرگە ناگرێ و دەسەپاچەدەبێ.

لەم حاڵەتەدا.. پیاوە عەسكەرییێكە وەك ئەو راوچییەی لێدێت.. قەل و داڵ دەبینێ شالاوی بۆدێنن و.. ناتوانێ راویان بكات.. یان تەنانەت بەرگری لەخۆی بكات.. چونكە هەردوو دەستی بە گوریسی گران بەستراونەتەوەو.. تیروكەوانیش بە تەنیشتییێوە بێسوود كەوتووە..."

٣٠- ئا ئەم پێنج حاڵەتەن.. بەچاك و خراپ كاردەكەنە سەر هەل و دەرفەتەكانی سەركەوتنی عەسكەری.

٣١- لەبەر ئەمە دەڵێم:

"دوژمنەكەت بناسەو.. خۆیشت بناسە ! ئەگەر صەد جار چویتە جەنگەوە.. دەتوانی خۆڕاگرانە بەردەوام بمێنیتەوە."

٣٢- ئەگەر هیچی ئەوتۆت لەمەڕدوژمنەكەت نەزانی.. بەڵام لەمەڕخۆت هەمووشتێكت زانی.. شانگست لە سەركەوتن و بەزیندا.. هەروەك بەختی دوژمنەكەتە.

٢٣- ئەگەر لە كاروبارى دوژمن بێئاگاو.. لە كاروبارى تايبەتى خۆشتدا گێل و نەزان بووى.. بێگومانبە لە هەموو شەڕێكدا بەزين و فەوتبوون لە دەورو خولتن.

(لى- شوان) وتويێتى:

"ئەم تەرزە عەسكەرييانە.. بە -چەتە، رێگر- ناودەبرێن.. ئەوانە دەستەييێكن.. نە شەرەفى پيشە عەسكەرييێكە دەزانن و.. نە گوێ بە شەرمەزاريى شكست و بەزين دەدەن.

# بەشی چوارەم

## پێکهاتە عەسکەرییەکان[17]

---

[17]-. یان (قاڵبەکان).. یان بەو واتایانەی لە زمانی ئنگلیزیدا ئەم چەمکانەی بۆ دانراوە:

"Shape", "Form", Desposition", "Formation"

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- لە دێر زەمانەوە.. هەر جەنگاوەرە پاڵەوانەکان بوون.. هێزو کارامەیی و بەرگریی و بوێریان دەنایەبەر کایەو وزەکانی جەنگەوەو.. چاوەڕوانی ئەوەیاندەکرد.. درزو قوپاوی بکەوێتە نێو هەندێك لە ریزەکانی دوژمنەوە.. تا لەوێوە لێیدەن.

٢- بەرگەگرتن -مەناعە-ی عەسکەریی.. بەر لە هەر شتێ پابەندی هێزوتوانایی خۆییەو.. هەروەها زانینی قەبارەی هێزو توانای دوژمنیشە.

٣- بەم پێیە.. کارامەیی لە ئامادەباشیی عەسکەریدا ئەوەیە.. توانای بەرگەگرتن و ورەو تۆکمەیی بخەیتە نێو هێزەکانتەوە..

(مای-یاو-چان) وتوێتی:

"بەر لە هەموو شتێك.. ئەوەی لە ئۆردووگەکەمدا لیێ بەرپرسیارم ئەوەدەکەمو.. بەتەواوی جەخت لەوە دەکەم کە بە دڵنیاییەوە گشت پێداویستییێکانیم بۆی جێبەجێکردووە.

بەڵام ئەرکەکانی من لە بواری دوژمن بەزاندندا.. ئەوە پەیوەستە بە گەلێ شتەوە.. ناتوانم بەتەواوی لێیان دڵنیابم."

(یێکەمین و گرینگترین ئامادەباشیی.. ئامادەباشیی خودییە.)

٤- لەبەرئەمە.. وتوویانە: "پیاوی عەسکەریی لە توانایدا هەیە بزانێ رێگەی سەرکەوتن چۆنە.. وەلێ نەزانێ چۆن بەدەستیدێنێ!؟"

٥- بەرگەگرتنی عەسکەریی لەوەدایە چەندە توانای بەرگریکردنت هەیە.. بەڵام سەرکەوتنی عەسکەریی پشت بە تواناکانی هێرشبردن دەبەستێ.

٦- کاتێ وزەو تواناکانی سوپا ناتەواوبن.. ناچارەو دەبێ لە حاڵەتی بەرگریدابێ.. کاتێ وزەو تواناکانی کۆکبوون.. سوپا خەریکی هێرشبردن دەبێ.

٧- شارەزایانی هونەری (بەرگریکردن).. خۆقایمکردنەکانی سوپای بەرگریکەر -هەروەکو گەنجینەییێك لەژێر زەویدا بێ- دەشارنەوە.

شارەزایانی هونەری (هێرشبردن).. زێتر لە باڵندەی گۆشتخۆر دەچن.. لە ئاسمانەوە شاڵاودێنن[18].. کەواتە هێرشبردن بەتواناییت لە دوو سەرەوە لێدەخوازێ .. سەرەتا خۆپاراستن‌و.. ئەوجا ئەزێتی دوژمندان‌و.. لە هەمانکاتیشدا سەرکەوتن بەسەریدا.

(تۆ-یۆ) وتویێتی:

---

[18]-. چەمکی (ئاسمان) لای چینییە کۆنەکان بە (تەبەقە) هاتووە.. وەك چۆن لای خۆمان دەڵێین "حەوت تەبەقەی ئاسمان.. ئەو ئێماژەیەش لە هونەری جەنگدا.. واتای (هێرشبردن)ەو.. سوپا بە باڵندە دەنووك چەماوەکان دەچوێنێ.. چۆن لە ئاسمانەوە دەنیشنە سەر نێچیر.. ئەو توانایەیە لە شەلومەرجی جەنگدا.. لە پلەییێکەوە بۆ پلەییێکی بەرزتر یان بەهێزتر سەردەکەوێت.

"شارەزایانی چالاکییەکانی (بەرگریی) عەسکەریی.. بە دیاردە سروشتییەکان‌و.. ناوچە ستراتیژییە سەخت‌و پارێزراوەکان پشتقایمن.. (وەك چیاو روبارو نواڵەکان).. یان بە خۆقایمکردنە دەستکردەکان بۆ بەربەستی دوژمن.. تا لە هێرشەکەیدا سەرنەکەوێ.

بەڵام شارەزایانی (هێرشبردن) لە پرۆسەکانی جەنگدا.. بەزۆری پشت بە مەوسیمەکانی کەشوهەواو.. تەبیعەتی زەوی‌و جێگەی لەبار بۆ هێرشبردن دەبەستن.. یاخود بە هەراسانکردن‌و بەکێشکردنی دوژمن‌و.. هێنانی بۆ ناوچەگەلێکی (جوگرافی) وا.. خەسڵەتەکانی بۆ سوپای هێرشبەر لەبارو پەسەندتربێ.

٨- ئەو پیاوە عەسکەرییەی.. بە هەمان چاوو پێوەرو سۆزی کەسێکی ناعەسکەریی دەڕوانێتە رێی سەرکەوتن (چ ئاسان یان سەخت).. پیاوێکە هیچ لە ئەرکەکانی جەنگ نازانێ.

لە تێڕوانین‌و پیشەو ئەرك‌و رەفتاری عەسکەریدا پێڕەوی چەند خەسڵەتێ دەکرێ.. خەڵکی ئاسایی گوێی پێنادەن.

(لی-شوان) وتویەتی:

"کاتێ سەرکردەی وڵاتی (هانچین).. تێکشکاندنی سوپای دوژمنی لە ویلایەتی (چاو)دا گرتەئەستێ.. بە سەربازەکانی وت:

"با دوژمن لەنێوبەرین ئەوجا نانی بەیانی دەخۆین."

ئەفسەرو سەربازەکان ئەم بڕیارەیان پێپەسەند نەبوو.. وەلێ وا خۆیان نیشاندا.. پێخۆشحاڵن پێی.

سەرکردە وا سوپاکەی ڕێکخست.. ڕوبارەکە بکەوێتە پشتیانەوە.. هەموو بەلەمەکانی سووتاندو.. پردەکانیشی ڕووخاند[١٩].

خەڵکی پایتەختە گەمارۆدراوەکە.. پێکەنینیان بەم تەگبیرو ڕەفتارەی ئەو سەرکردەیەی ئابلووقەی داون هاتو.. پێیان دەوت:

"تۆ گەوجیو.. نازانی بە شێوەیێکی دروست سەرباز بۆ شەڕ بەڕێخەیت.. سکیان برسیو پشتیان بۆ کشانەوە بەستراو.. ئەگەر بەزین.. ڕێی دەربازبوونیان نییە.. ئیدی چۆن چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکەی خۆیان بەکوشت بدەن!؟

سەرکردەی هێزە هێرشبەرەکە وەڵامی نەدانەوەو.. لێگەڕا سەربازەکانی گاڵتەپێکردنو هەڕەشەکانی دوژمن ببیسن.

فەرمانی هێرشی بە سەربازەکانی دا.. گیانفیدایانە جەنگانو لەکورتترین ماوەدا پایتەختی دوژمنیان داگیرکردو..توانیان بەر لە نانی نیوەڕۆ.. نانی بەیانی بخۆن."

ئەمە نموونەیێکە لەسەر جۆری ئەرکو بەرپرسیارێتیو.. جۆری ئەو بیرکردنەوەیەی لە خەسڵەتەکانی پیاوی عەسکەریی کارامەدایە.. ڕەشە خەڵك هەرگیز ناتوانن پەی بە قازانجو مەغزاکەی بەرن.

٩- جیاوازی زۆر لەنێوان سەرکردەی شارەزاو بەتواناداو.. سەرکردەی شانگسداردا هەیە.. ئەگەر سەرکردەی عەسکەریی شانگسدار.. لە شەڕێکدا دوژمنەکەی پێکاو بردییەوە.. بەو

---

[١٩]- دیارە.. (تاریقی کوڕی زیاد).. لە هێرشەکەیدا بۆسەر ئیسپانیا.. پێڕەوو لاسایی ئەم سەرکردە چینیەی کردۆتەوە.

سەرکەوتنەی لە بەخت و شانگسەوە بەدەستدێت نابێتە پێوەرێك بۆ لێهاتوویی سەرکردەی براوە.. یان پاکانەییێك بێت بۆئەوەی سەرکردایەتی هەڵمەتی عەسکەریی دیکەی پێبسپێریت.. ئەگەر ئەمجۆرە سەرکردانە مەرجەکانی کارامەیی و زانیاری و دانایی پێویستیان تێدا نەبوو.

١٠- لای پیاوە دێرینەکان..وا باوبوو.. سەرکەوتنە عەسکەرییە ئاسانەکەیان بەسەر دوژمندا.. دەکردە پێوەری کارامەیی و لێهاتوویی لەو سەرکردایەتییەدا کە ئەو سەرکەوتنەی بەدەسهێناوە.

بێگومان هۆکارەکانی ئەم بەئاسانی سەرکەوتنە.. دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وردیی رەنج و.. بڵندو بەرزیی ئاستی کارامەیی و.. دروستیی ئامادەباشیی و قووڵیی فیکرو.. دووربینیی و لێهاتوویی پیشەیی و.. نەخشەکانی راپەڕاندن.. کە نەوەی پێشینانی سەرکردەو یاوەرە شارەزاو راوێژکارانی هەڵمەتبردنە ئاسانەکە دایاننناون.

١١- شەرگەلێکی سەرکەوتوو هەن.. سەرکردەی عەسکەریی بەخێرایی و ئاسانی بەدەستیهێناون.. وەلێ ئەمجۆرە سەرکەوتنانە لای خەڵکیی.. خەسڵەتەکانی دانایی و کارامەیی و لێهاتوویی و جوامێریی نابەخشنە سەرکردەکە.

**(مۆ-تۆ) وتوێتی:**

"زوربەی خەڵکیی پەی بەوە نابەن.. چۆن لە هەندێ حاڵەتدا سەرکەوتن بەر لە دەسپێکی شەڕ بەدیدێت.

لەبەرئەوە سەرکردەی سەرکەوتووی وا.. لەلایەن خەڵکە ساویلکەکەوە.. ستایشی زۆرزانیی و کارامەیی و جوامێری و دانایی

ناكرێن.. چونكە ئەمجۆرە سەركردەیە.. گوایە دەمی شمشێرەكەی خڵتانی خوێن نەكردووە!.. تاكو دوژمن ناچاری بەزین بكات و.. كڕنووش بۆ ویست و ئیرادەی بەرێت."

(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:

"خەڵكی سادە وایدادەنێن.. جەنگ بەتەنێ خوێنڕشتنە."

١٢- سەركردەی نایاب.. ئەو كەسەیە بەبێئەوەی بكەوێتە هەڵەوە.. سەركەوتن بەدەستبێنێ.. ئەمە مانای وایە.. هەر لە سەرەتاوە ڕاپەڕاندنی هەر هەنگاوێ لە هەنگاوەكانی مسۆگەركردووە.. ئەمەیش بە حەلاڵكردنی ئۆردووگەی دوژمن دادەنرێت و.. بۆی هەیە تەڕاتێنی تێدا بكات و.. سەركەوتن بەدەسبێنێ.

(چانگ-هاو) وتویێتی:

"لە دانانی نەخشەی شەڕدا.. تا دەتوانی ئەو ڕەنج و ئەركانەی بێسوودن كەمیانبكەرەوە.. هیچ هەڵسوكەوتێكی بێسوود مەكە.. هیچ هەنگاوێكی ستراتیژی ناپێویست مەنێ..."

١٣- لەبەر ئەمە سەركردەی وریا ئەوەیە هەڵوێستەكانی خۆی بەجۆرێك دابیندەكات.. هیچ كەلەبەرێك بۆ دوژمنان ناهێڵێتەوە پێیدا بۆی بێن.. هەموو هەلێكیش بۆ سەپاندنی نەخشەكانی بەسەر دوژمندا دەقۆزێتەوە.

١٤- سوپای زاڵ ئەوەیە شەڕەكان دەباتەوەو.. متمانەی بە خۆیەتی و.. لەمەیشدا پشت بەو ئامادەباشییە وردو هەمەلایەنییە

پێشـوەختەی خـۆی دەبەسـتێت.. بـەجۆرێکی وا بـەر لـە دەسـپێکردنی شەڕ.. فیکرییەن بەسەر دوژمنەکەیدا سەردەکەوێت.

ئەو سوپایەش کە بەتەمای سـەرکەوتنەو.. لـەپێناوی سـەرکەوتندا دەجـەنگێ –دەبـێ نـەك تـەنیا لـەپێناوی شـکۆمەندیدا.. یـان لـەپێناوی دوورخسـتنەوەی بـەڵاو ئـازاری دوژمنـدا– بـەڵکو بـۆ تێکشـکاندن و.. ئەگەر تـوانراش بۆ لـەنێوبردن و ریشەکێشـکردنی ئێجگـارەکی هەرچـی دڕندەیی دوژمن هەیە بجەنگێ.

ئەم ئەرکە پێویستی بە بەرفراوانیی کۆشش و خۆ ماندووکردنە لـە بیرکردنــەوەداو.. ئامادەباشـیی نەخشـەی پێشـوەخت بـۆ کاروبـاری بەرگری و کاروبـاری هێرشبردەکە پێویسـتە.. ئەمـەیش بە دووربینـی و زۆرزاانییێوە.. نەك بە پەلەپڕووزیێ و سەرپێیی.

**(مۆ-تۆ) وتویەتی:**

"مـیری ویلایـەتی (وای) پێیوایـە.. بـەرزترین پایـەی عەسـکەریی ئەوەمانەیە:

* بـــەرفراوانیی بیرکردنـــەوەو پێشچـــاوڕوونی و.. هاوشـــانی و چونییێکیی گوزەران لەنێو سەرکردەو سەربازدا.

* زۆرزانیی (ستراتیژی)یانەی قووڵ.

* نەخشەی دووربینانە.

* ئاگاداربوونی باری کەشوهەواو.. تەبیعەتی زەوی (جوگرافی).

* لە سەروبەندی شەڕە خوێناوییێکاندا.. بتـوانێ لـە هۆکـارو بنـەما مرۆڤایەتییێکان تێبگات.

"لەبەرئەوە ئەو سەركردەيەی متمانەی ساختەی بەخۆی هەيەو.. لە خەملاندنی توانای خۆیو هێزی سوپاكەیداو.. هەروەها وزەو توانای وڵاتەكەیو.. هی دوژمنەكەشیدا هەڵەدەكاتو.. نازانیٚ چۆن لە هەقیقەتەكان تێبگاتو.. نە هاوگونجاندنو نەرمونیانی دەزانیٚو.. نە چالاكی ئەندێشەو خەیاڵی شكدەباتو.. نە توانای ئەنجامگیری بە باشی هەیە.. هەلە رەخساوەكان پشتگوێدەخاتو.. دوودڵیو دڵەڕاوكیٚ دایدەگریٚو.. لە سەختترین ساتە نالەبارەكانداو.. لەو كاتانەی پێویستییان بە عەزمو ورەو توندوتۆڵی هەیە گومان دایدەگریٚو دۆشدادەمێنیٚ.. ئەو سەركردەیە هەرگیز ناتوانیٚ زامنی هیچ سەركەوتنێك بكات.. یان نەخشەیێكی دروست بۆ سەركەوتن بەسەر دوژمندا دابڕێژێت.

" سەركردەی لەمجۆرە.. لەوانەیە هەرچی هەواڵو راپۆرتێكی پێدەگات.. بەبێئەوەی بەباشی بچێتە بنجو بناوانیان.. بەڕاستیان دەزانیٚو.. بڕوایان پێدەكات.. یاخود هەواڵی راستو دروست رەتدەكاتەوەو بڕوای پێناكات.. چونكە بیركرنەوەی سەقامگیر نییەو.. تووشی راڕایی دەروونیی هاتووەو.. هۆشو گۆشی پتەو نییە.. یاخود چونكە هەر لە بنەڕەتدا خاوەنی عەزمو بڕواو تۆكمەیی بڕیار نییە.

"هەوڵدەدات لە تەبیعەتە زیانەخەرۆیی و چەپەڵییكەدا.. وەك رێوی فێڵباز بێت.. وەڵیٚ زیانەخەرۆیی و چەپەڵی و لەبنەوەبڕی شتێكەو.. جیاوازە لەو زۆرزانییەی پشت بە زانیاریو ئەزموونی كەسێتیو توانای زاتی دەبەستێت.. ئەمجۆرە سەركردەیە.. بەبیٚ هۆی پێویست

هێزی سوپاکەی پەرش و بڵاودەکاتەوە.. گوایە تەڵەکەبازییەکەی وای گەرەکە.. گەرچی دانایی و ئەسوولی بەرپرسیاریێتی و پێداویستەکانی شەڕو هونەرەکانی جەنگ و.. بلیمەتیی (ستراتیژی) پێچەوانەی ئەوەی ئەو دەخوازن.

"چ جیاوازییێك لەنێوان ئەم سەرکردە گەوج و گاڵتەجاڕەو.. ئەو شوانە گەمژەیەدا هەیە کە رانەکەی بە گاو گۆلکەوە بەرەو مەنزڵگەی گورگ و پڵینگان وەپێش خۆی دەخات ؟!

١٥- پیشەو هونەری جەنگ لەوەدا نییە یاسا ئاسمانییێکان تێکبشکێنێت.. یان چەپەڵی بەسەر زەویدا پەخشکەیتەوە.. یاخود ملی خەڵکی بخەیتەبەر چەقۆکەت.. جا ئیدی (ملی بەر چەقۆیە) ملی سەربازانی ئەو هێزە چەکدارە بن سەرکردەکە خۆی سەرەوکاریانە .. یان خەڵکانی بێچەك و بێدیفاعبن.. لەوانەی پارێزگاریکردنیانی لە ئەستۆدایە.

تەنانەت جەنگیش یاسا و عورف و ڕێسای خۆی هەیە.. مەبەستە عەسکەرییێکانی جەنگ بۆ پاراستنی نیزام و یاسایە.. نەك بۆ پێشێلکردنیان.

ئەو سوپایەی.. هێزو سەربازەکانی هەڵگری بەها ویژدانی و مرۆڤایەتییێکان نین و.. دەربەستی ئەو شتانە نین کە بە یاسا و ڕێسا حەڵاڵ و حەرامکراون.. ئەو سوپایە زووبێ یان درەنگ.. خۆی شکستخواردوو دەکات.. وێڕای ئەوەی لەملا سەرگەوتنیێ و لەولا دەسکەوتێکیشی بۆ خۆی بەدەسهێنابێ.

١٦- پیشەی شەڕی عەسکەریی.. پیشەییێکی وەحشیانە نییە.. لە کوشتوبڕ بەولاوە چیدی نەزانیٚ.. بەڵکو قوربانیدانێکی تاك و کۆیەو.. بە مەبەستی پاراستنی ڕێساکان و دابینکردنی ئاسایش و یاسا.

لەبەر ئەوە.. بنەماکانی هونەری جەنگ پشت بە کوشتن و بڕین نابەستیٚ.. بەڵکو پشت بە بنچینەکانی بەسەلیقەیی و.. زیان کەمیدا.. بۆئەوەی سوپا لە کورتترین کاتداو بەکەمترین زیان مافەکانی نەتەوە وەدەسخاتەوە.

ئەم پێنج خاڵە بنچینەییانی لێرەدا پوختکراونەتەوە.. لە ئوسووڵەکانی هونەری جەنگدان:

یێکەم: دیاریکردنی پانتایی نەبەردی شەڕ.

دووەم: خەملاندنی پێداویستییێکانی هێزە چەکدارەکان بۆ ئەنجامدانی شەڕەکە.

سێیەم: هەوڵدانێکی ورد بۆ زانینی ئەوپەڕی دەسکەوتەکانی سوپای جەنگاوەرو.. ئەوپەڕی زیانەکانیشی.

چوارەم: بەراوردکردنی ئەمانەش بەودەسکەوت و زیانانەی دوژمن.. کە دەشیٚ بۆخۆیان وەدەستیانخەن.. یا لێیانکەویٚ.

پێنجەم: سەرڕاستیی و ئەمانەتی پێشینەیی.. لە دەسنیشانکردنی بوارەکانی سەرکەوتن.. یان بوارەکانی شکاندا.

١٧- وەلیٚ دیاریکردنی پانتایی نەبەرد.. پێویستی بە تاوتوێکردنی تەبیعەتی ئەو زەوییەیە کە شەڕەکان لەسەری ڕوودەدەن.

١٨- خەملاندنی پێداویستییەکانی هێزە چەکدارەکانیش.. بە پرۆسەی کۆکردنەوەو لێدەرکردن و بنەمای کارامەیی عەسکەریی دەبێت.. نەك بەپێی خواست و ئارەزووی سەرکردە خۆی و.. بێ هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان.. یان بەراوردکردنی بەوانەی لە شەڕەکانی ڕابوردودا روویانداوە.. ئەمانە هەموویان پێویستییان بە کولتووری عەسکەریی هەیە -نەك بەتەنێ ئازایەتی یا توندوتۆڵی یان عینادیکردن.. یان خۆ بەناز فرۆشتنی هەندێ سەرکردە.

(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:

"کاتێ لەمەڕ -تەبیعەتی زەوی- دەتۆژینەوە.. دەبێ دوو خاڵ رەچاوبکەین.. جۆر (جوگرافیا)ی نەبەرد (مەیدانی شەڕ)ەکەو.. دووریی میانەی لە بنکەی سەرەکی سوپای هێرشبەر.. یان سوپای بەرگریکەرەوە

لە هەردوو حاڵەتدا.. سوپا ناچارە حسابێکی ورد بۆ جۆرەها تەنگژەو گرفت.. یان ئاسانکارییە جوگرافیاییەکان لە خاکی دوژمندا بکات (ئەگەر هەڵمەتە عەسکەرییەکە بۆ هێرشبردن بوو).. یان هەمان حساب لە خاکی نیشتماندا بکات (ئەگەر هەڵمەتە عەسکەرییەکە بۆ بەرگریکردن بوو).

ئەمە زانیاری زۆر وردی گەرەکە.. لەمەڕ ڕێگەوبان و چیا و دۆڵ و سەرچاوەکانی ئاو -بە بوون و نەبوونیانەوە- .. هەروەها لەمەڕ گیاو لەوەڕ بۆ ئەسپ.. یان ئاژەڵە بارهەڵگرەکانی دی.. کە بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکانی سەربازەکان بەکاردەهێنرێن.

هەروەها ئەمە پێویستی بە وەدەسهێنانی زانیاریی وردو تەواوە سەبارەت بە وزەو تواناکانی دوژمن لە هەر قۆناغێك لە قۆناغیکانی شەڕداو.. زانینی ئاستی وڕەو رەوایی شەڕەکەیان و.. ئاستی زۆریو کەمیی و بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی ئازووخەو تفاقیان لە هەر وەرچەرخانێکی شەڕەکەداو.. بەر لە دەسپێکی و لە گەرمەی شەڕیشدا.

هەروەها زانینی ئاستەکانی ورە لەنێو ریزەکانی سوپای نەتەوەیی خۆیشیدا کە بەرامبەر بە دوژمن دەجەنگێ.

بەبێ ئەم زیتەڵییە بەردەوامە.. هیچ سوودێك لەو سەرکردایەتیەدا نابینرێ.. کە ساختەکارانە پشت بە خۆی دەبەستێو.. پشت بە هونەرەکانی جەنگو پێداویستییە وردو بەردەوامەکانی زانستیی لەمەڕ هەموو ئەم وەزعو ئاڵوگۆڕانە نابەستێ.

١٩- مەسەلەکە قەبەیی سوپاکەو زۆریی ژمارەی پیاوەکاندا نییە.. ئەگەر سەرکردایەتیو سەربازەکان لە هونەری شەڕ بەباشیی نەزانن.. قەبەییو زۆریی سوپا هیچ واتاییك نابەخشێ.. بگرە لەوانەیە بشبێتە بارگرانی بەسەر سوپاوە.

٢٠- پلەو پایەی کەسێتی سەرکردە.. بە -شۆرەتو ناوبانگەکەی یان بە دەسەڵاتو نفووزەکەی- ناپێورێت.. بەڵکو بە کارامەیی عەسکەریی دەپێورێت.

جەنگ کەسێتی بەلاوە گرینگ نییە.. بەڵکو زانینی پێویستەو.. دەبێ سەرکردایەتیدا لە هەوڵو کۆششی بەردەوامدا بێت بۆ

هەڵسەنگاندنی هەموو چرکەساتێك لە چرکەساتەکانی هەڵوێستە عەسکەرییێکە.

دەشێ سوپاکە خاوەنی بەهێزترین ئازووخەو تفاق بێت و.. لەژێر رکێفی سەرکردەییێکی بەناوبانگیشدا بێت.. وەلێ گەوجێتی و لەخۆباییبوون سواری سەری ئەو سەرکردەیە ببێت و..خۆی بە (خودا)ییێکی گچکە دانێت.. بەڵام خودای گەورە هەقیقەتەکان باشتر دەزانێت.

لەبەرئەوە ئەو سەرکردەیەی فیزدارەو.. بەدووی زانین ناکەوێ.. بەر تۆڵەی خودای ئاسمان دەکەوێت و.. سوپاو نەتەوەکەشی دەخاتە بەر نەفرەتە جۆراوجۆرەکانی خودا.. بەپێچەوانەیشەوە.. ئەوەی بێفیزەو بەدووی زانین دەکەوێ.. شکۆمەندیی و سەرکەوتن بۆ خۆی و سوپاو نەتەوەکەی بەدەستدێنێت.

لە جەنگدا هێزی سروشتیش هەیە.. وەك ئاو لە روبارو دەریاکاندا.. ئاو بە هێزی ئاسمان.. لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی.. بە چاڵ و چۆڵی و پێچ و پەناکاندا دەڕوات.. تا دەگاتە ئاوڕێژگەی خۆی لە نشێوییێکی سروشتیی لەباردا کۆدەبێتەوە.

( چانگ-یو ) فەرموویەتی:

"سروشتی ئاو لە خوارەوە بەرەو ژوور نابێتەوە.. بەڵکو بەپێچەوانەوە لەسەرەوە بەرەو خوار دەبێتەوە.

ئەگەر بەنداو –سەد– لەبەردەم ئاوەڕۆکەیدا هەڵبەستریّ و.. هیچ دەرفەتێکی وای نەدرێت تا بە نێو ئاوەڕۆکە سروشتییێکەی خۆیدا.. بەرەو ئاوڕێژگەی کۆتایی دەربازبێ.. ئەوا ئەمجۆرە بەنداوانە..

مانگێك.. وەرزێك.. یان ساڵێك بەرگە دەگرن و.. ئیدی توانای خۆڕاگریی ئەم بەنداوانە کزدەبیٚ و.. ناتوانیٚ ئەو هەموو ئاوە لەنێو خۆیدا رابگریٚ و.. بەنداوە گەورەکە لەبەریدا هەرەسدێنیٚ و دادەڕمیٚ و.. ئاوەکە بە تەوژم دەردەپەڕیٚ و.. کێڵگەو مەزرا رادەماڵیٚ و خەڵکی دەکوژیٚ.. هیچ کەسێکیش ناتوانیٚ بەر بە تین و تەوژمی بگریٚ.

هونەرەکانی جەنگیش هەر ئاوەهایە.. پێکەم ئەرکیٚ کە دەیخاتە ئەستۆی سوپادا ئەوەیە.. دەبیٚ سوپا رێبازی سروشتیی بەجیٚ بگرێتەبەر.. بڕژێتە نێو ئەو پێچاوپێچە ئاسانانەی لەگەڵ تەبیعەتی زەوییێکەدا دەگونجیٚ.. دەشیٚ شەڕەکان وا بخوازن دیوارو بەربەست لە پێناوی بەرگریکردندا هەڵبەسترێن.. یان هێز (ئاو)ەکە لە جێیێکدا کۆبکرێتەوە –پەنگبخواتەوە– (وەك ئاوی نێو بەنداو).. لەپێناوی هێرشبردندا.. تا لەنکاو بەربدرێنە سەر هێزەکانی دوژمن و.. بەهێزێکی ئەوتۆ رایانماڵن و تەختیان بکەن.. دوژمن بۆی نەکریٚ بەریان پێبگریٚ..–بە وێنەی تەوژمی ئاوێکی هەڵچوو و دەرپەڕیو لە بەنداوێکی لەنکاو داڕماوەوە.. کە لە پشتەوەی چەندین عەماراوی هێجگار گەورەو فراوان ئاویان تێدا بەرز بووبێتەوە.

گشت ئەمانە.. زۆرزانی و دانایی و کات دیاریکردنی دروستیان گەرەکەو.. هەروەهاش پێویستیان بە چاوبەستکردنی دوژمن هەیە.. تا ئەو ئامادەباشییەی لەودیو بەربەستە عەسکەرییێکانەوە چێکراوە.. نەیبینیٚ.

# بەشی پێنجەم

## وزەی عەسکەریی [20]

---

[20]- واتـــای (وزەی عەســـکەری) لێـــرەدا ئەمانـــە دەگرێتـــەوە: (توانـــای عەسکەریو.. هێزو تینی عەسکەریو.. هەڵوێستی عەسکەری).

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- گرتنە ئەستۆی کاروباری ژمارەییێکی زۆری خەڵکی (یان سەربان).. جیاوازی نییە لە گرتنە ئەستۆی (یان بەڕێوەبردنی) ژمارەییێکی کەمی خەڵك (یان سەربان).. لە هەردوو حاڵەتدا دەبێ بەتەنگ ڕێکخستنەوە بین.

(چانگ-یو) وتوێتی:

"یێکەمین شتێ ئەرکەکانی هەڵمەتی عەسکەری دەیسەپێنێ.. دیاریکردنی ئەرك‌و بەرپرسیاریێتییێکانی سەرکردەکان‌و یاریدەدەرەکانیانە.. ئەوجا دیاریکردنی هێزو وزە سەربازییێکان لە پلەو پایە جۆراوجۆرەکان.

"لە پرۆسە عەسکەرییە کۆنەکاندا.. ئەم تەرتیبەی خوارەوە باوبوو:

سەرباز تاکێکە -چەکێکی دیاریکراوی پێیەو.. کارێکی دیاریکراویشی لە ئەستۆیە.

تاك لەگەڵ تاکدا دەبنە جووت.. چەکی دیاریکراویان پێیەو.. کاری دیاریکراویشیان هەیە.. جووت لەگەڵ تاکی سێیەمدا.. دەبنە سیانەو.. ئەم سیانەیەش ئیشی تایبەتییان هەیە.. سیانەش لەگەڵ جووتێکدا دەبنە یێکە -وەحدە-یێکی جەنگاوەرو.. هێزێکی تایبەتیشی هەیە.

هەر پێنج یێکە کە هەر یێکەیان لە پێنج تاك (کەس) پێکهاتوون.. دەبنە فەصیلێك سەربازو.. تایبەتمەندیی خۆیشی هەیە.

هەر دوو فەصیلیش.. وەحدەیێکی جەنگاوەر پێکدێنێت.. کە لە وزەو تواناو ئەرکەکانیدا جیاوازە لەهی وەحدە عەسکەرییێکانی دیو.. بەمجۆرەو بەدوای یێکدا تا دەگاتە پێکهاتەی گشتیی هێزی سوپا.

هەر یێکەیێکی عەسکەری وەبان ئەوی پێشووی دەکەوێ.. لەڕووی هێزو شێوەی ئەرکەکانو ژمارەی سەربازەکانەوەو.. شێوازی مەشقدادانو.. پرۆسەی شەڕو هونەرە جەنگییێکانی دیکەشەوە.

گرینگ نییە سوپا گەورەو گران بێت.. بەڵکو وردبیێ لە ڕێکخستنو کار دابەشکردن بەسەر هێزە —وەحدە— جۆراوجۆرەکانیدا.

ئەرکی سەرکردایەتییێکان لەنێو گشت ئەم هێزە عەسکەرییە (بچووك.. گەورە.. گەورەتر)انەدا ئەوەیە.. هەر ئەرکێ لە ئەرکەکانی مەشقو بەکارهێنانی چەكو.. ڕۆڵی ئەو هێزە لە تەواوی هەرەمی هێزە عەسکەرییێکەدا چییە.. هەمووی بۆ هەڵدەسووڕێنێ.

کارامەیی عەسکەرییو.. شێوازی ئەرکەکانی.. بەپێی زۆریو کەمی ناگۆڕێن.. ئەگەر سوپا لە هەزار سەرباز.. یا دەهەزار.. یان سەدهەزار پێکهاتبێ.. ئەرکەکان هەر هەمان ئەرکن.

٢—ئەوەی کەمایەتییێك لەسەر بنچینەی ڕێکخستنێکی دروست رادەهێنێو مەشقدادەدات.. دەتوانێ لەسەر هەمان بناغەش زۆرینەییێك رابێنێ.

کێشەکە کێشەی وردبینییە لە ناردنی ئیشارەتدا یان ڕێکخستنیدا بەپێی پێویستییێکانی جموجوڵە عەسکەرییێکە.. لەکاتی مەشقدا بێ یان کاتی شەڕ.

**( چانگ-يو ) وتويّتی:**

"..له ئۆردووگه عەسكەرييّكاندا.. هيّزەكانی سوپا.. ليّرەو لەویّ.. دوور له يێكدی پەرشوبلاو دەبنەوە.. نه چاویّ هەيه هەموو شتیّ ببينیّو.. نه گوێيه هەموو شت ببيسیّو.. هيچ شتيّكيش نييه پێكيانەوە ببەستيّتەوە.. يان ريّكيان بخاتەوە!

ئەمه له تەبيعەتی شتەكاندا مەحالّه.

چونكه ئەوەی به يێكديانەوە دەبەستيّتەوەو.. هيّزە گشتييّكه ريّكدەخاتەوە .. بريتييه لەو ئيشارەتانەو.. ئەو واتاو فەرمانانەی ئيشارەتەكان دەيانبەخشن.. ئەوانەی له كەرەناكان (شەيپوورەكان)ی شەرەوە دەبيسريّن و[21] .. بۆ هيّرشبردن.. يان كشانەوە ليّدەدريّن و دەبيستريّن و.. لەلايەن هيّزە جۆراوجۆرەكانی نيّو ريّخستنه عەسكەرييّكانەوە لەسەری پێكهاتوون.

ئەم دابينكردن و كار ريّكخستنه.. وا له جەنگاوەری جوامێر ناكات.. هەر لەبەر ئەوەی جەنگەكه قورانيدانی گەرەكه.. ئيدی نەخشه عەسكەرييّكانی تيّكبدات.. هەر وەكو وا له ترسنۆكيش ناكات پاشگەز

---

[21] – بيّگومان لەم سەردەمەدا.. ئاميّرو هۆكاری گەلیّ گەشەسەندوو سەردەمانەی ئەوتۆ هاتۆته ئاراوە.. كه پيّوەندييّكانی نيوان هيّزه پەرشبووەكانی نەبەردەكانی جەنگ.. به بينين و بيستنەوه ئاساندەكەن.. وەك كاميّرای بەمانگه دەسكردەكانەوه بەستراوو.. مۆباييل و.. تەنانەت ئاميّره ساكارەكانی دی له بواری پەيوەندیو راگەياندندا.. وەك: برووسكەو دەزگەی هۆكی_تۆكی و هتد.

بێتەوە.. چونگە هەردوكیان بەو ئیشارەتە عەسكەریانەوە پانەندن.. هەروەها بە فەرمانو.. بە هێزە گشتییێكەشەوە.. بۆ هەموو هێزە بڵاوەكانی سوپاو.. ئەركەكانی هەر هێزێك لەوانە دەسنیشان دەكات.. چ لەنێو جەرگەی شەڕدابن.. یان لە حاڵەتی ئامادەباشیدابن بۆ شەڕو پێكدادان.

٣- لە حاڵەتەكانی بەرگریكردن لەبەدەمی هێرشی دوژمندا.. بەنموونە.. سوپای بەرگریكەر دەتوانێ بەسەر هێزی دوژمندا سەربكەوێ.. بە جەختكردنی لەسەر خۆڕاگریی و.. بەهۆی كارامەیی سەركردایەتی لە دابەشكردنی ئەركە جیاوازەكان بەسەر هێزەكانی سوپای بەرگریكەردا.. لەنێوان هێزە (ئاساییێكان)و.. هێزە (تایبەتمەندەكان)دا.[٢٢]

**(لی-شوان) وتوێتی:**

"ئەو هێزە عەسكەرییانەی رووبەڕوو لەسەر هێڵی تەماس بەرەنگاری دوژمن دەبنەوە.. هێزی ئاسایی "نۆرمال"ن.

---

[٢٢]- ئێماژەدان بە هێزە ئاسایی (نۆرماڵ)ەكانو.. هێزە تایبەتمەند (سووپەر)ەكان.. لەلایەن دانەری نوسراوی (هونەری جەنگ)ەوە.. بۆ دوو مەبەستە.. یێكێكیان بۆ جیاوازیكردن لەنێوان هێزە شالاوبەرە بروسكئاساكان (مەغاویرو صاعیقە)و.. هێزەكانی دیكەدا.. دووەمیشیان بۆ جیاكردنەوەی ئەو هێزانەی چەكی قورسیان پێیەو.. ئەوانەی هەڵگری چەكی سووكن.

"ئـەو هێـزە عەسـەرییانەیش ئـەرکی لێـدانی دوژمـن لـە هـەردوو باڵــەکان.. یــان لەپشــتەوەیان لــە ئەســتۆدایە.. ئەوانــە هێــزە (تایبەتمەند)ەکانن."

**(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:**

"یێکێ لە بنەماکانی کارامەیی و زۆرزانیی عەسکەریانە ئەوەیە.. دوژمنەکەت وا لێبکەیت وابزانێ هێزە عەسکەرییە (نۆرماڵ)ەکانت.. هێزە (تایبەتمەند)ەکانەو.. هەروەها بەپێچەوانەیشەوە.. هەر راستە."

٤- هـەروەها بـە کارامـەیی عەسـکەریی دادانرێـت.. سـەرکردە بـە ئەنقەسـت بـەهێزترین هێزەکـانی بکاتـە سـەر لاوازتـرین هێزەکـانی دوژمن.. هەروەك چۆن چەکوش بە هێلکەدا دەدرێ.

**(تساو-تساو) وتوویەتی:**

"بـەهێزترینی ئـەوەی هەتـە بیگـرەرە لاوازتریـنـی ئـەوەی دوژمـن هەیـەتی.. یـان لاوازتـرین خـاڵ لـە ئۆردووگـەی دوژمنـدا.. لـە رووی ئێشـکگری و زیتـەڵیی جموجـۆڵی عەسـکەرییێوە.. بـەهێزترین چـەکێ هەتـە.. دژی لاوازتـرین چـەکێ دوژمـن هەیـەتی.. لـە کـاتی نائاگـایی و نائامادەییـدا بەکاربێنــە.. وێـڕای ئــەوەی چــەکی دوژمنەکــەت کــە لێیـدەدەی.. لـە چـەکەکانت زۆرتریشـبن.. وەلێ لـەنکاو لێدانەکـە هێـزو چەك زۆرییێکەی تێکدەشکێنێ و.. جموجووڵی ئفلیجدەکات."

٥- لــە پرۆســە عەســکەرییێکاندا وا بــاوە.. هێــزە عەســکەرییە (نۆرمـاڵ)ەکـان.. بـەرەو پێکدادانـە گشـتییێکانی دوژمـن بـەڕێبخرێ و.. هێزە (تاییبەتمەند)ەکانیش..لە سەرەتادا بۆ پەرتپـەرتکردنی هێزەکـانی دوژمن بەکاربهێنرێ.. تا دواجار بەتەواوی قڕیان تێدەخات.

٦- بەهرەی سەرکردەی عەسکەریی لێرەدایە.. چۆن بتوانیّ بەباشی سوود لە وزەو توانای هێزە (تایبەتمەندەکان) وەربگرێت.. ئەوان هێزگەلێکی گەورەو گرانن.. ئەگەر لە کاتو ساتی لەباردا بەباشی بخرێنەکار.. ئیدی بە وێنەی روبارێکی گەورە.. هەرچەنیّ بە پێچو پەناکانی زەویدا بڕوات.. بە راستو چەپو سەروو خوارەوودا.. ئەوا هیچ بەربەستێك ناتوانیّ خۆی لەبەر شالاَوو تەوژمەکەیدا بگرێت.

٧- بەتوانایی هێزە عەسکەرییە (تایبەتمەنددکان) لە هەڵسوکەوتیاندا.. ئێجگار گەورەیە.. ئەگەر بەباشی مەشق دابدرێنو.. بە پەسەندیش لەلایەن سەرکردایەتییەوە بەکاربهێنرێن.. ئەوا ئەوانە دەتوانن مۆجیزە بخولقێنن.

٨- ئەم هێزە عەسکەرییە (تایبەتمەند)انە.. وەك نۆتەی مۆسیقایان لێدێت.. ئەو نۆتەیەی لە تەنیا پێنج کێش.. یان پێنج پلەی مۆزیکی پێکهاتووە.. وەلیّ دەتوانیت هێندە ئاوازو سروودی جۆراوجۆریان لیّ پێکبێنی لە ژمارە نەیەن.

٩- ئەم هێزە (تایبەتمەندانە).. لەو رەنگە بنچینەییانە دەچن کە هەموو رەنگەکانی دیکەیان لێدروستدەبن.. ئەم رەنگانە لە بنچینەدا تەنها پێنج رەنگی سەرەکین.. (سپی.. رەش.. سەوز.. سوور.. زەرد).. وەلیّ ئەگەر بەباشی تێکەلاَوت کردن.. ئەوا رەنگامەیێکی جۆراوجۆری لە ئەژماردن نەهاتووی رەنگەکانی لێدەردەهێنیت.

١٠- بەمجۆرە لە جەنگە عەسکەرییێکانیشدا.. بنچینە سەرەکییێکانی هێزی عەسکەریی.. تەنها لە دوو توخمی سەرەکی پێکدێن.. هێزە (نۆرماڵەکان)و هێزە (تایبەتمەندەکان).. دەتوانیت لەم

دوو توخمـــه.. قاڵـــب و شـــێوازو هێـــزی ئاوێتـــەبووی ئەوپـــەڕی جۆراوجۆریان لێدروستبکەیت.

١١- ئەو دوو توخمە سەرەکییە.. هێزە ئاسایی (نۆرماڵ)ەکان و.. هێـــزە تایبەتمەنـــد(ســـووپەر)ەکـــان.. هـــەر یێکـــەیان ئەویـــدی تەواودەکەن و.. لە هاوئاهەنگی و هاوبەرپرسێتیدا.. هێزو توانایێکی لەبن نەهاتوو لەخۆدەگرن.. بەوێنەی ئەو ئەڵقە ئاسنینانەی لەنێو تۆڕە توندوتۆڵەکاندا هەن.. کە لە توانای کەسدا نییە بزانێ.. بەهێزیی تۆڕەکە لەکوێوە دەستپێدەکاو.. کام ئەڵقانەی لەوانی دی تۆکمەترن!.

١٢- ئـاوی بەتـــەوژم دەرچـــوو.. هەرچـــی دێتـــەڕێ رایـــدەماڵێ.. هێزەکەی هێزێکی هوروژماوی (بەتەوژم)ە.

١٣- قەڵۆو داڵەکان.. کاتێ دەنیشنە سەر نێچیرەکانیان.. شالاو بردنـــەکیان لەوپـــەڕی بەهێزیـــدا دەبێـــت.. ئـــەویش کـــاتێ باڵنـــدە گۆشـــتخۆرەکە "کات وســـاتێکی لـــەبار هەڵبـــژێرێ بـــۆ لـــەنێوبردنی نێچیرەکەی.

**(تۆ-یۆ) وتوێتی:**

"بەوپـــەڕی دەســـتوبردەوە لـــە دوژمنەکـــەت بـــدە ! وەك داڵ چـــۆن دەنیشـێتە سەر نێچیرەکەی.. بە جۆرێك پشتی دەشکێنێ.. ئەگەر بەشێکیشـــی بەزینـــدوێتی مابێتـــەوە.. ئـــەوا توانـــای دەربـــازبوون و جووڵەی تیا نامێنێ.

هەڵۆکان لە هەموو هەڵسوکەوتێکیانداو..کاتێ هەڵدەکوتنە سەر نێچیر.. وردبینانە ئانوساتەکان دەخەملێنن.

١٤- بەمجۆرە سەركردەی زرنگ و چالاك ئەوەیە.. دەزانێ هێزی بەتەوژمی هورووژمبەر چییەو.. پرۆسەی خەملاندنی ئانوساتەكانیش چێدەكات.

١٥- وزەو توانای بەتەوژم.. لەو دەست و بازووە دەچێ تیرو ژێی كەوانەكەی توند بەرەودوا راكێشاوەو.. ئامادەباشی تێگرتن و پێكانە.. كات و سات خەملاندنیش.. بریتییە لە دەستڕەنگینی نیشانەلێگتنەوە لە چركەساتی لەبارو پێویستدا.

١٦- لە گەرمەی شەڕدا.. وا دەزانرێ هەموو شتەكان وەك لەنێو ئاژاوەو بێسەرو بەریدابن وایە.. وەلێ ئەو شەڕانەی سەركەوتن وەدەسدێنن.. ئەوانەن لەنێو بۆتەی ئەو ئاژاوەو پشێویانەی گەرمەی شەڕدا.. بنەماكانی رێكخستن و نیزام دەزانن و پێڕەویاندەكەن.

(لی-شوان) وتوێتی:

"دیاردەكانی ئاژاوە لە گەرمەی شەڕدا.. لە راستیدا ئەنجامی رێكخستنە عەسكەرییە پێشوەختەكەی جەنگە.

ئیشارەتە عەسكەرییێكان و.. فەرمان و راگەیاندن و شەیپوورەكان و.. گشت ئێماژەو هێماكانی دیش.. كە لە سەروبەندی جەنگدا.. رێنماییێكان بۆ هێزە جەنگاوەرەكان دەگوێزنەوە.. هەموو ئەمانە لە ئەنجامی ئەو چێكردنە عەسكەرییە وردو قایمانەیە.. كە خەڵكی دی بە ئاژاوەو پشێوییێكی بێسەروبەری دادەنێن.

١٧- لە سەرەتای شەڕە سەركەوتووكاندا.. وا دەردەكەوێت ئاژاوەیان تێكەوتووەو.. ترسنۆكیی تێیاندا وەبان جوامێریی كەوتووەو.. لاوازیش وەسەر بەهێزیدا زاڵە..

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"ئـەوەی وای لەخەیاڵدایـەو.. دەخـوازێ ئـاژاوە لـەنێو ریزەکـانی سوپای دوژمنـدا بخاتـەوە.. پێشـەکی پێویستە لەسـەری زۆر بە وردی بزانـێ چـۆن ئـەو رێکخسـتنە دابینـدەکات.. بـۆ خولقانـدنی ئـەمجۆرە ئاژاوەیە.

ئـــەو جـــوامێرەی بـــۆ هەڵفریوانـــدنی دوژمـــن خـــۆی ترســـنۆك نیشـاندەدا..تـا خاووخلیچـکیبکاتەوە.. ئـەوە بەڕاسـتی جـوامێرێکی رەسەنە.

ئـــەو ســـەرکردەیەش بـــۆ هەڵخڵەتانـــدنی دوژمـــن خـــۆی لاواز نیشـاندەدا.. دەبێسـەرکردەییێك بـێ لەوپـەڕی توانـاو ئامادەباشـیدا بێ..."

١٨- بوون و نـەبوونی ئاژاوە لـە پێکدادانەدانـدا.. لەسـەر سـەلیقەو وردبینی و تۆکمەیی لەنێو رێکخراوە عەسکەرییێکەدا وەستاوە.

ئـازایی و ترسـنۆکیی لــە شــەڕەکاندا لەســەر هەلومــەرج و رووداوە کتوپڕەکــان وەســتاون.. بــەهێزیی و لاوازیــی عەســکەریش لەســەر پێکهاتەکانی وزەو توانای هێزە چەکدارەکان.. هـەروەها لەسـەر پوخـت هەڵبژاردنی مەوقیعی شەڕەکان وەستاون.

(لی-شوان) وتویێتی:

"لــە ســەروبەندی شــەڕدا.. کــاتێ بــۆ هێــزە عەســکەرییێکان هەڵدەکەوێ.. لەو شوێنانەدا خۆیان داکوتن کە بۆ بەرگـەگرتن لـەبارن.. یـان خەسـڵەتە عەسـکەرییە پەسـەندەکانیان لـەخۆ گرتـووە.. ئیـدی لەوێدا ترسنۆك دەبێتە جوامێر.

ئەگـەر ئـەو شـوێنە سـتراتیژیانە بـزر بـوون.. زۆر پێدەچـێ ئـازا بسڵەمێتەوە.

لە هونـەری جەنگدا یاساگەلێکی تایبـەت بە ئازایی و ترسنۆکیی نییە.. گیانبەخشیی پابەندی توندوتیژیی گرفت و قەیرانەکانە."

١٩- زرنگیـی لـە هونـەری جەنگـدا ئەوەیـە.. وا لـە دوژمـن بکـەی چۆنت بوێ وا بجووڵێتـەوە.. بەرەو ئـەو شوێنانەشـی کێشبکەی.. کە زێتر لـە مەوقیعـەکانی پێشـووی دوژمـن تایبەتمەنـدیی پەسـەندتری بۆحۆت تێدایە.

دوژمـن هەڵدەفریوێنی.. یـان دەمـاری دەگریـت.. باشـیش دەزانیـت ئـــەو هەڵفریواندنـــەکانی پێباشـــەو.. رووبـــەپووی ورووژانـــدن و دەمارگرتنـەکانت دەبێتـەوە.. ئیـدی ئەگـەر دوای بـەو هەڵفریوانـدن و ورووژاندنـەی ئاراسـتەیت کردبـوو.. هاتـە مەیـدانت.. مـەرج ئەوەیـە تۆیش زۆر بە چاکی شێوازەکانی هەڵکوتانەسەر دوژمـن و تـەختکردنی بزانی.

٢٠- کەواتـە سـەرکردەی دانـاو بزورگـی عەسـکەریی ئەوەیـە.. دەزانێـت چـۆن سـوود لـە خەسـڵەتەکانی شـوێنەکان و.. بارودۆخـەکان بەباشـی وەردەگرێـت.. یـاخود شـوێن و بـارودۆخی شـیاو بۆخـۆی دەخولقێنیێ.. نەوەك هـەر بەتـەنێ پشـت بە وزەو توانـای سـەربازەکانی ژێر فەرماندەیی خۆی ببەستێت.

(چانگ-هاو) وتویّتی:

"شارەزایانی شەڕی عەسکەریانە.. پشت بە هەلە رەخساوەکان دەبەستن و.. هەروەها بە دروستکردنی ئەو هەلانەش لەلایەن خۆیانەوە.. نەك هەرچی ئەرك هەیە بیخەنە سەرشانی تەنیا سەربازو ئەفسەران."

٢١- پێویستە سەرکردە بزانێ چۆن مەوقیعەکان و هەلومەرجەکان هەڵدەبژێرێ و.. ئەرکەکان دابەشدەکات.. ئەوجا لێدەگەڕێ سەربازو ئەفسەرەکان بۆخۆیان ئەو هەلومەرج و جێگەو ڕێگانە بە جوانترین شێوە بەکاربێنن.

"بەمجۆرە.. بەهرەی سەرکردە یا ئەفسەر یاخود سەرباز بەفیڕۆ ناچێ.. بەڵکو هەموویان بە هاوئاهەنگیی لەپێناوی سەرکەوتندا هاریکاریی دەکەن."

(مۆ-تۆ) فەرموویەتی:

"چاوەڕوانیی شکۆمەندیی لەوانەی بەهرەیان نییە.. مەکە!"

کاتێ(تساو)ی سەرکردە.. لە شەڕی (هان-شۆنگ)دا.. ئەرکی بەرەنگاریکردنی (تانگ)ی دوژمنی گرتە ئەستۆ.. لێگەڕا هەندێ لە ئەفسەرەکانی سەرەوکاریی هەزار سەرباز بکەن.. بۆ پارێزگاریکردنی بنکەکەی خۆی لە (هۆفی)دا.

(تساو)ی سەرکردە.. پەیامی نوسراوی بۆ گەورە ئەفسەری بەرگریکاران لە بنکەکە نارد.. لەسەر بەرگی فەرماننامەکە نووسیبووی:

"تا دوای هێرشی یاخیبوان بۆ سەرتان ئەم نامەیە هەڵمەپچڕە"

هێنـــدەی نـــەخایان.. ســـوپای یـــاخیبوان بـــە صـــەدهەزار جەنگاوەرەوەهاتن و.. بنکەی (هۆفی)یان ئابلۆوقە دا.

گـــەورە ئەفســـەری بـــەرگریکاران لـــە بنکەکـــە.. فەرماننامەکـــەی کردەوە.. رێنماییێکانی خوێندەوە.. سەرکردە تێیدا فەرمانی دابوو.. با فلان ئەفسەرو فیسار ئەفسەر.. لەوانەی لە بەرگریکردنی بنکەکەدا بەشدارن.. ئەرکی سەرەوکاریکردنی فلان هێز.. یان فیسار هێزی عەسکەریی بگرنە ئەستۆ.

وەلێ فەرمانەکانی سەرکردە –لەنامەکەدا– جەخت لەوە دەکەن.. گەورە ئەفسەر خۆی (ئەوەی ئەم فەرماننامەیەی وەرگرتووە) بۆخۆی بەشداریی لە شەڕەکەدا نەکات !

یێکێ لە ئەفسەرەکان بە گەورە ئەفسەری بەرپرس لەپاراستنی ئۆردووگەکەی وت:

"دیارە ئاغای سەرکردە لێمان دوورە.. هیچیش لەمەڕ هەلومەرجی ئێرۆکانێ نازانێ.. ئەگەر دەستەوسان چاوەڕوانی شالاوی یاخیبوان بـــۆ ســـەرمان بکـــەین.. وەك جـــەنابی ســـەرکردە پێمانـــدەڵێ چاوەڕوانبکەین.. ئەوا هێزی گەورەو گرانی یاخیبوان دەمانهاڕن.. پێمباشە ئێمە لە هێرش بۆسەر یاخیبوان دەسپێشخەریی بکەین.. تـــاکو بتـــوانین هـــەردوو رەگـــەزی کـــاتگیریو غـــافڵگیری وەدەســـت خۆمانخەین.. چونکە ئێمە بە ژمارەو بە تفاق لەوان کەمترین.. وا پەسەندتریشە.. لەبریی چاوەڕوانیکردن لێرەدا.. هەوڵبدەین شەڕەکە لە دەوروبەری شوورەکە دوورخەینەوە.. تا دوژمن بەو هێزە گەورەو گرانەیەوە لێرەدا راومان نەکات.

گـــەورە ئەفســـەری بنکەکـــە.. بـــەم بیرۆکەیـــە قـــایلبوو.. هێـــزە عەسـکەرییێکان بـۆ روبەڕووبوونـەوەی سـوپای یـاخیبوان نێـرران.. چـەندین شکسـتیان بەسـەر دوژمنـدا هێنـا.. ورەی سـەربازانی بنکەکـە بەرزبۆوەو.. توانیـان لـە رووی دوورخسـتنەوەی ئازارو زیانەخـەرۆیی سـوپای یاخیبوانـەوە سـەرکەوتووبن.. وێـڕای ئـەو شـەڕەی لەسـەر شـوورەکان کـرانو دە رۆژی خایانـد.. یـاخیبوان نـەیانتوانی بنکەکـە بگرن.

مێژوونووسی دێرین (سۆن-شانگ) تێبینی خۆی بەتایبەتی لەمەڕ ئەم رووداوە جەنگییە خستەڕوو وتی:

جـەنگ فێڵـە.. لـەم شـەڕە عەسـکەرییەدا.. خۆقایمکردنـەکانی بنکـە گەمارۆدراوەکە لەبەردەم پلارەکـانی قەدەردا چارەنووس نادیـاربوون.. هـەزار سـەرباز بنکەکـەی دەپاراسـتو.. صـەدهەزار سـەربازی سـوپای یاخیبوانیش خۆیان بۆ ناونەتەوە.

ئەگەر موقـەدەراتی بـەرکریکردنی بنکەکـەت دایەدەسـت سـەربازانی ئـەم سـوپا بـەژمارە کەمـەو..جـوامێریی سـەرکردەکەی.. بەرامبـەر نـەیارێکی بـە ژمـارە زۆر.. ئـەوا ئـەم ئازایـەتیو جوامێرییـە بەتـەنێ دادیان نادات.

دەشـێ ئەفسـەرو سـەربازە ئازاکـان هەنـدێ سـەرکەوتنی شەخسـی بەدەسـبێنن.. وەڵێ نـاتوانرێ سـەرکەوتنی تـەواو بەسـەر دوژمنێکـی بەهێزو بەژمارە زۆریش بەدەسبهێنرێت.

خـۆ ئەگـەر لێگـەڕایت موقـەدەراتی بـەرگریی لـە بنکەکـە بـەلای ئەفسـەرو سـەربازە وریاکانـەوە بێـت.. ئـەم وریاییـە ئەگـەر کارامـەییو

زۆرزانیـی عەسـکەریی بـۆ دوورخسـتنەوەی کارەسـاتەکەی لەگەڵـدا نەبێت.. ئەوا لە وریاییێکی ترسنۆکانە زێتر هیچی دی نابیٰ.

کەواتە ئەوەی گچکە ئەفسەرەکە بۆ گەورە ئەفسەری پێشنیارکرد.. ئـەوە بـوو بـووە مایـەی سـەرکەوتن.. چـونکە دووربینیـی و زرنگیـی و زۆرزانییێکـی سـتراتیژیانەی تێـدابوو.. بەتایبـەتی لـەوەدا.. بەرلـەوەی دوژمـن بگاتـە سـەر شـوورەکانی قـەڵا.. لـەنکاو بـۆ رووخانـدنی ورەو.. لەتوپـەتکردنی لە چەند قوڵێکەوە.. بە جۆرێك نیشتنە سەری.. دواتـر نـەیتوانی بگاتـە بنکەکـە.. هـەر ئـەم پێشنیارەبوو بـووە مایـەی ئـەوەی دەرفـەتێکی بـاش ببەخشـێتە قـەڵاو سـەربازە بەرگریکـەرەکانی.. بـۆ گیانفیدایی و بەرگریی لە خۆیان.

( چانگ-لی ) فەرموویەتی :

"بۆئـەوەی هێـزی عەسـکەریی بەباشـیی بـەکاربێنیت.. -جـا وزەو توانای ئەو هێزە بە ژمارەو تفاق هەرچەندێك بێت-.. ئـەوەی پێویستە بیکـەیت ئەوەیـە.. دەرفـەت بـۆ هـەموو بـەهرەدارێك بڕەخسـێنی بەهرەکـەی بنـوێنیٰ..ئەمـە مانـای بەکارخسـتنی کەسـانی زرنـگ و گەمژەشـە لـەنێو سـەربازو ئەفسـەراندا.. هـەروەها بـوێرو کـەم جورئـەتیش.. دەبـیٰ هـەر هێزێـك و هـەر کەسـێك.. دەرفـەتی ئـەوەی بدەیتیٰ بە گوێرەی تاقەت و توانای خۆی بەشداریی بکات.

ئـەرکی وا مەخـەرە ئەسـتۆی سـەربازو ئەفسـەران لـە تواناکانیـاندا نـەبێت و هیچیشـی لێنـەزانن و.. ئامادەباشیشـیان بـۆ راپەڕانـدی – بەشێوەییێکی پەسەند– تێدا نەبێت.

٢٢- ئەو سەركردە.. یان ئەو ئەفسەرە عەسكەرییەی دەزانیٚ چۆن سوود لە هێزی عەسكەریی وەردەگریٚ.. دەبیٚ یێكەم شت ئەوەش بزانیٚ.. چۆن بەباشیی مەوقیعەكان و پیاوەكانیشی هەڵدەبژێریٚ.. هەروەك چۆن بیناساز.. بەردو دار بۆ بەنداو دروستكردن و قەلاٚ دامەزراندن بەكاردێنیٚ.

تەبیعەتی بەرد وایە.. دەستوبرد لەسەر زەوی جێگیردەبیٚ و بەرگەی مانەوەش دەگریٚ.. وەلیٚ ئەگەر زەوییێكە لێژ بوو.. هەر بە نووكە شەقیٚ بەردەكە خلۆردەبێتەوە.

ئەگەر بەردەكان بە قەوارەی ئەندازەیی هەموار دروستكرابوون.. ئەوە زێتر بەرگە دەگرن و دەمێننەوە..بەردی چوارگۆشەیی .. بۆ بەرگە گرتن باشترە.. ئەگەر خڕبێت.. هەر شتێكی بەركەوێت زۆر بە ئاشانی خلۆر دەبێتەوە.

پیاوانیش هەر بەوجۆرە.. ئەگەر بە پێی ئەندازەییێكی باش مەشقپێكراوبن و.. سەركردەیش جیٚ وڕێی باش و لەباری بۆ هەڵبژاردن.. ئەوا دەبنە پیاوانێكی سەنگین و بەرگریكەر.

٢٣- كەواتە هێزی عەسكەریی سوپا.. لەژێر فەرماندەییێكی زرنگدا.. وەك بەرد پتەوو بەهێز دەبێت.. ئەگەر هەڵوێستەكەش وای خواست.. لە جێی خۆیدا بمێنێتەوەو بەرگەشبگرێت.. دەتوانیٚ واشبێت.. ئەگەر هەلومەرج و شوێنەكە وابوو.. سەربازەكان بە خێرایی شالاٚو بۆ دوژمن بەرن.. ئەوا وەك بەردی خڕو لووسیان لێدیٚ و.. هەر بە كەمترین فشارو پالٚ.. بەتوندی لەسەر چیاوە هارەدەكەن.

( مۆ-تۆ ) فەرموویەتی:

"لەو حاڵەتەدا -مەبەست لە نموونەی (بەرد)ەکەیە- سەرکردە پێویستی بە هیچ نییە جگە لە پاڵێکی گچکە نەبێت.. تا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەسبێنێ."

( لی-شینگ )یش فەرموویەتی:

"لە جەنگدا سێ هەلۆیست هەن:

یێکێ لەوانە ئەوەیە.. سەرکردەی سوپا لاقرتێ بە دوژمن بکات و.. ئەفسەرو سەربازانی ژێر فەرماندەیی ئەو سەرکردەیە.. بە دڵ و گیان و ورەییێکی بەرزەوە حەزیان لە شەڕبێت و.. لە ئەرکە عەسکەرییێکاندا ئومێدو ئاواتەکانیان هێند بەرزو باڵابن سەر لە هەوربدەن و.. وزەو تواناشیان چوون هەرەبروسکەو گەردەلوول بێ.

ئەم هەلۆیستە لە رووی ورە بەرزییەوە.. جوانترین هەلۆیستە.

دووەمین هەلۆیستی جەنگی.. ئەوەیە سەرکردە خۆی بە تاکە پیاوێکی تەنیا بچوێنێ کە بەرگریی لە توولەڕێییێکی شاخاوی دەکات.. لە ریخۆڵەی بەرخ دەچێت.. لەولایشەوە هەزار پیاوی دوژمن بەرامبەر ئەم تاکە پیاوە وەستاون.

لەمجۆرە هەلۆیستەدا.. دەشێ خۆقایمکردنەکانی پیاوە تەنیاکە بۆ ماوەییێکی درێژ بەردوامبێت و بەرگەبگرێت و.. سەریشبکەوێت.

ئەمەش جوانترین هەلۆیستێکە لەمەڕ تەبیعەتی زەوی و.. پێوەندیی ئەم تەبیعەتە بە (هێز)ی عەسکەرییێوە.

سێیەم هەلۆیستی جەنگیی ئەوەیە.. فرسەت لە خاووخلیچکیی.. گوێپێنەدانی.. لەشداهێزرانی نێو ریزەکانی سوپای دوژمن ببینی.

یان لەو کاتەی دوژمن شەکەتەو..خۆراكو ئاوو زوربەی تفاقیشی نەماوە.

یان کاتیٚ ئامادەباشییو جموجوولە عەسکەرییەکانی.. بەتەواوی قایمو جیٚگیر نەبوون.. یا هیٚشتا نەچوٚتە نیٚو مەوقیعەکانی هیٚرشبردنەوە.

یاخود هیٚشتا نیوەی سوپاکەی لە روبار یا جوٚگەکە نەپەڕیوەتەوە.

ئەمانە هەلومەرجی لەبارنو.. دەشیٚ.. یان بیٚگومان دەتوانریٚ دوژمنیان تیٚدا تەختکریٚ.. بەمەرجیٚ سەرکردایەتی بەباشی هەڵویٚستەکە هەڵسەنگیٚنیٚ.. ئەمەیش وەك لە جەنگدا باوە.. پیٚیدەوتریٚ: ئاستی (هیٚز بەلای دوژمنەوە).

کەواتە گەورەو گرانیی سوپا و.. زۆروزەبەنەیی ئازووخە.. لە بەکارهیٚنانی (هیٚز)ی عەسکەریدا مەرج نین.. بەڵکو سوودوەرگرتن لە هەلومەرج و بەباشی بەکارهیٚنانی پیاوان.. کاتیٚ وەك بەردی سافو لووسی سەر لوتکەی شاخیان لیٚدیٚت.. سەرکردە پیٚویستی بە هیچ نابیٚ جگە لە پاڵیٚکی بچووك نەبیٚت.. تا هیٚزیٚکی هیٚجگار مەزن بخاتەگەڕو.. وەك هەورە بروسکە بیٚتە خواریٚو.. هەرچی بیٚتەڕیٚی تیٚکیشکیٚنیٚ.

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- کێشەکە بەگشتیی وەهایە.. ئەوەی بەر لە دوژمنەکەی بگاتە شەڕگە -مەیانی جەنگ-.. دەرفەتی لەبارو باشتری هەیە بۆئەوەی بەر لە گەیشتنی دوژمن.. هێزەکەی کۆکاتەوەو خۆی تەیاربکاتو.. دوژمنیش بەرلەوە سوپاکەی بۆ شەڕو پێکدادان ئامادەکردبێت. ناچار بکات بۆئەوەی بێتە نێو شەڕەکەوە.

٢- کەواتە.. کارامەیی سەرکردەیی ئەوەیە.. دوژمنەکەت رابکێشیتە ئەو شەڕگەیەوە کە خۆت هەڵتبژاردووە.. نەك لێگەڕێیت دوژمن کێشتبکاتە ئەو شەڕگەیەی خۆی هەڵیدەبژێرێ.

٣- بۆئەوەی دوژمن هەڵفریوێنی تا بە حوسنو رەزای خۆی بێتە ئەو شەڕگەیەی هەڵتبژاردووە.. ئەمەیش پێویستی بەوەیە هەندێ دانی بۆڕۆکەیت.. هەندێ شتی تایبەتمەندی وای بۆ برەخسێنی وابزانێ بۆخۆی باشە.

بۆئەوەی نەیەڵیت دوژمن بگاتە ئەو شەڕگەیەی بەخۆی هەڵیدەبژێرێت.. ئازارو گرفتی وای بۆ دروستبکەی.. نەتوانێ بەو مەبەستە شادبێ.

(مۆ-تۆ) وتویەتی:

"ئەگەر توانیت رێگەی هاتوچۆی (ستراتیژیی) دوژمن لە خاکەکەی خۆیدا ببڕیت.. بەوە پەکی جموجووڵی دەخەیتو.. نایەڵیت شەڕگەی لەبارو شیاو بۆخۆی هەڵبژێرێ."

لەبەرئەوە مامۆستای گەورە (وانگ) فەرموویەتی:

"ئەگەر تاکە پشیلەیێك.. بەردەرکی کونە مشکێکی گرت.. ئەگەر ئەو کونە دەهەزار مشکیشی تێدابێت.. شتاقیان ناوێرن لە کون بێنەدەر.

ئەگەر تاکە پڵینگێك ئەو سەرەڕێیەی گرت کە بەزۆری ئاسکانی پێدا تێدەپەڕێن.. ئەگەر ژمارەی ئاسکەکان دەهەزاریش بن.. ئەو تاکە پڵینگە بەتەنێ خۆی ئەو ڕێیەیان لێحەرام دەکات.

٤- ئەگەر دوژمن لە ئیسراحەت و حەوانەوەدا بوو.. هەوڵدە کێشەو گێچەڵی ئەوتۆی بۆ بنێیتەوە ئیسراحەتی لێ تاڵبکەیت.

٥- هەوڵبدە لەنکاو لەو شوێنانەدا لێیبدەیت کە چاوەڕوانی ئەوەیان لێناکات لێیان بدرێت.

با هێندەیش بەدەستوبردو بەکردوبزانانە بێت.. دوژمن ئەو جۆرە هەڵسوکەوتەی لێ چاوەڕوان نەکردبیت.

٦- بۆ ئەوەی بتوانیت هەزار میل ببڕیت.. بێئەوەی هێزە چەکدارەکانت شەکەت بکەیت.. دەبێ ئەو تووڵەڕێیانە هەڵبژێریت.. کە هێزەکانی دوژمنیان تێدا نین.. یان دەرفەتی ئەوەیان بۆ نارەخسێ لە کاتی ئەم ڕێوڕۆشتنەتاندا لەگەڵتاندا بەشەڕبێت.

(تساو-تساو) فەرموویەتی:

"بڕۆ ئەو بۆشاییانە پڕکەرەوە کە دوژمن پڕی نەکردوونەتەوە.. بەردەوام ملی ئەو ڕێگەیانە بگرە کە قەڵاو ئۆردووی دوژمنیان تێدا نین.. لەو ڕیگەوبانانە خۆت بەدووربگرە کە دوژمن پارێزگاریان

لێدەکات.. لەپڕ لەو شوێنانەدا سەر دەربێنەو.. هێرشبەرە سەر دوژمن.. کە چاوەڕوانی ئەوەت لێناکات."

٧- بۆئەوەی بە خێرایی گرتنی ئەو ناوچە سوودمەندانە -ستراتیژیانە- مسۆگەر بکەیت.. ئەو خێراییە ئەوەت بەسەردا دەسەپێنێ.. لەو شوێنانەدا لە دوژمن بدەیت هێشتا بەباشی خۆی تێیاندا قایم نەکردووە.. یاخود.. خۆقایمکردنەکانی لەڕووی پارێزگاری لەخۆکردن و پاسەوانییێوە لاوازن.

بۆئەوەی توانای بەرگریکردن و.. بەدەستەوەمانەوەی ئەو ناوچانەش مسۆگەر بکەیت.. پێویستە لەو مەڵبەندانەدا خۆت جێگیربکەیت دوژمن نەتوانێ بە ئاسانی پێیان بگات.

ئەم پرەنسیپە سادەو ئاسانانە.. ئەوانەن پێویستە لە یێکەم هەنگاوی شەڕەوەو.. لە هەموو قۆناغەکانی دواتریشدا پێڕەوبکرێن.

٨- ئەو سوپایەی پرەنسیپەکانی هێرشبردن دەزانێت.. هەوڵدەدات شیرازەی جموجووڵی دوژمن تێکبدات.. ئیدی دوژمن نە دەزانێ خاڵی لاوازی خۆی کامەیە.. تا پارێزگاریی لێبکات و.. نە دەزانێ ئەو خاڵە بەهێزانەی دوژمنەکەی کامانەن.. بەهۆیانەوە توانیوێتی پێگەی خۆی بە توندی داکوتێ.

ئەو سوپایەی بە وریایی و بەکردوبزانییێوە هەڵوێستی بەرگریکردنی عەسکەریانەی خۆی رادەگرێ.. دوژمن لە دۆزینەوەو هەڵبژاردنی خاڵی لاوازی نێو ئۆردووگەی ئەم سوپا بەرگریکەرە.. چەواشە دەبێ.

٩- شـارەزاو لێزانـی هونـەرەکانی جـەنگ ئەوکەسـەیە.. ..

هەرچەندێ هێزە عەسکەرییێکەی گەورەو تفاقی زۆرو گرانیش بێت.. هیچ جێپێ و شوێنەوارێك لەپاش خۆیو جموجوولە عەسکەرییێکانی جێنـاهێڵێ.. بـە جـۆرێکیش بـۆ هێرشـبردن دەکەوێتـە جوولـەو.. بـۆ بـەرگریش سـەقامگیردەبێ.. لـە هـەردوو حاڵەتـدا هـەراوزەنای وا نەخاتەوە دوژمن پێی بزانێ و بیدۆزێتەوە.

( هۆ-یان- تسی ) فەرموویەتی:

"هەمیشـە هەوڵـەدەم دوژمـن تـەنیا خاڵـە بـەهێزەکانی سـوپاکەم ببینـێ.. نـەك خـاڵی لاواز.. تەنانـەت بـە ئەنقەسـت هەوڵـەدەم.. ئـەو لاوازییەی لە سوپاکەمدا هەیە.. وابزانێ ئەوە بەهێزییە نەك لاوازیی.

هەوڵیشـدەدەم.. هێـزی دوژمـن لاواز بنـوێنێ.. لـە لاوازتـرین قـۆڵ و کـەمترین پاسـەوانداریی دەدەم.. تـا بـڕواو متمانـە بـەخۆبوونی لێبشێوێنم.

هەوڵـەدەم هێرشـەکانم بـەجۆرێ نهێنـی بـن.. دوژمـن هـەر لەسـەرەتاوە و بەئاسـانی نـەتوانێ پـەی بـەوە ببـات.. داخـوا ئـەم هێرشـبردنانە ئـەنجامی بـەهێزیو تواناییمـە.. یـان نیشـانەی کلـۆڵیو ورە بەردانمە!! ئەم زۆرزانییەش واملێدەکات کەمدووبم.. لە گوفتارو هەڵسوکەوتدا بە چەقەنەو هەڵەوەڕ نەبم.

١٠-ئەو سوپایەی نەخشەی هێرشبردن دادەنێ.. دەبێ لاوازترین خاڵی دوژمن بدۆزێتەوەو.. زۆر لەنکاویش لێیبدات.

ئـــەو ســـوپایەی نەخشـــەی کشـــانەوە.. یـــان خۆقـــایمکردنو بەرگریکردن دادەنێت.. دەبێ دەستوبرد بەرەو ئەو هێڵانە بکشێتەوە لەوەوبـــەر بەباشـــی دیراســـەکراونو... تایبـــەتن بـــە خۆقـــایمکردنو بەرگریکردنـەوەو.. دەسـتوبرد.. نـەوەك دوژمـن پێشـیانبکەوێتو.. شـیرازەی سـەرلەبەری نەخشـەو هەڵسـوکەوتەکانی سـوپای کشـاوە تێکبدات.

(چانگ-لی) فەرموویەتی:

"بەخێرایی (با) هێرشبەرەو.. بەخێرایی (بروسکە) بکشێرەوە.

١١- کاتێـك شـەڕ هەڵگیرسـاندنم مەبەسـتە.. دوژمـن ناچـاری پێکداهەڵپژانو شـەڕ دەکـەم.. تەنانـەت گـەر خۆدامەزراندنەکانیشـی بۆ بـەرگریکردن بـنو.. نەخشەکانیشـی بـواری ئـەوەی نـەدەنێ لەگەڵمـدا بەشەڕبێ.

چۆن دوژمن ناچاردەکەم تاکو لە کاتو شوێنی عەسکەریی بۆ من لەباردا بکەوێتە شەڕەوە؟!

دەچـم لـەو شـوێنە ناسـکانەدا لێیـدەدەم.. هـیچ چارێکی دی بـۆ نەمێنێنێتەوە جگە لە شەڕی عەسکەرییانە نەبێ.

١٢- کاتێکیش دەمەوێت خـۆم لـە شـەڕ دوورەپـەرێز بگـرم.. هێڵێـك لەسەر زەوی (یان لەسـەر نەخشـەی جوگرافی) لـەو جێیـەی دەمـەوێت بەڕاستی خۆمی تیا قایمکەم دەکێشـم.. ئەوجا هەوڵـەدەم.. دوژمـن بە

شـتی لاوەكـــی و لـــەملاو ئـــەولاوە خەریكبكـــەم.. دوور لـــەو هێڵـــە مەحكەمەی بەخۆم وێنەم كێشاوە لەپێناوی بەرگری و خۆپاراستندا.

**(مۆ-تۆ) فەرموویەتی:**

"(شـۆ-كـۆ)ی سـەركردە.. لـە ناوچـەیێكی نزیـك شـاری (یـانگ-یینگ)دا.. بۆ پاراشتنی شارەكە بنەو بارخانەی عەسـكەریی لێخست.. فـەرمانی بـە هەنـدی لـە ئەفسـەرەكانی دا.. بـەخۆیان و هێزەكانیانـەوە بەرەو خۆرهەڵات ببنـەوەو.. سـەركردە بەخۆیشـی بـە هێزێكـی گچكەی تەنیا دەهەزار جەنگاوەرێكەوە لەو ئۆردووگەیەی بۆ بـەرگریكردن لـەو شارە هەڵیبژاردبوو مایەوە.

فـــەرمانی بەســـەربازەكانی دا.. جموجـــووڵ و هـــەراو زەنایـــان كەمبكەنـــەوەو.. ئاڵاكانیشـــیان نەویكـــەن.. وەك نیشـــانەیێك بـــۆ پاڵدانەوەو خەفەبوون و نائامادەییشیان بۆ شـەڕ.. هـەروەها لێشـگەڕێن با دەروازەكانی شار لەسەر گازی پشیتبن.

راوێژكارانی نێو سەركردایەتی سوپای دوژمن وتیان: (شۆ-كۆ)ی سەركردە.. جگـە لـە ئۆردووگـەیێكی گچـكەی دەوری شـارەكەی چیدی نییە.. لە ئەفسەرەكانیشـی گـەڕاوە بـە هێزەكانیانـەوە بـەرەو رۆژهـەڵات بـــڕۆن و.. ئۆردووگەكەیشـــی بێدەنگ وســـەنگە.. ئاڵاكـــانی نـــەوین.. سوپاكەی لەشـداهێزراو.. هـیچ نیشـانەیێكی خـۆ بـۆ شـەڕ تـەیاركردنی پێـوە دیـار نییـە.. دەرگـەكانی شـار لەسەرپشـتن.. دەی.. مـادەم لەرووی عەسكەرییێوە هێنـدە لاوازو هێنـدەش گەمژەیـە.. بـا هەڵمـەتی بۆبەرین.

بەڵام سەرکردەی سوپای دوژمن وەڵامی راوێژکارەکانی دایەوەو وتی: ئێوە هەڵەن.. (شۆ-کۆ)ی سەرکردەی دوژمنانمان.. بۆسەو داوێکی وای بۆ ناوینەتەوە هەمووومان لەنێوبەرێ.. لەبەئەوە قاپییەکانی شاری ئاواڵە کردووە.. دەهۆڵەکانی ناکوتن‌و.. ئاڵاکانی نەویکردوون‌و.. هێزە عەسکەرییەکانی بەرەو خۆرهەڵات بەڕێکردوون‌و.. لێگەڕاوە شارەکە وا بنوێنێ پڕزە لێبڕاوو بێ بەرگرییە.. لەم حاڵەتەدا وام پێباشە خۆمان لە شەڕی لادەین‌و.. لەم ناوچەیەش بارکەین.

سوپای دوژمن باریکردو.. خۆی لەو شەڕە پاراست.

(شۆ-کۆ)ی سەرکردە.. بۆ روونکردنەوەی کشانەوەی سوپای دوژمن وتی: "وایان دانا من بۆسەییێکم بۆ نابێتنەوە.. من چ داوێکم بۆ نەنابوونەوە.. هەموو ئەوشتەی من کردم ئەوەبوو.. دوژمنم خستە واهیمەی ئەوەوە داوێکم بۆ نابێتەوە.. فێڵەکەم سەریگرت‌و.. بەبێ شەڕو کوشتار سەرکەوتین.[٢٣]

١٢- زۆر پێویستە پەی بە خاڵە لاوازو بەهێزەکانی نێو ئۆردووگەی دوژمن ببەیت‌و.. بزانی وزەو توانای لەچیدایە.. زۆریش

---

[٢٣]- لە چیرۆکە میللیەکانی ئۆپێرای چینی (فۆلکلۆر) دا.. گەلێك نموونەی ئەمجۆرە زۆرزانیی‌و..فێڵ‌و.. رێنماییە عەسکەرییانە هەیە.. بەتایبەتیش ئەم رووداوە.. لە ئۆپێرێتێ بە نێوی (شۆ_کۆ)دا بەنەمریی مایەوە.. ئەم ئۆپێرێتە بەناوی (ئەو سەرکردەیەی بەبێ کوشتار شەڕەکەی بردەوە) ناونراوە .

پێویستە خاڵە لاوازو بەهێزەکانی خۆت و وزەوتوانات لە دوژمن بشاریتەوە.

لەمجۆرە حاڵەتەدا.. دەتوانم بێئەوەی دوژمن بەخەبەربێ.. هەموو هێزو تواناییێکم گردکەمەوەو.. ئەوجا لەنکاو بەجۆرێکی وا لێیدەم.. پێینەکریٚ بزانیٚ وزەو توانای شەڕم چەندە.

پێویست ناکات.. لەمجۆرە لێدانەو.. لە لێدانە کتوپڕەکاندا بەگشتی.. هەموو چەکەکان.. یان گشت سەربازەکان بەکاربێنم.. بەڵکو بەهێزترین چەکێکم بەکاردێنم.. لە کورتترین کاتداو بەزەبرترین شێوەش.. ئیدی لێدەگەڕێم دوژمن بە بیرو ئەندێشەی شپرزەو شێواوەوە.. نەزانیٚ‌ی چی بکات..بەمجۆرە سەرکەوتنم مسۆگەرە.

(مۆ-تۆ) وتویەتی:

" هەندیٚ جار هەوڵدەدەم.. لە شەڕە هێرشاوییێکاندا چەند هێزێکی سووکەڵە لە سوارچاکە گورجوگۆڵەکانم بەکاربێنم.. تا لە قۆڵەکانەوەو لە پاشەوە لە دوژمن بدەن.. هەروەکو چۆن باڵندە لە حەواوە شالاودێنن.. دوژمن پێنازانیٚ ئەم داڵە دەنووکتیژانە لەکوێوە بۆی نازڵبوون.

لە هەندیٚ حاڵەتی دیدا.. پەنا وەبەر هێزە قورس و گرانەکان دەبەم.. بە هەڵسوکەوت خاوو بەچەك و جبەخانە گران.. پێکهاتوو لەو گالیسکە چەکدارەکانەی رم بەدەست و تیروکەوان بەشانیان بارکردووە.. تاکو لەنێوجەرگەیدا لە دوژمن بدەم و.. ترس و لەرز بخەمە دڵیانەوە.. ئەوجا لە قۆڵەکانەوە بۆی بچم.. لە باڵی راست یان چەپ.. یاخود لە پاشەوەشی.

هەندێجار بە ڕۆژی نیوەڕۆ هێرشدەبەم.. بە ئەنقەست دوژمن دەخڵەتێنم.. جیفرەی عەسکەریی بە شێوەی ئالاْشەکاندنەوە یان کەڕەناو تەپڵکوتان بەکاردێنم.. تاکو دوژمن بەتەواوی لەمەبەستەکانم حاڵی نەبێت.. ئەگەر ئەم ئێماژەو تەپڵ و شەیپوور لێدانانەی بە زمانی جەنگ واتای هێرشبردنەو.. دوژمنیش هەر وای لێتێگەیشت.. ئەوا مەبەستی من پێچەوانەیەو هێرش نابەم.

بەم سەر لێتێکدانە بەهۆی زمان و ئێماژە عەسکەرییێکانەوەو.. بە زمانی تەپڵیش.. دەتوانم دوژمن هەڵخڵەتێنم.

هەندێجار لە شەودا شەبەیخوون دەبەم.. یان دوژمن دەخەمە گومانی ئەوەوە وا بزانێ بەشەو هێرشی دەکەمەسەر.. تەپڵ لێدەدەمو.. چراو مەشخەڵەکان دەکوژێنمەوەو.. وا خۆم نیشاندەدەم گوایە بەنیازم بەرەوڕووی بچم.. وەلێ هەر زوو خۆم بۆ ئەوە سازداوە لە کازیوەدا لە باڵی ڕاستی.. یان لە قوڵی چەپی.. یاخود لەپاشەوەی لێیبدەم.

کەواتە من بەتەنێ پشت بە (هێز) نابەستم.. بەڵکو هێندەی بۆم بلوێ لە هەموو دەرفەتێکدا فێڵ و تەڵەکە دەخەمەکار.. بەزمانی ئێماژەو تەپڵیشەوە بۆ سەرلێشێواندنی دوژمن.

١٤- پێویستە لەسەرەتاوە دوژمن نەزانێ چ شوێنێ هەڵدەبژێرم.. تا بیکەمە نەبەردی سەرەکی بۆ شەڕ.. هێزەکانم بەرەو جێیێکی دیاریکراو بەبەرچاوو بەئاگایی خەڵکیی نابزوێنم.

شاردنەوەی جموجووڵە عەسکەرییەکان لای دوژمن.. دوژمن ناچاردەکات بۆ بەرگریکردن و خۆئامادەکردن لە هەموو بەرەکانییەوە بەجارێ خۆی بڕەتێنێ.. نەك هەر لەو بەرەیەوە کە بە بەرەی سەرەکی جەنگیی دادەنێت.

کاتێ وزەو تواناکانی دوژمن پەرشوبڵاودەبنەوە.. سەرکردە دەتوانێ لە هەر مەوقیعێکدا خۆی ببیەوێ لێیدات.. بە مەرجێ ئەو سەرکردەیە.. هەر زوو هەموو توانا عەسکەرییەکانی لە تاکە شوێنێکدا خڕنەکردبێتەوەو.. ئەم زانیارییەیشی بە هەموو لایێکدا بڵاونەکردبێتەوە.. چونکە بەوە دەرفەتێکی باش بۆ وریابوونەوەی دوژمن دەڕەخسێنێ.. بوارێ بەپێچەوانەی خواست و ویستی سوپای هێرشبەرەوە بێ.

١٥– ئەو سوپایەی بە عالەمی ئاشکرا بە چەقەنەو گیزەگیز بۆ مەیدانی جەنگ هاتووە.. هەر زووبەزوو دەزانرێ هێزەکەی بایی چەندە.. سوپای دوژمن هێندەی بەسە بچێ لە پاشەڵی سوپاکەوە لێیبدات و.. ڕێی پەیوەندیو تەموینی ببڕێت.. ئیدی سوپای هێرشهێنەر.. بەمە لاوازو هێز پەرتەوازە دەبێت.. ئەگەرچی سوپاییێکی گەورەو گرانیش بێ.

(چانگ-لی) فەرمووییەتی:

"ئەگەر جموجووڵەکانت لە دوژمن شاردەوە.. بەناچاریی دەبێ هێزەکانی بە هەموو لایێکدا بڵاوبکاتەوەو.. مشووری خاڵە لاوازەکانی

خـۆی لــه هــەموو بــەرەکانی شـــەڕدا بخــوات.. بەمــه وزەو توانــای پەرتپەرتو خۆی لاواز دەبێ.

ئەوسا بـەهێزترینی هێزەکانـت هەڵبـژێرەو.. لـه لاوازتـرین خـاڵی دوژمن بده."

١٦- ئەو لایەی لەنێو هێزه عەسکەرییێکەدا لە هەموو لاکانی دی لاوازتره.. دەبێ هەردەم لـه دژی دوژمـن ئامادەباشبێ.. ئـەو لایـەش لـه نێـو هێـزه عەســکەرییێکەدا لـه هــەموویان بـەهێزتره.. دەبـێ دوژمـن بەردەوام به خۆقایکردنو ئامادەباشیی هێزەکانییێوه شەکەت بکات.

١٧- کـاتێ سـەرکردایەتییێکان نەبەردی جـەنگو ئانوسـاتی شـەڕ دەزانـن.. سـەربازەکان بـه خۆشـحاڵییێوه.. بـۆ بـەجێهێنانی ئەرکـەکانی جـەنگ.. هــەزار فرســەخەڕێ دەبـڕن.. چـونکه لـەم حاڵەتـەدا ســەرباز دەزانـــێ ســـەرکردایەتییێکی بـــەکردوبزان رێبـــەریی دەکـــات.. هـــەر لەمەیشەوه لە متمانەو بڕوابەخۆبوون بەهرەمەند دەبێ.. ئەمە بنـەمای داکوتانی هێزێکی مەزنه لە جەنگدا.

وەلێ ئەگەر سەرکردایەتیی راڕابێو نـەزانێ چۆن نەبەردی جـەنگ هەڵدەبـژێرێو.. نەشـزانێ کاتوسـاتی شـەڕ کەیـه.. ئـەوا لـەو پێکهاتـه باوەی لەنێو سوپادا هەیه.. باڵی راستی سوپاکه بە باڵی چەپی نازانێ چی دەکات.. پاشەنگی نازانێ چۆن بەهانای پێشەنگییێوه بێت.

ئەم کەنەفتییـەی سـەرکردایەتییێکان (لـه هەڵبـژاردنی شوێنو کـاتی شەڕدا).. ئیدی تا نەبەردەکانی شەڕ فراوانترو بەرەکانی جۆراوجۆرتر بن..مەترسییێکان گـەورەتر دەبـن.. ئـەم کەنەفتییـەی سـەرکردایەتیش..

دەبێتە مایەی خستنەوەی گەورەترین خاڵی لاوازیی لە وزەو توانا عەسکەرییێکانی سوپادا.. هەرچەندێکیش بە ژمارەی پیاوان و ئازووخەو تفاق خاوەنی هێز بێت گرینگ نیە.

**( تۆ-یۆ ) فەرموویەتی :**

"دانایی سەرکردایەتی لەوەدایە هەر زوو ئەو دوو خاڵە دیاریبکات: نەبەردی جەنگ لە کوێدایەو.. کەی شەڕ دەستپێدەکات ؟

هەر بەمجۆرەش دووریی میانە (جوگرافی)ێکان.. تووڵەڕێ و سەرەڕێکان.. بڕینی ئەو ڕێگەیانە چەند سەعات یان چەند ڕۆژ دەخایەنن؟ ئەمانە گشتیان دەخەملێنێ.

ئەوجا –دوای ئەوەی ڕێوڕۆیشتنەکە لە شوێنی مەقسەد نزیکدەبێتەوە.. سوپاکە دەکاتە کەرت کەرت.. بەجۆرێك هەر کەرتە لە هەر لایێکەوەبێ بەرەو شوێنی پێکگەیشتنەوەی هەموو سوپاکە بچن.

سوپا هەموو بەجاریێ و بە تەنیا یێك ڕێگەدا ناڕوا.. بەڵکو بە ڕێبازی هەمەجۆرو بەچەندین ڕێگەدا پەرتپەرت دەبێت.. هەمووشیان بەرەو ئەو شوێنە دەچن سەرکردایەتی وەك مەیانێك بۆ شەڕەکە هەڵیبژاردووە.. بە جۆرێك هەموو هێزە عەسکەرییێکان لە یێك کاتدا بیگەنێ.

ئەمەش ئەوە دەسەپێنێ.. ئەو هێزانەی درێژترین ڕێگەیان بڕیوە.. بەرەو مەیدانی جەنگ بەڕێکەون.

ئەم پرۆسەیە لەو کاروانی بازرگانیانە دەچێ.. لە جۆرەها گوندو ئاواییێوە هاتوون.. تا لەو بازاڕە گشتیەدا پێکبگەن کە بەزۆری لە یێك

جێگەداو لە ڕۆژێکی دیاریکراویشدا بۆ ئەو مەبەستە سازدەکرێ و.. هەمووش شوێن و کاتی کردنەوەی بازاڕەکە پێدەزانن.. ئیدی هەر کاروانێك ڕێوڕۆیشتنەکەی بە ڕێگەوبان و لە کاتوساتی جیاوازی خۆیدا ڕێکدەخات.. بەڵام هەرهەموویان لە گۆڕەپانی بازاڕە گشتییەکەداو لە کاتی کردنەوەیدا پێکدەگەن.. وەك: هەینی بازاڕ.. چوارشەممە بازاڕ.. سێشەممە بازاڕو... هتد.[٢٤]

---

[٢٤]– (تۆریۆ) کە نزیکەی ٢٠٠ ساڵ بەر لە دانەری (هونەری جەنگ) ژیاوە.. ئەم ڕووداوەی خوارەوە.. وەك بەڵگەیێك بۆ ئەو فەرمایشتە دەگێڕێتەوە.. لە (سەرچاوەییێکی کلاسیکی چینیدا) دەڵێ:

"ئیمپراتۆر (وۆ) سەرکردەی سوپاکەی (شۆ–لینگ–شی) بۆ شەڕی هێزە دوژمنکارییە لە دەوڵەت یاخیبووکان نارد.. ئیمپراتۆر بە سەرکردەی سوپاکەی وت: پار رامسپاردی بە هەڵمەتێکی عەسکەریی ئەو یاخیبوانەی پشت روبارم بۆ تەمێبکەیت.. بەرلەوەی بەتەواوی بیانهاڕی گەڕایتەوە.. ئەمجارەیان یاخیبوان وادەزانن ڕێگەییێکی دی جگە لە ڕێگەی روبارەکە دەگریتەبەر.

گەر وامان دانا من بەخۆم بە سەرکردایەتی هەڵمەتێکەوە لە روبارەکە دەپەڕمەوەو.. لێدەگەڕێم سوپای یاخیبوان چاودێریم بکەن.. تا خەریکی خۆقایمکردن و داخستنی ئەو ڕێیانەبن کە دەچنەوە سەر شارەکەیان.. تۆیش ئەی سەرکردە بەخۆت و سەربازەکانتەوە لاییێکی دی بگرەو.. لە کاتێکدا ئەوان بە منەوە خەریکن تۆ غافڵگیریانبکەا.. وەڵێ ترسی ئەوەم هەیە.. یاخیبوان پەی بە هەقیقەتی ئەم نەخشەیەم بەرن.. لەبەر ئەوە.. ها با ئەم فەرماننامە پێچراوەمت پێبێت.. ڕێوشوێن و کاتی شاڵاوە ناکاوەکەتی

١٨- من بڕوام هەیە سوپای زرنگ دەتوانێ سەرکەوتن بە دروستکردن دروستبکات.. تەنانەت ئەگەر دوژمن بە تفاق و پیاو و جوامێریش بەهێزتر بێت.. بەوەی رێی پێنادەم شەڕم بەسەردا بسەپێنێ ئیللا لەو کات و شوێنەدا نەبێت بۆ خۆم پێمباشەو بە لەباری دەزانم.

**(شیا-لین) فەرموویەتی:**

"هەرچەندێ دوژمن لە ئازایەتی و وزەو توانای عەسکەریدا بەسەرما بشکێتەوە.. ناتوانێ بمبەزێنێ.. مادەم دەتوانم خاڵە لاوازو بەهێزەکانمی لێوەشارم.. بەمە دەیخەمە نێو گێژاویکی ئەوتۆوە.. هێدە بەخۆقایکردن و ئامادەباشیی جەنگەوە شەکەتی دەکەم.. هەموو هێزو داهاتی پەرشوبڵاوببێتەوەو.. لێشناگەڕێم دەرفەتی پشوودانی هەبێ.. یاخود هەلی ئەوەی وەچنگبکەوێ سەرلەنوێ خۆی بۆ لەنێوبردنم تەیارکاتەوە.

١٩- ئەمەیش ئەوەم بەسەردا دەسەپێنێ.. هەردەم پەی بە خولیاکانی دوژمن بەرمەو.. بزانم خەریکی چ ئامادەباشیی و هەڵسوکەوتێکە.

٢٠- بە خاڵە لاوازەکانی وەڕسیدەکەم تا بزانم لە خاڵە بەهێزەکانیدا چەند بەتوانایە.. هەروەها بەپێچەوانەیشەوە.. بێئەوەی رێ بەخۆم یان به دوژمن بدەم پێکدادانی تەواوی شەڕ لە نیوانماندا

---

تێدایە.. بەڵام ئیمپراتۆرو سەرکردەش شەڕەکەیان دۆڕاند.. چونکە سەرکردە هەر لەسەرەتاوە ئان و ساتی شەڕەکەی نەدەزانی.

بێتەئاراوە.. مەبەستیش لەو وەڕزکردنەی.. هەوڵدانێکە بۆ پەیبردن بە شێوازی جموجووڵە عەسکەرییێکانی.

هەر بەنموونە.. لە سەروبەندی ئاشتیدا چەند جارێك پەلاماری هەندێ لە ناوچەکانی دەدەم.. ئەگەر دوژمن لەم پەلاماردانانە بێدەنگبوو.. ئەوا دیارە یان لێمدەترسێ.. یاخود لەمن زۆرزانترەو.. خۆی ئارام نیشانددەدا.. تا خاڵە لاوازو بەهێزەکانی ئاشکرا نەبن.. وێڕای ئەمەش دکارم هەندێ لەو شتانەی مەبەستمن تێبگەم.. لەمەڕ ورەی دوژمنەوەو.. یان بەکردوبزانییێکەی یان ترسی یاخود نائامادەگی... گەرئەمجۆرە پەلاماردانانەم دووبارە کردنەوەو.. هەرجارەش بڕوبیانووییێکم بۆ هێنانەوە.. جارێ بەنێوی ئەو چەتانەی بۆم نایەنە ژێربارو.. جارێ بە بیانووی راوەدوونانی ئەو دزو رێگرانەی پەنایانبردۆتەبەر.. یان بەرەو خاکی دوژمن هەڵاتوون.. بەمجۆرە هەمیشە بڕوبیانوو بۆ ئەم پەلاماردانانەم لەسەر سنوورەکانی دوژمن دەدۆزمەوە.. تا لە خاڵە لاوازو بەهێزەکانی بیگوماندەبم.. گەر لەوە دڵنیابووم لەوەی تەسەوورم دەکرد لاوازترە.. ئەوا لێدانی کوشندە لێیدەدەم.. ئەگەریش لەوە بیگومانبووم لەوەی من پێمدەزانی بەهێزترە.. خۆمی لێدەپارێزم و لەگەڵیدا ناچمە نێو جەنگی تەواوەوە.

٢١- ئەگەر توانیم بە خاڵە لاوازو بەهێزەکانی دوژمن بزانم.. دەتوانم شێوازی شەڕەکە دیاریبکەمو.. نەبەردی شەڕیش هەڵبژێرم.. یاخود ئەو مەوقیعەکانی بەرگریکردنو خۆقایمکردن هەڵبژێرم.. ئەگەر بڕیاری چوونە نێو شەڕم لەگەڵیدا نەدا.

٢٢- زۆرزانانەترین شێوازی سەرلێتێکدانی دوژمن ئەوەیە.. بەر لە شەڕو لەسەروبەندی شەڕیشدا وا لە پێکهاتە عەسکەرییەکانم بکەم بەلای دوژمنەوە بزر بێت.. پەسەندترینی شێوەکانی سەر لێشێواندنی دوژمـــن لەمـــەڕ پێکهاتـــەی عەســـکەریی.. ئەوەیـــە نـــەهێڵم هێـــزە عەسکەرییە یێکگرتووکانم.. لە شێوەییێکی نیزامی بەر چاوودەمدا بێت.. تا هەوالّدزانی دوژمن نەتوانن زانیاری دروست لەمەڕ پێکهاتەی عەســـکەریمەوە کۆبکەنـــەوە.. چ لـــە ســـەروبەندی ئاشـــتیی بـــەر لـــە پێکدادان و.. چ لە حاڵـەتی گرژیـی بـەر دەسپێکردنی شـەڕو.. چ لـە گەرمەی شەڕیشدا.

٢٣- سـەرکردەی زرنـگ ئەوەیـە .. نەخشـەکانی لەسەر بنچینەی ئەو پێکهاتە عەسکەرییانەی بە گونجاویـان دەزانـیٚ دادەڕێـژیٚ.. نـەك تەنها لەسەر بنەمای ژمارەی پیاوو قەوارەی ئازووخەو تفاقی جەنگ.

بەباشـی هەڵبـژاردنی پێکهاتـە عەسـکەرییێکانم.. بـۆ ساڕێژکردنی خاڵـە لاوازەکـانی نێـو هێـزە عەسـکەرییێکانم بەهانامـەوە دێـت.. هـــەروەهاش بـــۆ زێـــدەڕۆیی کـــردنم بـــە خاڵـــە عەســـکەرییە بەهێزەکانیشمەوە.. بەپێچەوانەیشەوە هەر راستن.

٢٤- عـادەتم وایـە.. ئـەو شـێوازی زۆرزانـی (سـتراتیژی)یـە عەسکەرییانەی لەمەوبەر بەکارمهێناون و.. بەهۆیانەوە لە شەڕەکانی پێشـوودا سـەرکەوتنم پێوەدەسـهێناون.. جـارێکی دی دووبارەیـان نەکەمەوە.. بەڵکو بۆ هەر شەڕێك نەخشەو شێوازێکی زۆرزانانەی دی دەدۆزمـەوە بۆ ئەو بارودۆخە بشـیٚ و.. چـاوی دوژمـن کوێربکـات و..

توانــای پێشــبینیکردنی لێبشــێوێنیٚو.. نــەزانیٚ لــە خولیــای چ شێوازێکی زۆرزانانەی شەڕدام.

٢٥- سـوپا.. بەوێنــەی ئـاوی ڕۆشـتوو.. خـۆی لـە قـەرەی گـردو بـەرزایی نـادات.. بـەڵکو لەسـەرەوە بەرەوخواردەبێتـەوەو.. لێـژایی و نشـێوی بۆخـۆی هەڵدەبـژێریٚو.. بـەو پێچـا وپێچو چاڵوچـۆڵیانەدا دەڕوات هیچ قۆرتو لەمپەرێك نیە بەری ڕۆیشتنی لێبگریٚ.

سـوپاش دەبـیٚ لـە ڕێوڕۆشـتندا وابـیٚ.. خـۆی لـەقۆرتو لەمپـەرە سـەختەکان بپـارێزیٚو.. وەدووی توولـەڕیٚ پێچاوپێچـەکان بکـەویٚ.. تـاکو لـە هـەر شـوێنێکدا خـاڵی نـزمو لاوازی دوژمنــی هاتــەڕیٚ بـە پێیــەکانی بیانشــێلیٚ.. وەك چــۆن ئـاوی بەتــەوژم ئــەو شــوێنانەی تەبیعەتی زەوی نشێوو لاوازی کردوون.. بۆیان دەکشـیٚو بەسـەریاندا دەڕوات.

٢٦- ئاو بە هاوئاهـەنگیی لەگـەڵ تەبیعـەتی زەویـدا دەڕژیٚ.. خـۆی لــە بەربەســـتو لەمپــەرە سروشــتییێکان لادەداتو.. بەدەوریانـــدا خولـدەخوات.. سـوپای جـەنگاوەریش.. چـوون ئـاوی ڕوبـار.. بــە هاوئاهـەنگیی لەگـەڵ سروشـتی خاڵـە لاوازو بـەهێزەکانی دوژمنـدا.. دەڕژێتە نێو (لاوازیی) ئۆردووگەکەیانەوەو.. دەوروخولی خاڵە عاسیو بەهێزەکانی دەدات.

٢٧- هـەروەها سوپا بەچەشـنی ئاو.. لە ڕۆگەکەیدا هـیچ شـێوەو قاڵبێك ناگرێتە خۆی.. مانەندی جۆگـەییێکی گچکەی خوڕو بەتـەوژم.. دەڕوات (کاتیٚ تەبیعەتی زەوییێکە لەبەردەم ڕۆگەی ئاوەکـەدا تەنگەبـەر بێـت).. یـاخود بەوێنـەی ڕوبـارێکی پـانو بـەرین بـە کـاوەخۆ دەڕوات

(بیگومان کاتێ تەبیعەتی خاکەکە لەبەردەم ئاوەڕۆکەیدا تەختایی و بەرفراوانبێت).

هەروەهاش سوپای جەنگاوەر.. دەبێ بەردەوام بە نەرم و نیانیی شێوەو قالبی جۆراوجۆری ئەوتۆ بگرێتەخۆی.. لەگەڵ بارودۆخ و هەڵوێستەکاندا بگونجێ.

٢٨- سەرکەوتن ئەوە دەخوازێ.. بەردەوام گۆڕانکاریی و هەموارکردنت لە شێوازی شەڕکردنەکانتدا هەبێت.. ئەمەیش هاوشانی ئەو ئاڵوگۆڕانە بێت.. یاخود هاوشانی ئەو گیربوون و وەستانە بێت.. لە هەڵوێستەکان و وزەوتواناکانی ئۆردووگەی دوژمندا روودەدەن.. ئەمجۆرە سەرکەوتنانە لە سرووشی یێزدانی دەچێ.. کاتێ سەرکردە خاڵە لاوازو بەهێزەکانی دوژمن دەدۆزێتەوە.. بەپێی پێویست وزەو توانای دەخاتەگەڕو.. سەرکەوتن بۆخۆی بەدەستدێنێ.. یان هیچ نەبێ ناهێڵێ دوژمن بەسەریدا سەرکەوێت.

٢٩- با هەردەم ئەوە بزانین.. ئەو پێنج توخمەی گەردوونیان لێپێکهاتووەو.. ئەو چوار وەرزەی ساڵ پێکدێنن.. گشتیان وەرزگەلێکن و هەرگیز بەدرێژایی ساڵ تاکە وەرزێکیان بەردەوام نابێت.. هەروەها رۆژانیش.. هەندێکیان درێژو بڕێکیان کورت.. هەیڤیش جارێك گەشاوەو رووناك و.. جارێکیش رەش و تار.

# بەشی حەوتەم

# ململانیٚ[25]

[25]– لە دەقە چینیە ئەسڵییەکەدا هێندەی پێوەندی بەم پشکەوە (بەشی حەوتەم) هەیە.. ململانیٚ ئەم واتایانەش دەبەخشن: رکەبەریی.. کێبەرکیٚ.. زۆرانبازیی..کێشمەکێش.. کوشتاری نیوان دوو سوپا.. هەلقۆزتنەوە.. چاووڕاوکردن.. فێڵ‌و فەرەج.. هەڵفریواندن‌و لەخشتەبردن.

( سۆن-تزو ) فەرموویەتی:

١- لە هەڵمەتی عەسکەریدا وا باوە.. شاهەنشای وڵات سەرکردەی سوپا (یان رابەری هەڵمەتی عەسکەرییانە) دادەنێت.. لەگەڵ سەربازگیری بەشەریی و هەموو پێداویستییەکانی.

سەرکردەیش.. کۆکردنەوەی هێزە چەکدارەکانی ژێر فەرماندەیی خۆی دەگرێتەئەستۆ.. ئەوجا جۆرە تەشکیلاتێکیان لێپێکدێنێ.. بۆ هونەری جەنگ و پێداویستییەکانی شەڕ بشێ.. دواتر سەرکردە و سەربازانی لە ئۆردووگەکاندا بنەدادەکوتن و.. ئامادەی پرۆسەی جەنگ دەبن.

( لی-شوان ) فەرموویەتی:

" دوای بیروڕا گۆڕینەوە لەپەرستگە ئاینییەکەیاندا (یان لە ئەنجومەنی شوورای فەرمانڕەوایی وڵاتدا).. سەرکردە بە تەکلیفی پادشای وڵات.. ئەرك و فرمانی خۆی لە سنووری میرنشینی هەڵمەتە عەسکەرییێکەیدا دەگرێتە ئەستۆ.

ئەم تەکلیفکردنە لەجیاتی فەرمانێکە بۆ دەرزدادانی دوژمن.. فەرمانێکە لە ئاسمانەوە بڕیاری لەسەر دراوە..."

٢- لە هونەری جەنگدا هیچ شتێ نییە بەقەدەر کێشەی ململانێ (یان چاوڕاو) قورسبێت.. قورسییێکەی لەوەدایە.. دەبێ هەوڵبدەیت سەختترین رێگەی هاتوچۆ بۆ کشانی سوپاو جموجووڵەکانی..

بکەیتە باشترین ڕێگە.. یان لە خراپترین هەڵوێستدا تایبەتمەندێتی و هەلومەرجی پەسەند بدۆزیتەوە.

٣- کەواتە دەبێ ڕێگەی هاتوچۆی ناڕاستەوخۆ هەڵبژێری.. دەبێ لە ئاست مەرامە عەسکەرییە مەزنەکانت چاوی دوژمن کوێربکەیت.. بە پەلاماردانی لاوەکییۆەخەریکی بکەیتو.. بە ئەنقەست وەڕسیکەیت تا بەو پەلامارە لاوەکیانەوە تێوە بگلێ.

گەر ئەمەت جێبەجێکردو سەریگرت.. ئەوا بەر لە دوژمن دەگەیتە ئامانجەکانت.. گەرچی ئەو لە کشانو وزەوتواناشدا لەپێشتەوە بێت.

ئەوەی ئەمجۆرە هەڵسوکەوتە (یان ململانێیە یان چاووڕاوە)ی لەدەستبێت.. دەشتوانێ فرۆفێڵی زۆرزانانەی (ستراتیژی) بۆ کاروباری جەنگی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دابهێنێ

**(تساو-تساو) وتوێتی:**

"وا خۆت نیشاندە لە هەڕەشە یان لە مەوقیعەکانی دوژمنەوە دووریت.. وەلێ هەوڵبدە بەر لەو بیانگەیتێ.. چونکە بەم کارەت دەبیتە خاوەنی زانیاری ورد لەمەڕ ئەو دوورایانەو ئەو ڕێگەوبانانەی ئیدی دوژمن ناتوانێ لێیانەوە چاودێری هەڵسوکەوتەکانت بکات."

**(مۆ-تۆ) وتوێتی:**

"بۆئەوەی شتێکی تایبەتمەندی وا لە بارودۆخەکەدا بقۆزیتەوە.. فەزڵت بەسەر وزەوتوانای ئۆردووگەی دوژمندا بدات.. پەنا وەبەر توولەڕێی بەپێچو پەنای دوورو درێژی ئەوتۆ بەرە.. بەنیسبەت تۆوە ببێتە کورتترین ڕێگەی کوشتاری هێزە نەیارەکانت.. بەوە دوژمن هەڵدەخلەتێنی و.. لەو جێگە سەقامگیربووەی خۆیدا لەنکاوو

بەشـــێوەییەکی لێـــت چـــاوەڕواننەکراو.. هەڵدەکوتیتەســـەری و راویدەکەیت.

ئەوسا هەرچی پرۆسە عەسکەرییێکانی دیکەیە.. بەهۆی ئەم تەڵەکەبازییـەوە.. بـۆت بەچـاك دەگـەڕیٚو.. بـەرەو سـەرکەوتنی دیکەی زۆر ئاسانترو مسۆگەرترت دەبەن."

٤- ململانیٚ هەمیشە خێرلی و سوودمەند نابیٚ.. ئەوەی لە گەمەکە نازانیٚ.. سەرئێشـەو گیروگرفـت بۆخـۆی و.. هەڕەشـەو مەترسـیش بـۆ هێزەکانی دەخاتەوە.

(تساو-تساو) وتوێتی:

"ململانـــیٚ (یـــان فـــێڵ و چـــاووڕاو) کـــردن..لەلایـــەن ســـەرکردەی چـاپووکەوە گـەلیٚ سـوودی هەیـە.. وەلیٚ لەلایـەن سـەرکردەی گـەوج و نەفامەوە.. چەپەڵترین ئەنجامی دەبێت."

٥- لە شەڕێکی فرە ئامانج و فرە ئەرکی جۆراوجۆردا.. سـەرجەمی هێزە عەسکەرییێکانت مەخەرە پای وەدەسهێنانی تاکە ئامانجێك.

٦- ئەگەر -بەنموونە- گشت هێزەکانی سوپاکەت.. بەرەو لێدانی چـەند هێزێکـی سـوپای دوژمـن بەڕێخســت و.. لێگـەڕایت بنکـەکانی ئازووخەخستنی نێو سەربازگەکەت لـەڕووی پارێزگارییێوە بێبـەرگری بمێنێتـەوە.. ئـەوا هەلـەکانی سـەرکەوتن لەدەسـت دەدەیـت.. چـونکە لێگەڕاویت ئەو بنکانـە بـەرگرییێکی پەسـەندیان لـە دەور نەمێنێتـەوە.. لەبەرئـەوە ئەگـەر دوژمـن بۆیـان چـوو.. ئـەوا ئـەوان دەستەوسـان و بـیٚ هیچ بەرگرییێك دەگیرێن.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"ئەگەر سوپا بە گشت ئەو پیاوو تفاق و ئازووخانەی هەیەتی کەوتە جووڵە.. جووڵەکەی خاووخلیچکانە دەبێت.. ناتوانێت راوی دوژمنێکی گورجوگۆڵ بکات.

ئەگەر سوپا تفاقی قورس و کاروانی گەورەی بارە زەخیرەو ئازووخەی سپێری لەپاش خۆیەوە جێهێشت و.. بە پێشەنگە گورجوگۆڵەکانی سوپاکەی -کە باری گرانی چەکە قورسەکان شەکەتی نەکردوون- هێرشی برد.. ئەوەی لێرەدا مایەی مەترسییە.. فەوتان و لەدەستچوونی گشت ئەو ئازووقەو تفاق و زەخیرە سپێرانەی سوپایە کە بەجێیهێشتوون."

٧- دەشێ -بەنموونە- سوپا بە هەموو پیاوو تفاقێکەوەو.. بەوپەڕی گورجوگۆڵیشەوە.. شەو بخاتە بان رۆژ.. تا بگاتە مەیدانی جەنگ.

لەم حاڵەتانەدا.. هێزە سووکەڵە جەنگاوەرەکان.. بەر لەوانەی بە چەکەمەنی قورس و زەخیرەو ئازووقەبارگران کراون.. دەگەنەمەیدانی جەنگ.. یاخود لەوانەیە هێزە چالاکەکان خۆیان بخلافێنن.. تا هێزە بارگرانەکان پێیان رابگەن.. بەمجۆرە هەموو وزەو توانای سوپاکە زەرەرەومەند دەبێ.[٢٦]

---

[٢٦]- وتەبێژی عەسکەریی (گایلز- Giles) کە چەندین نوسراوی کۆنی چینی وەرگێڕوەو.. قسەشی لەسەر کردوون.. ئەم لایەنانەی خوارەوە لەمەر (ململانێ) شرۆڤەدەکات و.. دەڵێ:

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"سوپا بەزۆری لە رۆژێکدا (٣٠) سی فرسەخو بە یێك قۆناغ دەبڕێ.

"لە حاڵەتی ناچاریدا.. سوپا دەتوانێ دوو هێندەی ئەو مەسافەیە لەرۆژێکدا بە دوو قۆناغ ببڕێ.. یاخود سێ هێندەی ئەو مەسافەیە (نزیکەی ١٠٠ میل).. ئەگەر شەوو رۆژو بێ وەستان هەر بەڕێوەبێ.. لەمجۆرە بزووتنەوە ناچارییانەدا.. بێگومان سوپا چەند سەربازێکی لە کیس دەچێ.. بەوەی دەکەونە دەست دوژمنو یێخسیر دەکرێن.

ئەمجۆرە رێوڕۆیشتنە پەلەپەلو ناچارییە.. لە پرۆسە عەسکەرییێکاندا پێڕەو ناکرێت.. مەگەر لە دەیان جاردا تەنیا جارێكو.. لەو حاڵەتانەدا هیچ چارێکی دی نەبێت.. ئەمەیش بۆئەوەی شکستێکی گرینگ بە سوپای دوژمن بگەیەنێ..هەر بەنموونە.. دەکەوێتە پێشبڕکێی دەستبەسەراگرتنی مەوقیعێکی گرینگ کە دوژمن هەڕەشەی لێدەکات.

ئەمجۆرە خۆ بۆ کشانە ناچارییە.. ئەوەی لە سەرکردە گەرەکە وەنێو سەربازو ئەفسەرەکانی کەویۆو.. کامەیان توندو رەندو

---

گورجوگۆڵیو چاووڕاو بەنیسبەت هێزی عەسکەرییێوە.. چەند تایبەتمەندییێکی پەسەندو سوودمەندی عەسکەریی هەیە.. بە مەرجێ سوپاکە رێکخراوو باش مەشقپێکراوبێ.. خۆ ئەگەر وا نەبێ.. ئەوا چاووڕاوو بزاوتو ململانێ (بە واتاکانی ئێرە).. زیان بە خودی سوپاو هێزوتوانایو نەخشەکانیشی دەگەیەنێت.

چوست و چالاکە لێیان هەڵبژێرێ.. تاکو پێشەنگی سوپاکەیانی لێپێکبهێنێ و.. ئەوانی دی لە پاشەنگیدا بمێننەوە.

ئەگەر هەموو سوپاکە لە ١٠ هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو.. هەزاریان بۆ پێشەنگێتی هێرشەکە لێهەڵدەبژێررێ و.. ئەوانەی لەمانە کەمتر چوست و چالاکن بەدوایاندا و... ئیدی هەروا بەدووی‌یێکدا.. تاکو پەیوەندی نیوان پێشەنگانی سوپا و پاشەنگەکەی نەپچڕێ.

هیچ سەرکردایەتییێك ناچێتە ژێر باری ئەمجۆرە خۆ بۆکشانە ناچارییەوە.. مەگەر ئەو سەرکردایەتییە زۆر پێویستی بەوە بێت.. لەبۆ گرتنی مەوقیعێکی ستراتیژی نایاب وەپێش دوژمنەکەی بکەوێت.. یاخود لە پێناوی وەدەسهێنانی هەر پێداویستییێکی تایبەتمەند و پەسەندی دیکەی ئەو سوپا یەدا."

٨- لە لایەنە خراپەکانی ئەم کشانە ناچاریە پەلەپەلە.. پەککەوتنی گالیسکەی چەکە قورسەکان و.. گالیسکە بارهەڵگرەکانی گواستنەوەی ئازووخەو زەخیرە.. بەوە نزیکەی سێیەکی سوپاکە گەندەڵ دەبێت.

٩- ئەو سوپایەی چەکی قورس.. یان گالیسکەی بار گواستنەوەی لەنێو دەچێ.. بێگومان لەگەڵیاندا هەندێ لە ئازووقەی خۆراکیشی لە کیس دەچێ.

(لی- شوان) فەرموویەتی:

"لە هەندێ حاڵەتدا فرەیی ئازوقەی خواردەمەنی بۆ سوپا.. لە دەسکەوتی گرتنی مەوقیعێکی عەسکەریی.. یان دەستەوییێخەو پەلامارێکی گچکەی عەسکەریانە گرینگترە."

١٠- كلۆلى لەوەدايە.. سوپا پەنا وەبەر خۆبۆكشانى ناچاريى (بەپەلە) بەرێ و.. سەركردايەتييێكەيشى شارەزاى رێگەوبانەكە نەبێت.

١١- سوپاى كشاو هەردەبێ پەنا وەبەر رێنيشاندەرێ.. يان چەند كەسێكى شارەزاى خەڵكى دەڤەرەكە بەرێ.. لەوانەى كورتترين و سەلامەتترين رێگە پێدەزانن.

(مۆ-تۆ).. لە زارى (كوان-تزۆ)وە دەگوێزێتەوەو دەڵێ:

"بۆئەوەى باشترين ئەنجام مسۆگەركەيت و گورجوگۆڵترين تواناى جموجووڵت هەبێت.. دەبێ سەركردايەتى سوپاى كشاو.. زۆر بە وردى نەخشەكانى ئەو ناوچەو رێگەوبانانەى پێياندا تێدەپەرێت تاوتوێبكات.. تا بزانێ لەكوێدا مەترسى بۆ گاليسكە چەكدارەكان و گاليسكەكانى بارگواستنەوە هەيە.. بە وردى شوێنە زۆنگاوەكان و شوێنە بێ ئاوييێكان و.. هەروەها لارێ تووناو تونەكانى نێو چياو دۆڵەكان بزانێ و.. بەتەواوى دووريى و پان و بەرينى و تەنگەبەريى رێ و توولەرێكان بپێوێ و.. ناوى شارو دێهات و شوێنەوارە جوگرافياييێكانى هەر ناوچەييێك سوپا كشاوەكە پێياندا دەروات.. بزانێت و.. هەروەها تەبيعەتى دانيشتوان لەو كۆمەڵگەو شارو ئاواييانەداو.. وەزعە ئابووريى و كۆمەڵايەتيى و هەواداريى سياسيشيان بزانێ.

پێويستە هەر زووبەزوو هەموو ئەمانە بزانرێ.. بەرلەوەى سەركردە بە سوپاكەيەوە ئەم كشانە خێراو ناچارييە دەستبداتێ.. ديارە سەروبەندى كشانەكە ئەو بوارەت ناداتێ بەشێنەيى زانيارييێكان فێربيت."

(لی-شیان)یش وتویێتی:

"دەبێ ئازاترینی ئەو ئەفسەرانە هەڵبژێرین.. ئەوانەی لەهەموویان زیرەکترو رۆشنبیرترو تۆکمەترن‌و.. لە پیشە عەسکەرییێکەشدا شارەزاترن.. رێنماییێکانی ناوچەکە بخەینە بەردەستیان‌و.. لێگەڕێین بۆخۆیان تاوتووی ئەو رێگەوبانانەی بەردەمیان بکەن‌و.. لە هەقیقەتی ژیان‌و تەبیعەتی کۆمەڵ.. لەو ناوچانەی سوپاکەمان بۆیان دەکشێ ئاگادارین.

لە حاڵەتی وەهادا.. پەنا وەبەر شاردنەوەو چاوورپاوو سەرلێشێواندنی هەواڵدزانی دوژمن دەبەین.. شوێن پێی وا دادەنێین بەرەو رێگەییێکی دی بڕوات.. نەك ئەوەی سوپاکەمان گرتویێتیەبەر.

لە هەندێ حاڵەتدا گەڵای درەخت وەبان کڵاوخوودەکانمانەوە دەنێین.. یان گوڵەگەنم.. یان هەرشتێکی دی لەوانەی بۆ سەرلێشێواندن‌و بەهەڵەبردنی دوژمن دەشێن..(کۆمۆفلاگ).. زوربەی کەلوپەلەکانمان لەنێو درەختە بەرزەکاندا.. یان لە جەنگەڵەکاندا.. یاخود لە کێڵگەکانی گەنم‌و گوڵەبەرۆژەدا دەشارینەوە.. تا دوژمن لە قوللەکانی چاودێرییێوە.. یان بەهۆی حەسحەس‌و هەواڵدزانییێوە – ئەوانەی دوژمن بۆ چاودێری جموجوولەکانمان هەر دەبێ بیاننێری– پێمان نەزانێ چی دەکەین.

بە درێژایی رێ ورۆیشتنەکەمان دەبێ زیتەڵەو وریابین‌و.. دەبێ سڵ لە هەموو جووڵەو دەنگ‌و دیاردەییێکی دوورو نزیك بکەینەوە.. نەبادا لەنکاو تووشمان ببێ بە تووشی شتێکەوە.. لەوانەی هیچ حسابێکمان بۆ نەکردوون.. یان لەو هەقیقەتانەی لە نەخشە جوگرافیا

عەسکەرییەکانماندا شرۆڤە نەکراون.. یاخود رێنماییکەرە ناوچەییەکەمان پەیی پێنەبردوون.

ئەمە ناچارمان دەکات هەموو شوێن پێیێکی سەر زەوی هەڵگرین.. چ هی مرۆڤبێ یان هی حەیوان.. لە سەر تەختایی خاکدابێ.. یان لەسەر تاشەبەردو بیرەکانی ئاو.. لە پاشەرۆکی ئەسپ و حوشتر.. یان شوێنەواری دیکەی گوێ بیرەئاوو سەر رێگەوبانەکان.. تا بزانین ئاخۆ ئەم پاشماوانەی ماونەتەوە کۆنن یا نوێ !.. لەمەیشەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوێت و بزانین ژمارەی ئەوانەی سەر بیرەکان چەند بوون و.. ئەو ئاژەڵانەی لەگەڵیاندابوون و بەکاریانهێناون چی بوون و.. چ جۆرە ئازووقەیێکیان لێبارکردوون.

هەروەها چاودێری باو ئاووهەوا بین.. سەرچاوەی کانی و روبارەکان بپشکنین و بزانین ئاخۆ وەستاون و چاوەڕیی تۆفانن.. یان هەڵدەقوڵێن و شەپۆلدەدەن و.. بەرلەوەی بگەینە ئەوێ زریان هەموویانی بووژاندۆتەوە.. هەمدیسان بۆئەوەی بزانین ئایا دوژمن ئەم روبارو کانیاوانەی بەکارهێناوە یان نا!"

(هو-یان-هسی) وتویەتی:

"ئەگەر فەرمان بۆ سەرکردەی هەڵمەتێکی عەسکەرییانە دەرچوو.. تا بەخێرایی بەرەو لایێك بکشێ..

جگە لە بێبایێخترین زانیاریی هیچی دی لەدور تەبیعەتی زەوی و کلتووری خەڵکەکەو رەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی نەزانێ.. دەبێ ئەم جۆرە فەرمانانە.. تا لەلایەن سەرکردەی هەڵمەتە عەسکەرییەکەوە.. نەخرێنە ژێر لێکۆڵینەوەی وردو ساغکردنەوەوی تەواوی ئاگاداری و زانیارییێکان.. یێکسەر رانەپەڕێنرێن.

ئەگەر سەرکردایەتی بە هەڵەشەیی و بێئەوەی لە هەموو ئەو زانیاریانە تێبگات.. کە وەك شتە ڕێخۆشکەرە سەرەتاییەکان و هۆکارە سەرەکییەکانیش بۆ کشانێکی عەسکەرییانەی سەرکەوتوو پێویستن.. ئەوا ئەنجامەکانی بەڕادەییەکی پەسەند نەك هەر مسۆگەر نابێ.. بەڵکو دەشێ بشبێتە مایەی داخ و ئازارو پەشیمانیی.

چونکە پێداویستییەکانی سوپای کشاو(بۆ هێرشیردن) لە پێداویستییەکانی سوپای مۆڵگەخواردوو(بۆ بەرگریکردن) جیاوازە.. بەتایبەتی لەوەدا دەبێ پێشبینی ئەوە لە دوژمن خۆیشی بکەین.. پەنا وەبەر فێڵ و تەڵەکەو چاووڕاوی عەسکەرییانە لە خاك و ناوچەییەکدا بەرێت.. کە دەزانن ئێمە تێیدا غەریبین.. یان نازانین ئاستی ئامادەباشی و خۆقایمکردنەکانیان تا چەندەو چیها نەخشەو داووتەڵەکەیان بۆ فەوتاندمان ناوەتەوە!

ئەگەر نەخشەکانی کشانەکەمان.. بەپێی بنەماکانی هونەری کشان ناتەواوبوون و.. پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی بەردەوامبوون و.. ڕێنماییە زەرووریێکانی بەر لە کشانە عەسکەرییەکەمان دابین نەکردبوو.. ئەوا دوژمن بە ئاسانی دەتوانێ پەی بەوە ببات.. زانیارییەکانمان چەند هیچوپووچن و.. سەرکردایەتییەکەمان چەنێ گەوجەو.. ئامادەباشیمان چەنێ خراپ و کورت و کوێرەو.. تا چەندیش ئەو شتانەی پێویستن هەر زووبەزوو بیانزانین.. هیچیان لێنازانین و.. بە نەفامی تێوەگلاوین.

کێشەکە لێرەدا کێشەی جوامێری و پشوودرێژیمان نییە لەسەر بەرگەگرتنی دەردیسەری و ناڕەحەتی سەروبەندی کشانەکەمان..

بـەڵکو کێشـەی ئـەو مەترسـیانەیە بـەهۆی داوو فـێڵو تەڵەکەبازییـە جۆراوجۆرەکانی دوژمنـەوە دووچاریان دەبین.. فێڵو تەڵەکـەش هـەر دەبێ بەسەر جوامێری‌و گیانفیداییدا زاڵبێت.

ئەگـەر بـە وردی ئـەوە نـەزانین چۆن خۆمـان ئامادەباشـی فیکـری‌و پراکتیکی بۆ کشان‌و کێبەرکێ

دەکـەین.. ئـەوا ئێمـە لـە دەعبـاییێکی زەبـەلاحی ئـازاو بـەهێز.. وەلێ سەرخۆش‌و بالآنس شلۆق‌و شێواو زێتر هیچی دی نین.. کە منـداڵێکی گچـکە بتـوانی بـە هەڵەیـدا بـەری‌و رێگـومکێی بکـات.. یـان بـەرەو چاڵ‌وچۆڵی‌و هەڵدێری ببات‌و.. بیخاتە فەلاکەتەوە.

ئــەو سـوپایەی بێئــەوەی زانیارییــە بنەرەتییــە زەروورییێکــانی تەواوکردبێت.. دەستدەداتە پرۆسـەی کشـان.. وێـڕای ئەوەی خـاوەنی تفاقێکی زۆر گەورەو.. ئامادەباشیێکی هێجگـار تـەواوو.. ئازایـەتی لـە رادەبــەدەرو.. ورەی هـــەرە بەرزیشـــبێت.. ســـوپاییێکی شـــپرزەو شێواودەبێت.

ئــەو ســوپایە -هــەر بەنوونــە- شــەو لــە ناوچــەییێکدا لایــداو مۆڵگەیخوارد.. بێگومان پەشێوی‌و دڵەڕاوکێ دایدەگرێ.. چونکە هیچ لە تەبیعـەتی ئـەو دەڤـەرە نـازانی‌و.. نـازانێ چ جـۆرە جرِوجانـەوەرێکی ژەهراوی تێدا دەژی.. یان چ دێهات‌و کۆمەڵگەییێك‌و.. چیها شتومەك‌و دەعبای سەیرو سەمەرە لەو ولآتە غەریبەدا دەژین‌و هەن.

هـەر جووڵییێـك یـان دەنگێـك لـە تاریکـە شـەوداو.. لـە جێگـەییێکی نـەزانراودا.. دەبێتــە مایــەی خســتنەوەی دڵــەڕاوکێییێکی گــەورە بـۆ

سوپاکە.. ئەو دڵەڕاوکێیەی بەشێك لە ئازایەتی.. بگرە زوربەی ئازایەتی و بوێری لە دەروونی جوامێراندا دەپووکێنێتەوە.

ئەمجۆرە سەرچڵیانە.. لە تاریکایی نەزانینەوە سەرچاوە دەگرێ.. نەزانینی ئەو شتانەی پێویستە هەر زووبەزوو بزانرێن.. ئەمەیش بەتەواوی بەو سەرچڵیانە دەچێ شێرو پڵینگان لە خاکێکدا دەیکەن.. پڕە لەو تەڵانەی مەرگی موحەقەقیان تەنانەت بۆ شێرو پڵینگانیش پێوەیە.

کەواتە هەڵەیێکی زۆر ناشیرینە.. بەنێو خاکی دوژمنێکدا بکشێین.. بێئەوەی شارەزاییێکی تەواوو وردمان بەهەموو لایەن و بارودۆخ و وزەو توانا و خاڵە لاوازەکانی هەبێت.. هەروەها شارەزایی سروشتیی و بەشەریش.

دوژمن لەنێو خاکی خۆیدا لە چەندین رووەوە جیاوازیی پەسەندی بەسەر ئێمەدا هەیە.. ئەو بەباشی شارەزای شاخ و دۆڵ و روبارو کانیاوو پێچ و پەنای وڵاتەکەیەتی و.. دەشتوانێ خۆی بەباشی تێیاندا قایمبکات و.. داوو هەڵدێری کوشندەشمان بۆ بنێتەوە.

دوژمن لە خاکی خۆیدا لە ئێمە باشتر شارەزای مەودای رێگەو توولەڕێکانەو.. دەزانێ کامیان سەخت و رەقانەو.. کامیان خۆشڕەوو ئاسانە.. دوژمن لە ئێمە باشتر لە تەبیعەتی شارو دێهاتەکانی شارەزایە.. هەروەهاش لە رووی بەپیتی خاك و لەوەڕگەو دامەزراوەکانی ئاودێری و.. ناوچە زۆنگاوەکان و.. شوێنە فرە خۆراك و ئاو.. بۆ پێداویستییێکانی بەرگریی.. یان پێداویستییێکانی بەرەوپێشەوە کشان.

هـەموو ئـەو زانیـاریو هەقیقەتانـەی دوژمـن لـەنێو ماڵیخۆیـدا هەیـەتی.. نـە بەتـەنێ تایبەتمەنـدێتی پەسـەندتریان لـەڕووی هێـزو توانـای عەسـکەرییێوە دەداتـێ.. زێتر لـەوەی سوپای بۆ ئەو مەڵبەنـدە کشـاو هەیـەتی.. نـە هـەر ئەمـە بـەڵکو ئـەو وزەو توانـاو زانیـارییو زانسـتو زانینـەش.. کـە تەواوکـەری هێـزە عەسـکەریەکەن.. ئـەو شێوەیەی لە خوارەوە شرۆڤەی دەکەین.. دەیانداتێ:

"زانسـت دەسـەڵاتە –تەنانـەت بەسـەر ئـەو جوامێرانەشـەوە بـە عەزەڵاتـەکانی بـازوو و چـەکەکانیاندا دەنـازنو.. قەشمـەریی بـە دەمارەکانی فیکرو چەکەکانی زانستو مەعریفە دەکەن.

١٢– جەنگ پشت بە تەڵەکەبازیی دەبەستێت.. ئەگەر هێرشـەکەت بە مەبەستی کوشتاربوو.. با ئەو جموجووڵـەت لـەپێناوی قۆستنەوەو بەدەستخسـتنی دەسـتکەوتێکدا بێـت لـەو بڕوایـەدای بـۆت دەرەخسـێت.. ئـەوجا هەلومـەرجو هەڵوێسـتی وا بخولقێنـە سـەر لـە دوژمن تێکبداتو.. نەتوانێ پەی بە مەبەستەکانت ببات.

١٣– ئەگـەر تـۆ هێرشـت دەسـتپێکرد.. مانەنـدی گـەردەلوول خێرابە!.. ئەگـەر بە کاوەخۆ کشـایت.. یێکپارچەو یێکگرتووبـە.. با شکۆدارییو مەزنییێکەت بەوێنەی شکۆو مەزنیی بێشەڵان بێت..

ئەگـەر هێرشـەکەت بۆ تـەمێکردنو ورەپێبـەردانی دوژمـن.. یان بـۆ دۆزینـەوەی خاڵـە لاوازو بـەهێزە شـارراوەکانی بـوو.. بـا شـاڵاوەکانت چـوون ئاگربێـت هەرچـی دێتـەڕێ هەڵیلووشـێ.. یـان وەك هەورەبرووسـکە بێـت.. لـەپڕ لـە چـاوتروکانێکدا لێـدەداتو.. بـە کورتترین کات بەزەبرترین داخ بە دڵی دوژمنەوە دەنێ.

١٤- ئەگەر بەئەنقەست ئەمجۆرە شالاوەت برد.. هەوڵبدە هێزە جەنگاوەرەكانت بەسەر چەند دەڤەرێكدا دابەشبكەيت.. ئەوجا بەڕاستو چەپدا دەست مەپارێزەو.. لە خاكەكەی خۆێدا گەورەترین سویێ بكەرە جەرگی دوژمنەوە .

١٥- با هێرشەبردنەكە بەو تۆژینەوانە پشت قایمبێت.. هەر زوو لەمەڕ ئەو شوێنانە كراون خوازیارن وێرانكرێن.. نەك وەك كوێر پەلبكوتیێو نەزانیێ بەرەو كویێ دەچیێو.. دوایی چۆن دەگەڕێتەوە.

١٦- ئەوەی بنەماكانی شالاوو هەلاتنی هەنووكەیی(كر وفر) دەزانیێ.. ئەوەی دەزانیێ راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ شەڕبكات (مەبەست لە جەنگی فەرمی-رەسمی -و.. هێرشو تۆقاندنو تەمێكردنی عەسككەرییانەیە).. سەركەوتن بۆ خۆی بەدەستدێنیێ.. ئەمە لە شێوازەكانی هونەری (موناوەرە -كێبەركیێ)دایە.

١٧-لە كتێبی ( كارگێڕیی عەسكەریی)دا هاتووە:

"دەنگی لە گەروو دەرهاتوو لەنێو شەڕدا لاوازو كزە.. لەبەرئەوە تەپڵ لێدەدرێت.

چاوی مرۆڤ توانای ئەوەی نییە بە دروستیی هەموو پانیو بەرینی جەنگەكە ببینیێ.. لەبەرئەوە ئالاو بەیداخو جیفرەو رێنمایی تایبەتیی عەسكەریی بۆ پێوەندییێكانی نێو هێزە عەسكەرییێكان بەكاردەهێنرێت.

سەرلێشێواندنو لەون لێگۆڕینو بەكارهێنانی نهێنیو هێماكان لەمجۆرە پێوەندییە فیكرییەدا.. لەهونەری جەنگدا بە پێگە گەوهەرییێكان دادەنرێت.

١٨- ئــەم هێمــا و بەیداخشــەکاندن و تەپڵلێدانانــەو.. هــەموو هۆکــارێکی دیکــەی ئــەو پێوەندیکردنــە فیکرییانــەی ســەرکردایەتی بەکاریانــدێنیٚ.. لەبەرئەوەیــە شــێوازی هەڵســوکەوت و رەفتــاری سەربازەکان لە مەیدان و پشت مەیدانی جەنگیشەوە رێکبخات.

سەرکردایەتی لە بەجوانی گەیاندنی ئەم گفتوگۆ و ئێماژانەدا چەند وردبــین و لێزانبــیٚ (لــە فەرمانپێــدان و راپــۆرت وەرگرتنــدا لەگــەڵ یێکــەکانی ســوپادا).. هێنــدەش وزە و توانــای سەرتاســەریی هــەموو سوپاکە باشتردەبێت.

بەمجۆرە.. هێزە جۆراوجۆرەکانی سوپا هاوتای یێکدی دەبن و.. هەرییێکــە پشــت بەویــدی دەبەســتیٚ و.. نــە جــوامێر لەخۆییــەوە بەرەوپێشەوە دەچیٚ و.. نە ترسنۆك بەبیٚ فەرمان دەکشێتەوە.. بەڵکو ئەگەر دوژمن زۆری بۆترسنۆك هێنا..جوامیر بەهانایەوە دەچیٚ.

(مۆ-تۆ)وتویێتی:

"یاساکانی جەنگ ئائەمە دەڵێن:

"ئەگــەر -بەنموونــە- ســەرکردە فــەرمانی هێرشــبردنیدا.. وەلیٚ دەســتەییێك بــەپێی فەرمانــەکانی ســەرکردە هەڵســوکەوتیان نــەکرد و فەرامۆشیکرد..

ئەگــەر تاقمێــك بێگۆێدانــە فەرمانــەکانی ســەرکردە لەخۆیانــەوە هەڵسوکەوتیانکرد..

لــە هــەردوو حاڵەتــدا -راپەڕانــدنی بــیٚ فــەرمان و پشتگوێخســتنی فەرمان-.. سەرکردە هەقێتی سەری هەردوو دەستەو تاقمەکە ببڕێت"

کاتێ (ڤۆ-چی) دژی (شین)ی دوژمنی دەجەنگا.. ئەفسەرێکی زۆر بەجۆش‌و خرۆش‌و پەرۆش لەنێو سوپا کشاوەکەیدا هەبوو.. بەبێ فەرمانی سەرکردەو هەر بەخۆی هەڵمەتی بەرەو ریزەکانی دوژمن برد.. دوانی لێکوشتن‌و بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە..

بەڵام سەرکردە تووڕەبوو.. فەرمانیدا سەری ئەفسەرەکە ببڕن.. گەورە ئەفسەرێك ویستی بۆی تێکەوێت‌و بە سەرکردەی وت:

-ئەم ئەفسەرە لە چاکترینی ئەفسەرەکانمانە.. خاوەنی بەهرەی عەسکەرییانەی سەرسووڕهێنەرە.. رابردوویێکی شکۆداری لە پاڵەوانێتیدا هەیە.. تکات لێدەکەم بیبەخشیت.. چونکە ئەو کارێکی بەدمەبەستانەی نەکردووە.. بەتەنێ وەڵامی ئەوەی داوەتەوە جوامێریی خۆی‌و جۆش‌و خرۆشی نێو دڵ‌و هەناوی داوایانلێکردووە.

لە وەڵامیدا وتی:

-هیچ گومانێکم لە جوامێری‌و لەو دڵسۆزی‌و پەرۆشییە جوانەو لە بەهرەمەندیی بەرزی ئەو ئەفسەرە نییە.. وەلێ ئەو کارەی ئەو کردی گاڵتە بە نیزامکردن بوو.. گاڵتە بەو نیزامەی بنچینەی هێزی عەسکەرییە.. بۆیێ دەبێ باجەکەی بدات‌و.. بۆ هەموو ئەوانی دی لەسوپادا ببێتە نموونە."

١٩- لە شەڕە شەوانەکاندا.. بۆ پێوەندی فیکریی.. لەنێوان هێزە جۆراوجۆرەکانی سوپادا.. مەشخەڵ‌و تەپڵ بەکاردەهێنن.. هەروەکو چۆن بەیداخ و ئاڵا لە رۆژدا بەکاردەهێنن.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"پێکهاتە عەسکەرییێکان لە دەستەی بچووکتر پێکدێن.. هەروەها هەموو ئۆردووگە جەنگییێکەش لە ئۆردووگەی گچکە گچکەی نێو ئۆردووگە گەورەکە پێکدێت.

ئۆردووی گچکە لەدواوەو لە پێشەوەو لە قۆڵی ڕاست یان قۆڵی چەپەوە هەن.. هەمووشیان لە ڕووی پێوەندییێکانیانەوە پابەندن بەو ئۆردووە سەرەکییەی سەرکردایەتی سوپای تێدایە.

لێرەدا نووسەری چینی شرۆڤەی تەرتیبکردنی گچکە ئۆردووۆکان لەنێو مەعەسکەرە گەورەکەدا دەکات.. بەشێوەی ئەڵقەیێک کە سەرکردایەتی تێیدا دەکەوێتە چەقی ئەڵقەکەوەو.. هەر لێرەوە ئەرکی هەر یێك لە سەرکردایەتیی گچکە ئۆردووۆکان.. بەپێی ئەو بڕیارو فەرمانانەی لە سەرکردایەتی ناوەندییێوە دەردەکرێن دیاریدەکرێت و ئەرکیان پێدەسپێررێت.. چ لە کاتی شەڕداو چ لە سەروبەندی خۆ بۆ شەڕ ئامادەکردندا."

٢٠- هەندێجار وادەبێ.. سوپا لەوپەڕی ئامادەباشیدایەو.. لەڕووی پیاوو تفاقەوە گەورەوگرانە.. وەلێ سەرکرایەتییێکی کلۆڵ و بێئاگاو ترسنۆك ورە داوەشاوی هەیە..

(هو-یان-تسی) فەرموویەتی:

"لە جەنگەکاندا چارەنووسی ملیۆنەها گیان دەکەوێتە دەست تەنیا کەسێك.. ئەویش سەرکردەیە.. ئەو دەستەی تیری نیشانپێکی گشت هێزە عەسکەرییێکان دەوەشێنێ هەر ئەوە.. ئەو ڕۆحەی گوزارە لە هەموو وزەو توانای سوپا دەکات هەر ئەوە.. ئەگەر سەرکردە

لەڕووی ورەو کولتووری عەسکەرییەوە لاواز بوو.. ئەم لاوازییە بەنێو هەموو هێزە چەکدارەکانی ژێر فەرماندەییدا تەشەنەدەکات."

**(مای-یاو-چان) وتویەتی:**

"ئەگەر ورەی سوپا رووخا.. سەرکرایەتییەکەیشی ورە بەردەدات."

**(چانگ-یۆ) وتویەتی:**

"تاکە ئامێرێك دەبێت سەرکردە هەیبێت.. دڵو دەروونێکی ساغو دروستە.. جوامێریی و ترسنۆکیی.. نیزامو شپرزەو شێواوی... گشتیان پابەندی دڵن."[27]

دڵی تەواوو دروست.. دەتوانێ لە جوانترین هەلومەرجدا جڵەوگیری بکات.. هەروەکو چۆن دەتوانێ جڵەوگیریی کلۆڵترین بارودۆخیش بکات.

هەر ئەو دەتوانێ ئاژاوەو پشێوی بخاتە نێو ریزەکانی دوژمنەوە.

هەر ئەو دڵە بێخەوشە دەتوانێ هێزێکی کەم.. بکاتە هێزێکی بەتواناو دلێرو بەرگەگری پتەو.. هەروەها دەتوانێ ئازار بەدوژمن بگەیەنێو.. وزەو تواناکانی بۆشو فشۆڵ بکات.. تەنانەت ئەگەر لە رووی چەکەمەنیو ژمارەی جەنگاوەرانیشیانەوە لەمان زێتربن.

---

[27]- بەپێی ئەو گوزارانەی لێرە (هونەری جەنگ)دا دەربڕاون.. وا دیارە مەبەستی دانەر لە وشەی (دڵ).. ئەوەیە کە لەم سەردەمەدا بە (مەعنەویات) یان بە (ورە) ناویدەبەین.

سەرکردەی لێزان ئەوەیە دڵ (ورە) لای دوژمن ناهێڵێ.. یان ترس و لەرزو پشێوی و ئاژاوە لەنێو دڵی دوژمندا دەچێنێت و.. توانای دوژمن لە هەڵسوکەوت و ئەنجامگیری نەخشەو پیلانەکاندا لەرزۆك دەکات."

٢١- ورەی سەرباز لە ساتەکانی سەر لە بەیانیدا زۆر بەرزە.. بەتایبەتی بەیانی زوو.. لە ساتەکانی نیوەڕۆ (یان دەمەدەمی نیوەڕۆ)دا کەمترە.. ئیدی تا بەرەوئێوارەو شەو بڕۆین.. ورەی سەربازەکان دەپووکێتەوەو.. دەکەونە بیرو خولیای ماڵ و حاڵ و دۆست کەسوکار.

٢٢- ئەگەر سەرباز پێڕەوی نیزامێکی پەسەندی کرد.. دەتوانێ ئاژاوە وەنێو ریزەکانی سوپای دوژمنخات.

ئەگەر خوتوورەی زەین و دڵی سەرباز لەدور حاڵ و گوزەرانی کەسوکارو دۆستان تەخت و بێخەمبوو.. ئەوا بەبڕواو جۆش و خرۆشەوە بەرەو شەڕو کوشتار دەچن.

هەموو ئەمانەش پابەندن بە دابینکردنی کەشوهەوایێکی فیکریی لەبارەوە بۆ سەربازان.

**(مۆ-تۆ) فەرموویەتی:**

"کاتێ دڵنیایی لەنێو دڵ و فیکری سەربازاندا جێگیردەبێت.. ئەوا کارەساتە (جەنگی)کان هەرچەندێ سەختبن.. ورەیان ناڕووخێنن."

**(هو-یان-هسی) فەرموویەتی:**

"ئەرکی تاکە سەرکردایەتی بەرامبەر ملیۆنێك سەربازی دلێر.. دژی دوژمنێ ئەویش هەر خاوەنی سەربازی دلێر بێت.. ئەرکێکە تێیدا خەسڵەتە پەسەندەکە تێکەڵاو بە گرفت و ماندوێتی دەبێت.

ئەم ئەرك‌و بەرپرسێتیە.. ئەوە بەسەر سەركردەدا دەسەپێنیٚ.. فەرمانبدات‌و نەهێڵیٚ‌و.. قوربانیدان یان هەڵمەتبردن‌و هەڵاتنی خێرا (كەڕو فەڕ) بەسەر سەربازەكاندا فەرزكات.. هەروەها ئەوانەی لە دووتوێی ئەم بەرپرسێتییەدان.. وەك: پەنا وەبەر توندوتیژی‌و نەرم‌و نیانی‌و دانایی بردن.. لەگەڵ زیتەڵیی سەركردەدا بۆ قۆستنەوەی هەر دەرفەتێك ببێتە مایەی سەركەوتن وەدەستهێنان.

ئەگەر سەركردە دڵڕەحەت‌و ئەعساب پۆڵایین‌و زەین دووربین‌و قووڵ دانا نەبوو.. ئەگەر توانا و زانینێكی قووڵ‌و رەسەنی لە هونەرەكانی جەنگ‌و خەسڵەتە كەسێتییێكاندا نەبێت.. ئەوا هەڵسوكەوتەكانی سەركردەو حوكم‌و تەگبیروڕاكانیشی بە دڵەڕاوكیٚ‌و پەشۆكاوی دەبن‌و.. بە بڕیاردانێكی راست‌و دروست پشتقایم نابن.

ئەگەر سەركردە ئەم خەسڵەتانەی تێدا نەبوو.. هەركە كێشەو گرفتەكانی كەڵەكە بوون ئارامی لەبەر هەڵدەگیریٚ.. هەركە ئەرك بەرپرسێتییێكانی بۆ چارەسەركردنی گرفت‌و كێشە بەرودواكان زێتر بوون.. هێمنی‌و سەنگینی خۆی وندەكات‌و.. هەر بەڵاییێكی تووشهات ترس دایدەگریٚ.. هەر گرفت‌و رووداوێكی لە رووداوە گرینگ‌و هەروەها هیچ‌و پووچە جۆراوجۆرانەشی هاتەڕیٚ.. لەوانەی هەمیشە ئەو سەركردانەی ئەركی هەڵسووڕاندنی كاروباری سوپایان لە ئەستۆیە تووشیان دەبیٚ.. ئەوا پەشێوی دایدەگریٚ‌و سەری دنیای لێدێتەوە یێك.

٢٤-ئەم ئەركە سەركردایەتییە.. وا لە سەركردە لێزان‌و ئەهلی كارەكان دەكات.. هەردەم ئەو سەربازانەی لەژێر فەرماندەییاندان..

هەمیشە لە ئامادەباشیی ئەوەدابن.. دوژمنێك داوو تەڵەكەی مەرگی بۆ ناونەتەوە.. ئەمجا دەبێ لە دوژمن خێراتر بگەنە شەڕگە -نەبەردی شەڕ-.. تاكو ئەمان لەوێوە چاوەڕوانی دوژمن بكەنو.. دڵنیابن لە سەلامەتیی جێگەكەیانو.. فرەیی خۆراكو پێداویستییە جەنگییێكانیانو.. لەهی دوژمن زێتربن.. (یان لانیكەم هاوشانی خۆراكو تفاقی دوژمنبن).

ئەم ئەركە..یان بە رێكخستنو جڵەوگیریی رووداوو هەلومەرجەكان دێتەدی.. یاخود بەهۆی ئەو هۆكارە شروشتی (فیزیكی)یانەی دەورو بەری پرۆسە جەنگییێكان دەدەن.

٢٥- سەركردایەتی لێزانو شارەزا.. بەبێ پشكنینو لێوردبوونەوەو تاوتوێكردنی وزەو توانای دوژمن .. فەرمانی عەسكەرییانەی سەرپێیی دەرناكات.. دەبێ بزانێ داخوا هێزو تواناكانی بە پوختی لەنێو تەشكیلاتە عەسكەرییێكانیدا رێكخراوە.. یاخود ئەو وزەو توانایانەی بە كفتو داهێزراوی وان لەنێو تەشكیلاتە عەسكەرییە بێسەرو بەرەكانیدا.

ئەم ئەركانە.. ئەركگەلێكن هان لە ئەستۆی ئەو سەركردایەتییە چالاكو نەرمونیانو ململانێزانەدا.. كە دەچێتە ژێرباری رێكخستنكاریی و جڵەوگیریی هەلومەرجو ئاڵوگۆڕەكانەوە.

٢٦- ئەگەر دوژمن لە مەیدانی جەنگدا.. بەرزاییێكانی خستبووە ژێر ركێفی خۆیەوە.. -بێگومان ئەو بەرزاییانە ئەو خەسڵەتەیان پێدەبەخشێ بەتۆكمەیی كۆنترۆڵی تەبیعەتی زەوییێكە بكەن.. بۆیێ لەم حاڵەتەدا دەبێ سەركردە خۆی لە تێوەگلان لەگەڵیدا بپارێزێ.

ئەگەر دوژمن لە شوێنێکدا دامەزرابوو.. گردو بەرزایی پشتیوانی بوو.. هێرشی بۆ مەبە.

٢٧-ئەگەر دوژمن خۆی وەك هەڵاتوو نیشانداو.. زانیشت هێشتا توانای هێرشهێنانیشی هەیە.. راوەدووی مەنێ و دوای مەکەوە.

٢٨- خۆت لە هێزە عەسکەرییە نایاب و دەستەبژێرەکەی دوژمن بەدوور بگرە.. یا لەگەڵیدا تێوە نەگلێی.

٢٩- دەشێ دوژمن داوت بۆ دانێ و.. چەشەت بۆ بە نووکی قولاپەوە بکات.

(مای-یاو-چان) فەرموویەتی:

"ئەو ماسییەی چەشەکە قووتدەدات دەست راوچی دەکەوێت.. ئەو سوپایەی لە ململانێکەی دوژمندا چەشەکە قووتدەدات.. دەبێتە پێخسیری دەستی ئەو دوژمنەی."

هەروەها (چانگ-یۆ) وتوێتی:

"لە کتێبی (سێ پلە لە زۆرزانیی عەسکەریدا) هاتووە.. تا چەشەی قولاپەکە فریودەرتر بێت.. تەمەنی ماسییەکە کورتتر دەبێت."

٣٠- دوای تێکشکانی دوژمن و کشانەوەی بەرەو هەوار (دیار)ی خۆی.. رێی لێمەگرە.

٣١- نەکەی هەرگیز لە هەموو لاییەکەوە ئابلووقەی دوژمن بدەی.. یا لەلاییێکەوە دەربازگەییێکی هەڵاتنی بۆ بمێنێ.

(مو-شو) وتوێتی:

"لە گەمارۆدانی دوژمندا.. لێگەرێ با رێگەییێك بمێنێ.. تا ئومێدێکی بە دەربازبوون بمێنێ.. یا هەست بەوە بکات هێشتا بوارێك

بۆ له مەرگ قوتاربوون لەئارادایه.. ئەوجا كه پەنایبردەبەر هەڵاتن لەو رێیەوه.. لێیده..."

(هو-یان-هسی) وتوێتی:

"كاتێ (تساو) هێزەكانی دوژمنی له شاری(هۆ-كوان)دا ئابڵووقەدا.. له سەرەتای گەمارۆكەدا.. سەركردەی گەمارۆدەر ئەم فەرمانەی دەركرد:

(هێزەكانی دوژمن لەسەر زەوی قڕتێدەخەین و.. لاشەكانیان تووڕدەدەینه دەریاوه.. دەرزێكی وایان دادەدەین بیریان نەچێنەوه...)

وەڵێ گەمارۆی شارەكه چەند مانگێكی خایاند.. هێزەكانی شار گیانفیدایانه بەرگرییان كردو.. به ئارامیشەوه بەرگەی دەردیسەرییێكانی ئابڵووقەكەیان گرت..

هاوەڵێكی (تساو)ی سەركردە هاته لای و پێیوت:

با لێگەڕێین ئەم شاره ئابڵووقەدراوه دەرفەتێكی هەبێت.. خەڵكەكه و هێزه عەسكەرییێكان هەستبكەن رێگەییێكیان بۆ قوتاربوون لەمەرگ و فەوتوفەنابوون بۆ ماوەتەوه.. تۆ هەڕەشەی مەرگت لێكردوون.. پێتوتن لەسەر زەوی گەسكیان دەدەیت و لاشەكانیشیان تووڕدەدەیته دەریاوه.. لەبەرئەوەیه ئاوا گیانفیداو لێبڕاوانه دەجەنگن و.. بۆ بەرگریی بوونەته شێری مەیدان و.. مادام تۆ پێتوتوون چارەنووسیان بەدەستی تۆ له مەرگ زێتر چیدیكه نییه.. ئەوا ئەوانیش پاڵەوانانه دەجەنگن و خۆیان بەكوشت دەدەن.

ئەم شارەی گەمارۆتداوه.. لەشداهێزراو و كفت و كەنەفت نییەو.. له رووی تفاق و داهات و هێزو توانایشەوه كەمی نییه.

ئەگەر هەروا لەسەر ئەم ئابلۆوقەدانە تۆکمەیە بمێنینەوە.. ئەوا ئێمەیش لەڕووی خەرجیو ورە ڕووخاوییەوە کفتو کەلەلادەبین.. هیچ شتێ بۆ سوپا هێندەی ئەوە ستەمو دزێو نییە.. مودەتێکی دووروودرێژ لەسەر سنوور لە چاوەڕوانیدا بێت. هەر ئەمەیشە دەبێتە مایەی گەندەڵیی خستنە نێو ریزەکانی ئەفسەرو سەربازانەوە.

ئەگەر لە هێرشبردنە سەر شارەکە لە هەموو لایێکەوە دەسپێشخەریمانکرد.. پارێزگارانی شارەکە لەپێناوی بەرگری لێکردنیدا جوامێرانە خۆیان بەکوشت دەدەن.. دەردێکی گران دەدەنە هێزەکانمانو زیانێکی گەورەشمان لێدەدەن.. هێزو تواناکانیشمان ئەوەیان لەباردا نییە لە کورتترین کاتدا هەموو شوورەکانی شارەکە تێکبشکێنن.

ئەی سەرکردەی گەورەم! نەخشەکەت لە گەمارۆدانی شارەکەدا لە هەموو لایێکەوە.. بەبێئەوەی لێگەڕێی دەربازگەییێکیان بۆ قوتاربوون بۆ بمێنێتەوە.. نەخشەییێکی هەڵەیە.. دەبێ پابەندی ژیریودانایی بیتو.. بنەماکانی هونەری جەنگیش پێرەوبکەیتو پێوەی پابەندبیت.. ئەمەیش وامان لێدەخوازێ.. لەلایەن خۆمانەوە واز لە هەستهەژاندنی دوژمن بێنینو.. هەرچی رێگەکانی دەربازبوون هەن لێیان دانەخەینو.. لە خۆمانیان بکەینی شێری مەیدانو.. جوامێرانە بەرگریبکەن.. یان هێرشبێنێنو.. بەرلەوەی لێیان هەڵگەڕێینەوە ئازارو زیانێکی زۆرمان پێبگەیێنن.

پەسەندتر وایە.. سەرلە دوژمن بشێوێنین.. یان قەناعەتی پێبکەین رێگەییێکی قوتاربوونی هەیە.. ئیدی هەر ئەو رێیەی گرتەبەر.. لێیدەە."

(تساو)ی سەرکردە بەگوێی یاریدەدەرەکەی کرد.. لە هەندێ لاوە ئابڵووقەی لەسەر لابرد.. لێگەڕا دەرفەتێك بۆ هەناسەدان و خۆدزینەوە هەبێ.. ئەمجا هەڵمەتی بردە سەر هێزەکانی و.. جەنگەکەی بردەوە."

۳۲-دوژمن لە هەموو لاییکەوە ئابڵووقە مەدەو.. هەرچی ڕێگەییێکی دەربازبوون هەیە لێیدامەخە.

**(تو-یو) وتوێتی:**

"لە (فۆ-شان) شا دەگێڕنەوە وتوێتی:

ئەگەر لە هەموو لاییکەوە تەنگت بە دڕندەییێکی کێوی هەڵچنی.. ئەوا لەپێناوی مانەوەدا.. بەرامبەر ئەو هێزەی دەستی ناوەتەبینی – هەرچەنێ کوێرانەو دڕیش بێت– زۆر لەخۆ بوردوانە پەلامار دەداو لێبڕاوانە ڕووبەڕوودەبێتەوە.

ئەم هەقیقەتە نە هەر بەسەر ئاژەڵدا.. بەسەر مرۆڤیشدا دەچەسپێ.

ئەگەر دوژمن لەوە بێگومانبوو هیچ دەرفەتێکی بۆ مانەوە لە هیچ لاییکەوە بۆ نەماوەتەوە.. ئەگەر ترسنۆکیش بێت.. هەر جوامێرانە دەجەنگێ و بەرگریی دەکات و.. تەنانەت ئەگەر لە ڕووی شارەزایی و زیرەکیشەوە لە خەڵکی کەمتر بێت.. هەرچی ڕێگەو بنەماییێکی زۆرزانی لەم بوارەدا هەیە.. هەموویان دەگرێتەبەر.. تا ئەو کۆتەی بەسەر سنگییێوەیە بیپسێنێ.

لە سەروبەندی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆر (هۆسان)دا.. هەڵمەتێکی عەسکەریانەی گەورەو گرانی ناردەسەر یاخیبوانی تیرەکانی (شیانگ) بۆ تەمێکردنیان.

یاخیبوان هەر بەمەیانزانی.. چی ئازووخەو تفاقی عەسکەریانەی قورسیان هەیە.. بەجێیانهێشتن‌و بە پەلە لە چیاو دۆڵەکاندا کەوتنە خۆقایمکردن‌و خۆدامەزراندنی عەسکەریانە.

سەرکردەی هەڵمەتە عەسکەرییێکە.. فەرمانی بە سوپاکەی دا.. بەکاوەخۆ بەرەو مەڵبەندی یاخیبوان بکشێن.

هەندێ لە هاوەڵانی بەمە پەست‌و ناڕازیبوون.. بە سەرکردەیان وت:

تۆ خاوەتی هێزێکی عەسکەریانەی زۆر لە هێزی یاخیبوان گەورەو گرانتری.. بۆچی دەستوبرد ناکەیت تا بیانگەیتێ‌و.. لووتیان بشکێنیت.. بەرلەوەی پشتی خۆیان قایمکەن‌و.. خۆیان دامەزرێنن.

سەرکردەی هەڵمەتەکە وەڵامیدانەوە:

ئەو دوژمنەی ئێمە بەرەوڕوویان دەبینەوە.. ئەو ئێستە لە هەڵوێست‌وحاڵێکی بەهێزو زۆر ترسناکیشدایە.. ئەگەر پەلەپرووزێیانە گەمارۆمانداو.. دەستمان نایە بینی‌و.. ترسوخۆفمان نایە بەری‌و.. ئومێدبڕاومانکرد.. بەمە ئەوپەڕی هێزو توانای شاراوەی دەورووژێنین.. بۆ ململانێکردن لەپێناوی مانەوەو ژیاندا.

ئەگەر دەستمان نایە بینی.. ئەوا ئەو بە گیانێکی لەخۆبوردوانەوە لە دژمان دەجەنگێ.. وا باشترە لێگەڕێین دەربازگەیێکی هەبێت.. لێگەڕێین ترسەکەی کەمێ برەوێتەوە.. با لێمان نەبێتە شێری مەیدان.

٣٣- ئەمانە پێگە گشتییێکانی هونەری کێبەرکێ (یان زۆرزانیی)ن.. لە بەکارهێنانی هێزی عەسکەریدا بەپەسەندترین شێوەو.. لە پەسەندترین هەلومەرجدا.. بۆ دۆزینەوەی پێداویستییێکانی پەسەندترین دەرفەتی سەرکەوتن لە بەرگریکردندا.. یان لە شاڵاوبردندا.

# بەشی هەشتەم

## نۆ چەشنە نەبەرد[٣٨]

[٢٨]– یـان (مەیـدانی جـەنگ) یـان (زەوی جـەنگ) یـان (هەڵبـژاردنی نەبـەردەکان).. یـاخود هـەر زاراوەییێکـی عەسـکەریی دی.. کـە لـە زمـانی عەسکەریدا بۆ ئەم چەمکانەی لەم بەشەی کتێبی (هونەری جەنگ)دا هاتووە بلویێ.. لەمەودواش لە بەشێکی دی ئەم کتێبەدا خوێنەر دەبینێ –دووبارە–

باس لە چەشنە ناهەموارەکانی زەوی جەنگ دەکرێت.. لێگەڕاین هەر بەو تەرتیبە ی لە دەقە ئەسڵییێکەدا هاتووە بڕوات.

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- کاتێ پاشا (یان دەسەڵاتی شەرعیی نەتەوە).. سەرکردەیێکی عەسکەریی رادەسپێرێ ئەرکی بەرگریکردنی عەسکەرییانەی.. یان هەڵمەتێکی جەنگییانە دژی دوژمن لە ئەستۆ بگرێت.. دەبێ سەرکردە بەتەنگ ئەم ئەرکە عەسکەرییانەوە بێت:

٢- لە خاکێکی نشێوی (جوگرافی)دا مۆڵگە نەخوات.

٣- پێوەنـدیو رێـی هاتوچـۆی بـەردەوامی لەگـەڵ هێـزە هاوپەیمانەکانی -کەسوکار.. پشتیوانان.. سوێندخواران.. هاوەڵان- فەرامۆش نەکاتو.. ئەوانەی بەتەمای هاریکاریکردنو کۆمەککردنی سەرکردەکەن لە شاڵاوە عەسکەرییێکەیدا.

٤- نابێ سەرکردە بێموبالاتانە هەرچی هێزەکانی هەیە.. لەو بەرەو شوێنانەدا بڵاویانکاتەوە.. کە هیچ خەسڵەتو بەهایێکی عەسکەرییانەیان نییەو.. لە خاکو نەبەردی راستەقینەی دوژمنەوە دوورن.

٥- پێویستە ئەو سەرکردەیەی هەڵمەتە عەسکەرییێکەی لە ئەستۆیە.. نەچێ زوربەی هێزە جەنگاوەرەکانی لە خاکێکی بێبەهاو بێبەرهەمی چۆڵەوانیدا کۆبکاتەوە.. کە هەر لە زووەوە رێی هاتوچۆو پێوەندیی خێرای بە جۆرێکی وا بۆ هەموار نەکرابێ.. رێگەوبانە زەروورییێکانی جموجووڵی عەسکەریی گورجوگۆڵانەی بۆ سوپا کشاوەکە بە باشی ئامادەو مسۆگەربێتو.. لە ئاسمانیشەوە بە ئاوو بەرهەمی رواو لەو چۆڵەوانییەدا بەهرەمەند بووبێو.. هەلومەرجی

شەڕ وای بەسەردا سەپاندبێ هەر ئەو جۆرە خاکە رووتەنە ببێتە نەبەردی سەرەکیی کوشتار.

٦- ئەگەر لە نەبەردی جەنگدا سەرکردە شوێ بینییەوە گیریخواردووەو.. لە هەموو لایێکەوە مەترسی مەرگو فەوتان دەوریداوە.. لە حاڵەتی وەهاداو.. بۆ دەربازبوون لەو تەنگژەیەی بەهۆی تەبیعەتی خاکەکەوە تێیکەوتووە.. ئەوا بەتەنێ گیانفیداییو خۆبەختکردن لە شەڕوکوشتاردا دەبێتە ئەرکی سەرشانی.

٧- هەندێ رێبازو کوێرەڕێ هەن دەبێ نەگیرێنەبەر.

چەندین هێزی عەسکەرییانە هەن دروست نییە هێرشبردنیان پێبسپێررێن.

گەلێ خاك دەبنە مەیدانی جەنگ.. وا پێویست دەکات خۆ لە تێوەگلانی شەڕی عەسکەرییانە تێیاندا بپارێزرێت.

( وانگ-هسی ) فەرموویەتی:

"پێموایە بەکارهێنانی جەنگاوەرە دەستەبژێرە پوختەکەی نێو هێزە عەسکەرییێکان (هێزە کانی بروسكو مەغاویر).. وەك چەشەییێکی دەم قولاپ.. کارێکی هەڵەیە.. بەتایبەتی کاتێ دوژمن خاوەنی هێڵێکی عەسکەریی تۆکمەبێت.. خاوەنی تەشکیلاتێکی زۆر قایمبێتو.. وزەو توانایشی لەوە پتەوتربێت هێزە مەغاویرەکانت بتوانن زەفەری پێبەرن.. ئەمجۆرە سەرەڕۆییە دەبێتە مایەی پەرشوبلاوبوونەوەو بەفیڕۆدانی وزەو توانای ئەو دەستەبژێرە پوختەی نێو سوپاکە.. کە بۆ هەلومەرجی لەبارو شیاوتر پێویستی پێیاندەبێت."

(مۆ-تۆ) وتویَتی:

"ئـەو حاڵەتـەی باسـکرا.. مەبەسـت لـە حاڵەتێکـە هێڵـی بـەرگری دوژمـن تێیـدا زۆر پتـەوو تونـدو تۆڵبێـت.. بـەهۆی خـۆ قـایمکردن لـەو شوێنە سروشتییە هێجگار سـەخت و.. بەربەسـتە تۆکمـەو مەزنانـەدا.. کـە زاڵبـوون بەسـەریاندا سـتەمە.. حاڵەتێکـە دوژمـن تێیـدا خـاوەنی دەزگـەو دامـەزراوی تۆکمـەو مەزنـە..خـاوەنی جـەنگاوەرو خـۆراك و ئازووخەی زۆرو تەواوە.

لـەم حاڵەتـە ئاسـاییبەدەرەدا.. هـیچ سـوودیٚ لـەوە نـابینم هێـزە عەسکەرییەکانم بەخۆڕایی بە قەڵبەیێکدا بدەم و.. شەڕەقۆچیان لەگەڵ تاوێرە بەردەکاندا پێبکەم و.. بێسوود قۆچەکانی سوپاکەم بە شکاندن بدەم.. بۆیێ ناهێڵم لەمجۆرە مەیدانبازییەدا خۆتێوەگلێنم."

٨- لـە سـەروبەندی شـەڕەکاندا.. سـەرکردە دەکەوێتـە حاڵـەتی وەهـاوە.. مـاف بـەخۆی بـدات سەرپێچـی فـەرمان و راسـپاردەکانی حکوومەتە دووردەستەکەی لەمەیدانی شەڕ بکات.. چونکە ئەو هیچ ئاگاییێکی لە وەزعی شەڕو ئاڵوگۆڕەکانی نییە.

ئەمە واتای ئـەوە نییـە لـە حکوومەتەکـەی یاخیبووە.. بەڵکو تـەنیا دابینکردنی ئازادییە بۆ سەرکردە.. تا بتـوانیٚ بـەوجۆرە هەڵسوکەوت بکـات.. بەرپرسـیاریٚتی جـەنگ لـە نەبـەرددا بەسـەریدا دەیسـەپێنیٚ.. ئـەوەش مەیدانێکـە هەلومـەرج و ئـاڵوگۆڕی وەهـای بەسـەردا دێـت.. حکوومـەتی پایتـەخت نـەتوانیٚ بـە شـێوەییێکی هونەرییانـەی دروسـت پەیی پێبەرێت.

(تساو-تساو) فەرموویەتی:

"ئەوەی بۆ سەرکردەی عەسکەریی دەلوێ.. بۆ هیچ دەسەلاتدارێکی دی نالوێ."

(مۆ-تۆ) فەرموویەتی:

"شەڕو پێکدادانو چەکەمەنییێکان.. بەهاو سامی خۆیان هەیە.. چونکە مەبەست لە چەك ئەوەیە.. كارو كردەوەییێكی وای پێهەڵسووڕێنی نەریتو رەوشتی بەرز پێی قایل نەبێت.. وەك كوشتن (بەنوونە).

سەرکردەی سوپا (وەزیری مەرگ)ە.. هاوەڵو سەربازانی دەستو پێوەندگەلێکی دەسەلاتدارن بەسەر دوژمنەوە.

ئەرکی جەنگ ئەرکێکی پیرۆزە.. بە مەرجێ ئامانجەکانی بەرزو پیرۆز بێتو.. ئاسمان لێی رازیبێت..

پێویست ناکات بۆ هەر هەنگاوێ سوپاو سەرکردەکەی دەینیێ.. چاوەڕوانی فەرمانی ژووروو خۆیبێت.. هەر خۆی لە زەوی ژێر پێی و.. لە هەموو مەترسیی و رووبەڕوو بوونەوەیێکی بەرامبەرەکەی بەرپرسە.. سوپا ناتوانێ رووبەڕووی خواستی دوژمنەکەی بێتەوەو.. نازی حکوومەتەکەیشی لەپشتەوە بکێشێ. لە ئانو ساتێکدا وا بەسەر سەرکردەدا دەسەپێنێ.. بەجۆرێك رەفتار بکا وەك ئەوەبێت.. کە هەلومەرجی مەرجی نەبەردو ئاڵوگۆڕەکانی جەتگ داوایان لێدەکات.

(چانگ-یۆ) وتوێتی:

"بە زوبانی شا (ڤۆ-چیێ)وە دەگێڕنەوە بە سەرکردەکەی وتووە:

-ئەگەر خوا خستییە دڵتەوە کارێکی عەسکەریانە راپەڕێنیت.. چاوەڕوانی فەرمانی مـن مەبـە.. بـەڵکو بـڕۆ بـەلای ئـەوەوە لـە ئاماسمانەوە داوات لێکراوە بیکەیت."

٩- ئەو سەرکردەیەی تەبیعەتی هەر نۆ جۆرە مەیدانەکانی جەنگ بزانـێ‌و.. بشـزانێ بەباشـی لێیـان بتۆژێتـەوە.. ئـەوە سـەرکردەییێکە دەوڵەت لێی دڵنیادەبێ‌و.. بڕوای بەخۆی‌و بڕوای دەولەتیش پێی زێتر دەبێ.

(شیا-لین) وتویێتی:

"یێکەمین شتێ لەو شتانەی دەبێ سەرکردە پشتی پێببەبەستێ.. تواناو شارەزایی عەسکەرییانەی خۆیەتی.. لەگەڵ سوودوەرگرتن لە خەسـڵەتەکانی هەلومەرجـە سـەرکەوتن وەدەسـهێنەکان.. بـەپێی ئـەو زرووفەی خۆی.. چونکە هەڵوێست‌و بارودۆخی وا هەن نـەرم‌و نیانی‌و چارەدۆزینەوە دەخـوازن.. نـەك بەتـەنیا ئـەو راسـپاردەو رێنمـایی‌و فەرمانانەی لەوەوبەر هاتوون."

١٠- ئـەو سـەرکردەیەی لـە تێگەیشـتن‌و تۆژینـەوەی راسـت‌و دروستی گشت تەبیعەتەکانی نەبەردەکە دەستەوسانبێت -ئەگەر لە شـتەکانی دیکـەدا شارەزاشـبێت- نـاتوانێ هەڵوێسـتی شـەڕەکە کۆنترۆڵ‌و یێکلایی بکاتەوە.

(شیان-لین) وتویێتی:

"سـەرکردە راستەقینەکان هـەموو هەلومەرجە لەبارەکان بە نـەرم‌و نیانییێکی فیکری‌و هونەرییانـەی وا دەقۆزنـەوە.. گومان‌و دڵەڕاوکێی (رۆتینی حکوومی) نەبێتە تەگەرە."

١١-هەندێ سەرکردەی عەسکەریی هەن.. تەنیا بە پێنج جۆر نەك بە نۆ جۆرەکەی مەیدانەکانی جەنگ دەزانن.

**(شیان-لین) وتوێتی:**

"پێنج جۆرەکە ئەمانەن:

*ڕێگەوبان: مەرج نییە پەسەندترین ڕێگەوبان بۆ مەبەستەکانی جەنگ و.. کۆنترۆڵکردنی مەیدانی شەڕ.. کورتترینیان بێت.

*وەزعی سوپا: مەبەست لەوەیە.. هیچ داناییێك لەوەدا نییە.. هێرشبەریتە سەر دوژمنێك لە وەزعێکی گەمارۆدراو یان ئومێدبڕاودایە.. وەزعێکی وا دوژمن تێیدا لێبڕێ و.. لە قوربانیدان و خۆبەکوشتدان لە پێناوی مانەوەدا درێغی نەکات.

وا باشترە لێگەڕێیت دوژمن مەنفەزێکی هەبێت.. تۆیش لە جێیێکی نزیك ئەوێ بۆی لە مەڵاسدابیت..

لێگەڕێ با دوژمن ئەوە بە دەروازەو دەرفەت بۆ خۆ ڕزگارکردن بزانێ.. دوای ئەوە دەتوانی دەستکەیتە فەوتاندنی تەواوی ئەو دوژمنە.

*هەڵبژاردنی مەوقیع: مەبەست لەوەیە: هێرشبردنە سەر ئەو شارو ناوچانەی لە جەستەی گشتیی هێزی عەسکەریی دوژمن دابڕاون ڕەنج بە خەسارییە.. مەگەر تەنیا کاتێ نەبێ وا بزانیت ئەو شارو ناوچانە.. هێزو باییێخێکی زۆری بۆ دوژمن هەیەو.. داگیرکردنی دەبێتە مایەی زیانێکی دیارو بەرچاوی دوژمن.

پێدەچێ ئەو هێرشانەت بۆسەر ناوچە دوورەدەستەکان دوژمن بهەژێنێ و.. لە ناوچەییێکدا لێتبدات بەلاتەوە هێندە ئازیزبێ..

ئازارەکەی بەسەر هەلومەرجە عەسکەریی و سیاسییەکەتدا سوێ بکاتە دڵتەوە.

*مەوقیعی زەوی: مەبەست لە هەندێ لەو شوێنە (جوگرافی)یە گشتیانەی نێو مەیدانی جەنگە.. پێویست ناکات بە شەڕی عەسکەریی کۆنترۆڵ بکرێن.. بەتایبەتی ئەگەر سەرکردە زانی بە گرتنی ئەو ناوچانە.. هێزو توانای بۆ پاراستنیان زۆر کەم و کەنەفت دەبێ‌و.. ئەم شوێنانە لە نەخشەکێش کردنی جەنگ لە هەموو مەیدانەکاندا ئیمتیازاتێکی هێند گەورەی پێنابەخشێ شایانی ئەو ماندوێتی و قوربانیدانانە بێت.

*فەرمانەکانی دەوڵەت: سەرکردە بە گشتی دەبێ ملکەچی فەرمانەکانی دەوڵەت بێ‌و.. دەبێ وەك ئەرك رایانپەڕێنێ.

هەروەها سەرکردە بۆیشی هەیە چاوپۆشی لەو فەرمانانە بکات.. ئەگەر ویژدانی لەوە بێگومانبوو هەلومەرجی شەڕو ئاڵوگۆڕەکانی بە باشی لەلایەن پایتەختەوە -کە لە مەیدانی جەنگەوە دوورە- پێنازانرێن.

ئەمجۆرە گرفتانە.. دەشێ بەهۆی ئەوەوەبن.. سەرکردە لە بەرەی جەنگدا.. ساتبەسات هەموو وردەکارییێکانی جەنگ و هەلومەرج و پێچوپەناکانی بە سەرکردایەتی باڵا.. یان حکوومەت.. یان پاشای وڵات لە پایتەخت رانەگەیاندبێ.

ئەم پێنج چەشنە (یان زرووفە)ی پێوەندییان بە ئەرکە راستەوخۆ پەتییێکەی سەرکردایەتییەوە هەیە لە مەیدانی جەنگدا.. ئەمە هەلومەرجگەلێکە ناکرێ پێشتر.. یان لە دوورەوە حوکمیان

بەسەردا بدرێت.. بەڵکو پێویستی بە رووبەڕوو بوونەوەییەکی نەرمونیان و قابیلی ئاڵوگۆڕ هەیە.. بەپێی گۆڕانی ئەو شتە نادیارو نهێنیانەی دەروبەری مەیدانی جەنگ دەتەنن."

١٢- لەبەرئەوە.. سەرکردەی عەسکەریی دانا ئەو کەسەیە.. هەرزوو ئەگەرەکانی سەرکەوتن لە مەیدانی جەنگدا.. لەمەڕ ئەوەی دەتوانرێ بکرێت و.. ئەوەش ناتوانرێ راپەڕێنرێت.. بۆ دەوڵەت شرۆڤە دەکات.

(تساو-تساو) وتوێتی:

"دانایی سەرکردایەتی عەسکەریی لەوەدایە.. پەی بەو مەترسیانەی لە شەڕەکە دەکەونەوە بەرێت.. هەروەها پەی بەو لایەنە سوودمەندانەش بەرێت.. هەڵوێستی سەخت و گرینگ بۆیان وەدەستدێنێ."

١٣- ئەگەر سەرکردایەتی پەی بەو لایەن و هۆکارە سوودمەندانە بەرێ و پەیڕەوییان بکات.. ئەگەر توانی پەی بە چاوگەکانی شەڕو ئازار بەرێ و.. هۆکارە خراپەکانی لە مەیدانی جەنگدا بزانێ.. ئەوا دەتوانێ بەسەر جۆرەها گیروگرفتە هەنووکەییەکاندا زاڵبێت.

(مۆ-تۆ) وتوێتی:

"کاتێ دەمەوێ خەسڵەتە عەسکەرییە بۆ خۆم باشەکان دژی دوژمن بەکاربێنم.. بە تەنیا بیر لەو سوودو دەسکەوتانە ناکەمەوە لە ئەنجامی ئەوەدا بەدەستیاندێنم.. بەڵکو بیر لەو ئازارو زیانانەش دەکەمەوە لەو پرۆسەیەدا لێمدەکەون.. یان لە خستنەگەڕی پرۆسەکەدا فەشەلمهێنا."

(هو-یان-هسی)یش وتویێتی:

"سوودو زیانەکان لە پرۆسە عەسکەرییەکاندا.. لێکدی ئالاون و بەنێو یێکدیدا تێهەڵکێشن.. سەرکردەی بە سەلیقە ئەوەیە.. هەردوو لایەنی سوودو زیان بە بیری ورد بەراورد دەکات و هەڵیاندەسەنگێنێ."

١٤- ئەوەی هەرەشە لە هاوسێکەی دەکات و دەیتۆقێنێ.. ئەوە ناتوانێ بەسەریدا زاڵبێت.. بەم کارە گەوجانەیەی کێشە بۆخۆی دەخولقێنێ و.. ئازارو زیان بەخۆی دەگەیێنێ.

(شیان-لین) وتویێتی:

"هەر بەتەنێ یێك رێگە.. یێك پرۆژە.. یێك پیلان بۆ زیان بە دوژمن گەیاندن نییە.

ئەگەر وەلیئەمر.. بە بیرو بۆچوونی خۆی بەتەنێ.. نەخشەو پێداویستییێکانی دوژمن بەزاندنی رێکخست.. ئەگەر وەلیئەمر لەسەر ئەو بیرو بۆچوونانەی سووربوو.. ئەو راوێژکارو پیاوە ماقووڵانەشی لەخۆی دوورخستەوە کە نەخشەو بۆچوونەکانی ناسەلمێنن.. ئەمجۆرە وەلیئەمرانە لە زوربەی حاڵەتەکاندا.. ناتوانن بەسەر دوژمنەکانیاندا زاڵبن.

رێگەو شێواز بۆ دوژمن لەنێوبردن گەلێ زورە.. هەندێکیان پێوەندی راستەوخۆیان بە کاروباری عەسکەرییێوە نییە.

هەر بەنموونە.. دەتوانرێت هەوڵبدرێت بۆ لێکدابڕانی دوژمن لە راوێژکارانی و لەو هاوپەیمانانەی پێوەندی پێیانەوە هەیەو.. دەشتوانن لە کات و ساتە شلۆقەکانیدا بە هانایەوە بێن.

هـەروەها بـۆ نموونـە.. ڕێگـەش هەیـە بـۆ گەنـدەڵی چـاندن و بڵاوکردنەوەی تەوژمە فیکری و سیاسیە ڕووخێنـەرەکان لـە کۆمەڵگـەی دوژمنداو.. لەنێو ڕیزە عەسکەرییەکانیشیدا.

ڕێگەش هەیە بۆ پێدزکێکردنە نێو هەیکەلی کارگێڕی و ئابووری لـە نیشتمانی دوژمندا.. بۆ وێرانکردنی وزەو تواناى.. یان بۆ خولقانـدنی گرفـت و چـەڵەمەی گـران بـۆی و..لێکێشـانەوەی ئـەو وزەو توانـا ئابووری و کارگێڕی و سیاسیانەی کۆمـەکی باشـی ئەرکە جەنگییەکـەی دوژمن دەکەن.

دەشـێ ڕێگـەی دەسیسـە (پـیلان) نانـەوەش لـەنێو کۆمەڵگـەی دوژمنـدا بگیرێتەبـەر.. ئـەم ڕێگەیـە ڕەوشـتێکی وا لـەو کۆمەڵگەیـەدا دەخاتەوە.. خەڵکی بکەونە هەڵپەی ڕابواردن و لەزەت و خۆشی لە ژیان ببینن و.. دەستبڵاوی (ئیسرافکردن) لـە خـەرجی و زیادە مەسرەفیدا.. بـەجۆرێك سـامانی دارایـی و گەنجینـەی وڵات هەڵتـەکێنێ.. یـان وایلێبکات ئاژاوەو گرێوگۆڵی سەخت و عاسی تێکەوێت و.. سیاسـەتی دارایـی و ئـابووری وڵات لاوازبکـات و.. گرفـت و چـەڵەمە ئابوورییەکـان بەسەر دەوڵەتـەوە کەڵەکەبن و.. ئافاتـە کۆمەڵایـەتییەکان وەنێو میللـەت کـەوێ و.. ڕۆڵـەکانی تووشـی ڕەوشـتگەندەڵیی بـن و.. مـەیلی بـەزم و سـتران و سـەما و کـەیف و ڕابـواردن بکـەن و.. تاقـەتی بگـرەو بـەردەی شەڕو ئەرکە زبرەکانی تێکۆشانی عەسکەرییانەیان نەمێنێ."

١٥- هەوڵبدە دوژمنەکەت بە ئەرکگەلێکەوە وا خەریکبکەیت هێزو توانـای لەبـەربڕی و.. فریـای وریابوونـەوە نەکـەوێت و.. سـەری

نەپەرژێتە سەر خۆئامادەکردن.. بۆئەوەی بەرەنگاربوونەوەیێکی عەسکەریانەی گەورەو گران بەرەنگارت بێتەوە.

١٦- گرینگترین بنەما جەنگییێکان و هونەرە عەسکەرییێکان ئەوەیە.. چاوەڕوانیی دوژمن مەکە دەسپێشخەریی لە هێرش و شەڕپێفرۆشتننتدا بکات.. بەڵکو دەبێ هەمیشە تۆ ئامادی دەسپێشخەریی بیت بۆ لووتشکاندن و پووچەڵکردنەوەی ئامادەباشییێکانی بۆ هێرش و بەرگریکردن.

دەبێ لە خەسڵەتی دوژمناندا ئەوە هەبێت: قەومێکن و مافی تۆیان دزیوە.. یان خۆیان بۆ دزینی ئەو مافەت مەڵاسداوە.

ئەرکی ئەستۆی دەوڵەت و سوپا ئەوەیە.. هەردەم خاوەنی دەسپێشخەری و زیتەڵی و تفاقبن بۆ دوژمن فەوتاندن.

ئەگەر دوژمن مافتی دزیبوو.. ئەرکی ئەستۆتە بۆ سەندنەوەی ئەو مافە.. دەسبکەیتە هێرشبردنە سەری.

ئەگەر دوژمن هەڕەشە لە هەق و سەلامەتیت دەکات.. پێویستە لەسەرت هەمیشە لەوپەڕی ئامادەباشیدا بیت بۆ نابووتکردنی هێرشەکانی.

لە هەردوو حاڵەتدا ئامادەباشییە عەسکەرییێکانت بۆ هێرش و بۆ بەرگرین پێکەوە.

**(هو-یان-هسی) وتویێتی:**

"لە کتێبی (بلیمەتێتی عەسکەریانەی (ماو) شا)دا هاتووە:

"پیاوی ئابڕوومەند لە ڕۆژانی ئاشتیدا.. هەردەم مشتووی شمشێرەکەی ها لەنێومشتیا"

١٧- پێنج خەسڵەتی ناشیرین بۆ پیاوی عەسکەریی هەیە:

ئەگەر لاسارو سەرەڕۆبوو.. زووبەزوو لەنێودەچێ.

مۆ-تۆ) وتویّتی:

"ئەوەی زۆر زۆر مایەی نەهامەتییە.. ئەوەیە پیاوی عەسکەریی لە هەمانکاتدا ئازابیّ و گەوجیشبیّ."

١٨- (دو-شی) وتویّتی:

لەنیّو خەڵکیدا وا باوە.. خەسڵەتی پیاوی عەسکەریی بە (ئازایەتی) دەپیّون.. بەلاّم پیاوی عەسکەریی بەرپرس.. ئازایەتی بەلایەوەتەنیا یێك خەسڵەتەو.. دەبیّت خەسڵەتەکانی دیکەیشی لەگەڵدابن.

عەسکەریی ئازا لە چورتمەکانی شەڕدا.. بەتەنیّ پشت بە ئازایەتییێکەی نابەستیّت.. دەنا ئازایەتی کویّرایی دادیّنیّ لە ئاست هەڵویّستو گریّوگۆڵە شارراوەکانو چرکەساتەکانی دانایی.. ئەوانە وا دەخوازن ئازایەتی دابینبکاتو زیرەکیش بخاتەکار.. ئازایەتی بەبیّ زیرەکی سەرچڵییەو.. دەشبیّتە مایەی نەهامەتیو ئازار.

١٩- ئەگەر (پیاوی عەسکەریی) ترسنۆك بیّت.. بەخیّرایی پیّخسیردەکریّت.

(هو-یان-هسی) وتویّتی:

"ئەو پیاوەی تا رادەی (ترسنۆکی) عەشقی خۆی بووە.. هەمیشە لەتیّکەیشتنی بنەماکانی داکۆکی لەخۆکردندا شپرزەو بەگومانە.. هەر ئەم دڵەڕاوکیّیەشە وزەو توانای ململانیّی لەپیّناوی مانەوەدا لەبەر هەڵدەگریّتو.. دەبیّتە نیّچیریّکی خۆش شکاری دوژمن یان هی بارودۆخ."

٢٠- ئەگەر گیّل وکەودەن بوو.. ئەوا گەوجیّتییێکی وا دەکات بیخاتە تەهلووکەوە.

( مۆ-تۆ ) وتویّتی:

"پیاوی گەوج بە بێبەهاترین شت تووڕەدەبێت.. تووڕەیی گەمژەپیاویش هەرچی هۆشوگۆشە لەبەری هەڵدەگریٚ و.. خاپترین نەهامەتی بەدووی خۆیدا دێنیٚ.

گەوجەپیاو ناتوانیٚ جڵەوگیری بیرکردنەوەو تووڕەبوونی خۆی بێت.. ناتوانیٚ کۆنترۆڵی هەڵویٚست و هەلومەرجەکان بکات و.. بێگومان ناشتوانی بەکاریانبێنیٚ.

گەوجێتی سەهەندەیی و کەللەڕەقی کوێرانە دەخاتەوە.. یان هەڵەشەیی و تەنگەتاوی دەخاتەوەو.. لەئاستی پێشهاتە فەوتێنەرەکاندا کویرایی دادیٚ.. پێشهاتە پڕ مەترسییەکانیش نە بەزەییان بە پیاوی گەوج و هەڵەشەدا دێتەوەو.. نە ڕێزیشی لێدەگرن.. بەڵکو بەخێرایی و بە ئاسانیش دەیبەزێنن."

( وانگ-هسی ) وتویّتی:

"باشترین خەسڵەتی پیاوی عەسکەریی خۆڕاگریی و گوێڕایەڵیە."

٢١- ئەگەر پیاوی عەسکەریی هێندە هەست ناسك بوو.. تا ئەو رادەیەی ئەو هاوسەنگێتیەی لە دەستبدات.. کە دەبیٚ تا ئاستێکی دیاریکراوو پێویست لەو پیاوەدا بمێنێتەوە.. ئەم هەست نازکییە.. لە زۆر حاڵەتدا بەسوێترین ئێش و خراپترین نەهامەتی بەسەر خۆیداو.. بەسەر ئەرکە عەسکەرییەکانیشیدا دەهێنیٚ.

( مای-یاو-چان ) وتویّتی:

"پیاوی عەسکەریی چەند هەست و دەروون ناسکبیٚ.. هێندەیش کوێرایی لە ئاست هەقیقەتەکان و حاڵەتە مەترسیدارەکان دادێت.. هەروەها لەئاست جۆرەها شەرەفی عەسکەریشدا.. کە بۆ سومعەی

پیشەکەی زۆر لەو قسەو قسسەڵۆکە ناسازانە گرینگترن لە زاری هاوەڵێکی.. هاوکارێکی.. کەسێکی نزیکی.. دووری دەردەچن.

جوامێرێتی عەسکەرییانە باکی لە هەست و سۆزگەلێکی نزم و بێبەها نییە."

٢٢- ئەگەر میهرەبان و بەبەزەیی بوو.. بەزەیی لە بازنەی ئەرکی عەسکەریانەدا سنووردارە.

(مۆ-تۆ) وتویەتی:

"خەسڵەتی بەزەیی و میهرەبانیی لە رەفتاری عەسکەرییانەدا.. واتای ئەوە نییە بە پەلەپرووزێ داخ و مەخابن بۆ ئەو گەلە قوربانییە هەڵڕێژرێ لە مەیدانی جەنگدا بە ختو خۆڕایی بە کوشتدراون.

بەرپرسیارێتی عەسکەرییانە هەندێجار قوربانیدانی گیانی و ماڵیی گەورەی گەرەکە.. وەلێ مەبەستەکانی جەنگ پاراستنی کۆمەڵە گیان و خەڵکێکی دی نێو هەموومیللەتە.. کە جەنگاوەری عەسکەریی شەرەفی پاراستنی بەرژەوەندی و کەرامەتیان لە ئەستۆ دەگرێ.

٢٣- پێنج خەسڵەتە لاوازەکەی پیاوی عەسکەریی.. بەر لە هەر شتێ بە زیان و ئازار بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە.. ئەوجا بەسەر ئەرکە عەسکەرییێکەداو.. بەتایبەتیش لەنێو سەرکردایەتیدا بەهەموو پلەو ئاستەکانییەوە.. چ لە ئان وساتی جەنگ و پیاهەڵپژاندا و.. چ لە سەروبەندی خۆ بۆ پرۆسە عەسکەرییێکان ئامادەکردندا.

٢٤- ئەگەر ئەم خەسڵەتە لاوازانە بەنێو سەرکردایەتی عەسکەریدا پەخشبۆوە.. نەهامەتی و ئێش و ئازارەکان زووخاو دەکەنە جەرگی سەرکردایەتی و هەموو سوپاکەشەوە.

کەواتە دەبێ زۆر بەوردیی و بەبەردەوامیش.. لە هەموو قۆناغەکانی ئەرکە عەسکەرییێکەداو.. لە هەڵبژاردنی پیاوانی عەسکەریی بۆ هەر قۆناغ وئەرکێك.. ئەو پێنج خاڵە رەچاوبکەین و.. بەتەنگیانەوە بێین.

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- لە سەروبەندی کشانی سوپا بەو بەرزاییانەی دۆڵ و لێرەواریان ها بەتەکەوە.. وا چاکە ئۆردووکە لە بەرامبەر خۆرهەڵات خۆی دامەزرێنێ.[٢٩]

٢- ئەگەر لە سەروبەندی کشانی سوپاکەتدا.. جێگەیێکت کردە ئۆردووگەو.. دوژمن شەڕی پێفرۆشتیت.. ئەگەر تۆ لە بەرزاییدا هەڵتدابوو.. ئەوا شەڕەکە بەباشی بۆت دەشکێتەوە.. چونکە ناچار نابیت بۆ کوشتاری دوژمن بە بەرزاییێکەدا هەڵزنێیت.

٣- ئەو دوو حاڵەتە (١ و ٢).. بۆ ناوچە شاخاوییێکان دەشێ.

٤- لە دەشتاییدا هەوڵبدە لە نزیك رۆگەی روبارەکانەوە بیت.. دوای ئەوەی پیایاندا دەپەڕیتەوە ئەودیو.

٥- هەوڵبدە خۆت لە رووبەڕووبوونەوەی سوپای کشاو لادەیت.. کاتێ ئەو لەسەر رۆخی روبار (یان دەریا)بێت.. چاکتروایە لێگەڕێی دوژمن خەریکی پەڕینەوە بێت.. ئەوسا لەنێوەندی روبارەکەدا دەستبکەرە لێدانی.

(هو-یان-هسی) وتویێتی:

"میر (هۆنگ) لە بەهارو هاویندا.. بە سەرکردایەتی سوپاییێکەوە بۆ شەڕی دوژمن کشا.. لە ناوچەی (چاو)دا لە روبار دەپەڕییەوە.

شالیاری جەنگ هاتە لایو بە میری وت:

---

[٢٩] - مەبەست لای (باشوور)ە.. لە جوگرافیای ئەو کەرتەی (چین)دا.. دانەری (هونەری جەنگ)ی تێدا ژیاوە.

– هێزەکانی دوژمن گەورەوگرانن و.. چەکەمەنی و ئازووخەشیان تۆکمەیە.. چاکترە وایە هەر ئێستە کە سەرقاڵی پەڕینەوەن.. بەرلەوەی بپەڕنەوەو تەشکیلاتەکانیان دامەزرێنن.. با دەستبکەینەوەو لێیاندەین.

میر وەڵامیدایەوە:

– نا.. نابێت ئەم مەوقیعانەمان جێبێڵین.. چونکە جێگەکەمان بە جۆرێ سەخت و پتەوە.. دوای پەڕینەوەیان لە روبارەکە.. دەتوانین هەر لێرەوە لێیاندەین و.. پێویستمان بەوە نەبێت سوپاکەمان لەنزیک ئاوی روبارەکەوە تێوەگلێنین.

گەرچی وەڵامی شالیاری جەنگ پێچەوانەی بۆچوونەکەی میر بوو.. لێ میر تەگبیرورای شالیاری رەتکردەوەو.. شەڕەکەی دۆڕاندو.. دوژمن قڕی خستە نێوجەنگاوەر (دەستە گوڵ)ەکانی میرو.. بۆ خۆیشی بەسەختی بریندار بوو."

٦– ئەگەر وات بە باشزانی لە پێکهەڵپڕژان لەگەڵ دوژمندا.. تۆ دەسپێشخەر بیت.. گەر روبارەکە لە پشتتەوەبوو* لەگەڵیدا تێهەڵمەچۆ.. لێیگەڕێ با کاتێ خەریکی پەڕینەوەیە لەگەڵتدا بەشەڕبێت.. یاخود کاتێ بەنێو روبارەکەدا دەکشێتەوە.

٧– ئەم حاڵەتانە پێوەندییان بەو کشان و شەڕانەوە هەیە.. لە نزیک ئاوو روبارەوەن.

٨– کاتێ سوپای کشاو ناچاردەبێت.. بە زۆنگاوە بۆگەناوەکاندا.. یان سوێراوەکاندا تێپەڕبێت.. با پەڕینەوەکەی بە دەستوبردو بێ خۆخلافاندن و پشوودانبێت.

ئەگەر دوژمن لە کاتێکدا شاڵاوی بۆهێنای.. تۆ لە زەلکاوەکان نەپەڕیبوویتەوە.. بەپەلە جێیەکی نزیك لە دارودەوەن و گژوگیای وا هەڵبژێرە.. دارو درەختەکانی پاشەنگی سوپاکەت بپارێزن.

٩- ئەمانەش پێوەندییان بە زەلکاوو سوێراوەکانەوە بوو.

١٠- لە تەختاییدا.. با سوپای کشاو شوێنێ هەڵبژێرێ بە ئاسانی هەڵسوکەوتی تێدا بکات.. با پاشەنگی سوپاکەیشی پشتی دابێت بە بەرزایی چیاکانەوە.. ئەگەر بۆیشی لوا با قۆڵی راستیشی بە بەرزایی چیاکان پارێزراوبێت.. پانتایی مەیدانی جەنگ لەبەردەم پێشینەی سوپاکەدا بەرفراوانبێت.. بەمە بەرگرییێکی سروشتی (جوگرافی) بۆ پاشەنگو باڵێکی سوپاکەت مسۆگەر دەکەیت.. هەروەکو چۆن خێرایی بزووتنەوە لە پێشەوەو لە قۆلەکەی دیکەوە بۆ سوپاکەت مسۆگەر دەکەیت.

١١- ئەمەش هێندەی پێوەندیی بە هەڵبژاردنی جێگەوەیە لە زەوییە تەختانییێکاندا.

١٢- ئەم چوار خەسڵەتە (باسکراوانە).. باشترین رێنمایی سوپای کشاوەن لەڕووی هەڵبژاردنی ئۆردووگەی سوپاکەوە.. (بەکورتی *دووبارەیان دەکەینەوە*):

پاشەنگی سوپاکەت بپارێزە.

پاراستنی باڵی ڕاست زامنکە.[30]
بە ئازادی بەرەو پێشەوە بچۆ.
لە جموجووڵی قۆڵی چەپ وریابە!

١٣- وا بۆ سوپای کشاو باشترە.. لە جێیەکی بەرزاییدا هەڵبدات و.. بەرەوڕووی هەلاتنی خۆر بێت و.. لە سێبەر بەدووربێت.. خۆر زیندەگی و چالاکی بە جەستەی سەربازان دەبەخشێت.. تەندروستیش بەهێزترین چەکی سوپاو.. مایەی ورەبەرزییەتی.

١٤- ئەگەر سوپای کشاو لە ناوچەیێکدا هەڵیدا.. هەمووی گردو گردۆڵکەو ئاوو (زەلکاو)و ڕوبار بوو.. با مۆڵگەکەی هەمیشە بەرامبەر هەلاتنی خۆربێت.. پێشەنگەکەی گۆڕەپانێ بێ بواری جموجووڵی بدات.. پاشەنگەکەی.. هەروەها باڵی ڕاستیشی پشتیان بە بەرزایی قایمبێت.

١٥- یێکێ لە هونەرەکانی جەنگ ئەوەیە.. دەست بەسەر مەوقیعە (جوگرافی)یەکەدا بگریت.. تا کۆنترۆڵی (یان وابێ بتوانیت لێوەیەوە کۆنترۆڵی) جموجووڵی دوژمن بکەیت.

---

[30]-باڵی ڕاست لە سوپاکانی (چین)ی ئەو سەردەمەدا.. ئەو باڵە بوو کە مەترسیی لەسەربوو.. چونکە سەربازەکان بە دەستی چەپ قەڵغانەکانیان هەڵدەگرت.

* پێموایە وەرگێڕی عەرەبی لێرەدا لێی تێکچووبێت.. لەوانەیە (لەپێشتەوە) بێت نەك (لەپشتتەوە).. چونکە گەر ڕوبارەکە لەپشتەوە بێت دوژمن چۆن دەتوانێ و بۆچی لێیدەپەڕێتەوە ئەوبەر.. ئەگەریش کشایەوە چۆن جارێکی دی پیایدا دەگەڕێتەوە !؟ (و.ك)

١٦- بە نیسبەت روبارو ئاوی بەتەوژمەوە.. وەك (تاڤگە) نزیکەکانی مەیدانەکانی جەنگەوە.. نەکەیت سوپا کشاوەکەت لە جێگەییێکدا مۆڵگە بدەیت (یاخود جێگەییێکی بۆ هەڵبژێریت).. تێیدا ببیتە پێخسیری سروشتی ئەو زەوییەی ئاوی بە تەوژم لێدەردەچێت.

**(تساو-تساو) وتویێتی:**

"ئاسمان بە دانایی ئاو بەسەر زەویدا دەبات"

ئەو ئاوەی لەسەر چیاکانەوە دەردەچن (دەبنە تاڤگە).. ئاسمان وزەییێکی هێند مەزنی پێداون .. سەرباز نەتوانێ خۆی لە بەریاندا بگرێ.

ئەو ئاوانەی بەنێو گردو چیای بەرزدا (واتا بە دۆڵەکانیاندا) دەڕۆن.. ئەمانە بەوێنەی چاڵەبیری گەورەن.. ئاسمان هەڵیکۆڵیون و قووڵیکردوون و.. هێندەش ئاوی تێدا داناون.. سەرباز نەتوانێ دابینیان بکات.. ئەگەر ویستی پێیاندا بپەڕێتەوە.. یا ئەوەتا دەخنکێ.. یان هەرچی زەخیرەو ئازووقەو تفاقی جەنگیی هەیە نقوم یان عەدەمدەبێت.. ئەم دۆڵانە.. لە زیندانگەلێك دەچن ئاسمان بنیاتیناون.

لە سروشتی زەویدا گەلێ جێگە هەن.. بۆ پێداڕۆشتنی سەرباز زۆر عاسی و ناڕەحەتن.. لەبەر ئەوەی یان زەوییێکە تەنگەبەرە.. یان ئاوی ئاسمانیی (بەرزایی) بەتەوژم تێدەڕژێ.. ڕێگە نادات سەربازەکان بە ئازادی و بەخێرایی پیایدا بێن و بچن.. ئەم جۆرە جێیانە تۆڕی ئاسمانین.. وەك تۆڕی راوچی ماسی دەگرن.

ئەگەر زەوییێکە نشێوی بوو.. لێرەواری قووڵو هەڵدێری هەزار بەهەزاری تێدابوو.. ئەوە زەوییێکە ئاسمان کردوێتییە تەپکە (داو) بۆ ئەو کەسەی ئاسمان کوێرایی داهێناوە.. یان بۆ ئەو کەسەی نازانێ چۆن ئەو بەهرەی ئاوەزو ژیرییەی ئاسمان بە مرۆڤی بەحشیوە بەکاریبێنێ.

١٧- دەبێ پیاوی عەسکەریی بەسەلیقەو شارەزا.. خۆی لەم خلیسکاییو هەڵدێرانەوە نەگلێنێو.. هەوڵبدات سوپای دوژمن بەرەو ئەم هەڵدێرانە هەڵفریوێنێ.

١٨- لەوانەیە سوپای کشاو خۆی لەوجۆرە ناوچانەی زۆنگاوی سەر بە گژوگیای بەرزی تێدایە ببینێتەوە.. یان لە دارستانێکی دارو درەخت نزم (پڕدارو دەوەن)دا.. یان لە بیستانێکی چڕو پڕدرەختو رووەکدا ببینێتەوە.. سوپای کشاو دەبێ زۆر لەمجۆر شوێنانە سڵبکاتەوە.. چونکە ئەمانە شوێنگەلێکن.. دوژمن بەزۆری بۆ هێرشی لەنکاوو غافڵگیریی سوپای کشاو بەکاریاندێنێ.. یان بۆ کاروباری هەواڵدزیو چاودێری جموجووڵی سوپای کشاو.

١٩- کاتێ هەستتکرد سوپای دوژمن لێت نزیکبۆتەوە.. وەلێ بەتەواوی نەتزانی شوێنەکەی دەسنیشانبکەیت.. دیارە دەبێ مەوقیعەکانی دوژمن مەوقیعگەلێکی (جوگرافی) شیاوو لەبارین و.. ئەو خەسڵەتە سروشتیانەیان تێدابێت بۆ کێشکردنی تۆ پێویستێتی.. تا بتخاتە هەڵوێستێکەوە.. بۆ لەنێوبردنی تۆو سوپاکەت یارمەتیدەری بێت.

ئەگەر دوژمن لە ئۆردووگەکەت دووربوو.. هەولیشیدا لەگەلتدا بەشەڕبێت.. باشبزانە بەوە دەیەوێت فریوتبدات.. تا لەو شوێنانە نزیکبیتەوە بۆ لەنێوبردنی سوپاکەت بەباشی هەلیبژاردوون.

٢٠- ئەگەر هەستتکرد هەندێ داروەدەوەن و گژوگیا دەجوولێنەوە.. بزانە دوژمنەو دەکشێت.. یان هەلتدەفریوێنێ.. تا راتکێشێتە نێو ئەو مەوقیعانەی دەیەوێت تێیاندا زەفەرتپێبەرێت.

٢١- ئەگەر بینیت.. دوژمن چەند تەپکەو داوێکو.. چەند چالوچۆلی و هەلدێرێکی لە یێکێ لە رێگەوبانەکانی سوپا کشاوەکەتدا دامەزراندبوو.. بزانە وا دەخوازێ رێگەیێکی دی بگریتەبەر.. کە دوژمن خۆی تێیدا بۆ ناویتەتەوەو.. بە داوو بۆسەو هەلدێری مەرگئاوەری سەخت و خەتەرناکیش بۆی تەنیویت.

٢٢- دوای چاوگێڕان بە ئاسمانی ئەو ناوچەیەی کردووتە بە ئۆردووگەی خۆت و.. هەستتکرد (بەنموونە) تەیروتوال بەشپرزەیی و بە جووکەو جریوەو قیژەقیژ کردوویانەتە هەراوزەنا.. ئەمە نیشانەی ئەوەیە سوپای دوژمن لە شوێنێکی نادیاری ئەو نزیکانەدا بۆسەی بۆ ناویتەتەوە.. باڵندە بە خێرایی هەست بەو رەگەزە ئاوەکیە دەکات کە بە سروشتی ناوچەکە نامۆیە.

٢٣- ئەگەر درندەکانی بێشەلان و ئاژەلی کێوی ئەو ناوچەیەی سوپاکەت پێیدا دەکشێ بینی.. بەشپرزەیی و هەراسانی هەرێکە بەلاییێکدا دێو دەچێو دەرئەپەڕێ.. بزانە ئەوە سوپای دوژمنە.. یان بۆسەی دوژمنەو خەریکە هێرشێکی ناکاوت دەکاتەسەر.. تا بەهۆیەوە هەندێ دەسکەوتی لە ئۆردووکەتەوە دەستبکەوێت.. بۆیێ

وریایی و سڵکردنەوە لە هەموو قۆناغەکانی کشانداو.. ساتەکانی پشوو حەوانەوەداو.. حاڵەتەکانی خۆ دامەزراندن و قایمکردندا پێویستە.

٢٤- ئەگەر تێبینی ئەوەتکرد.. ستوونی تەپوتۆز بەشێوەیێکی ئەندازەیی گونجاو تا بێت بەرەوژوورتر بەرزدەبێتەوە.. بزانە ئەوە تەپوتۆزی گالیسکە چەکدارەکانە.. (وەك هی تانکەکانی ئەم رۆژگارەمان).

بەڵام ئەگەر تەپوتۆزەکە لە ئاستێکی نزمدا بەرزبووبۆوە.. ئەوە نیشانەی رێوڕۆشتنی هێزە پیادەکانی دوژمنە.

(مۆ-تۆ) وتوێتی:

"کاتێ گالیسکە چەکدارەکان دەبزوێن.. هێزی سوارەیان وەتەکدەکەوێ.. بۆیێ ئەو تەپوتۆزەی لەم جموجوولە پەیدادەبێ.. لە بەرزبوونەوەیدا شێوەی ستوونیی هاوئاهەنگ بەخۆیێوە دەگرێ.. وەك شەپۆلی رێوڕۆیشتنی هاوئاهەنگی رێچکە ماسی."

(چانگ-یۆ) وتوێتی:

"کاتێ (تان)ی سەرکردە.. بەرگریی لە پایتەختی وڵاتەکەی دەکردو.. هێزەکانی دوژمن ئابڵووقەیدابوو.. (تان)ی سەرکردە خۆی لە چاڵ هەڵکەندن و دامەزراندنی بنکە بەرگرییێکاندا.. شانبەشانی سەربازەکانی و هاووڵاتیانی شارە گەمارۆدراوەکە کاریدەکرد.. فەرمانیشی بە ژن و کەنیزەکەکانی دا.. لە پرۆسەی بەرگریکردن و دامەزراندنی سەنگەرەکاندا بەشداربن.

ئەمجا سەرکردە هەندێ ئافرەتیشی نارده سەر شوورەکانی شاری گەمارۆدراو.. تا لەوێوە لە سوپای دوژمن بپاڕێنەوەو پێیبلێن.. ئەگەر خەڵکی شارو فەرمانڕەواو سوپا بەرگریکەرەکەی ویستیان خۆیان بەدەستەوەبدەن.. با مەرجی سەختو گران بەسەریاندا فەرز نەکات.

سەرکردەی سوپای دوژمن.. بەم حاڵەتە لاوازییەی نیو ریزەکانی شاری ئابڵووقەدراو شادمانبوو..

ئەوجا سەرکردەی شاری ئابڵووقەدراو.. فەرمانی بە دەوڵەمەندانی شار دا (٢٤٠٠٠) بیستو چوار هەزار ئوقیە (رەتڵ) ئاڵتوون کۆبکەنەوەو.. پەیامێکیش بۆ سوپای دوژمن لەودیو شوورەکانەوە بنێرنو.. تێیدا مژدەی بدەنێ.. شار دەیەوێت تەسلیمبێتو سەرانەش بدات.. بەمەرجێ ژنو کەنیزەکان نەبنە تالانی سوپاکەیان.

سەرکردەی سوپای دوژمن هێندەی دی دڵی گەشاییەوە.. کەیفو شادی وەنێو ئۆردووگەکەیشی کەوت.. هەموو کەوتنە سازدانی شەوانی سوور.. بە ئاهەنگو زەماوەندو مەینۆشینو رابواردن لەگەڵ ئەو ژنانەی بەزۆری دەکەوتنە تەك سوپاو.. لە مەیدانێکەوە بۆ مەیدانێکی دی دەچن.

سەرکردەی سوپای شارە گەمارۆدراوەکە.. ئەم لەشداهێزرانەی نێو ئۆردووگەی دوژمنی بە هەلزانی.. لەنکاو هەڵیکوتایە سەریانو.. سەرتاپایانی تەفروتووناکردو.. پایتەختیشی لە گەمارۆ رزگارکرد."

٢٦- کاتێ دوژمن کەوتە فشەو قسەی زلو هەڕەشەو گوڕەشەی توندوتیژو.. تۆیش زانیت هیچی لەدەست نایەو.. ئەو پیاوە نییە

قسەكانی بە كردار بگۆڕێ.. مانای وایە نیازی شەڕكردنی نییەو.. بەتەمای كشانەوەیە.

٢٧- كاتێ دوژمن لە ئاخاوتنەكانیدا.. یان لە نامەكانی نوێنەرەكانیدا.. یان لە دانوستانی باڵوێزەكانیدا نەرمو نیانبوو.. نەرمو نیانییەكی تێكەڵ بە چاووڕاوو چاچۆڵبازیی و پۆزشهێنانەوەی ساختە.. بزانە مەبەستی هەر ئەوەیە ماتڵتكاتو.. كاتێكی پشوودانی زێتری لەسەر حسابی تۆ وەچنگكەوێت.. تاكو بۆ زێتر خۆئامادەكردنی عەسكەریانە بە هانایەوەبێت.. كە تا ئەو ساتە تەواوی نەكردووە.

(چانگ-هاو) وتوێتی:

"ئەگەر بەبێ سەبەبێكی پەسەند دوژمن داوای شەڕراگرتن (رێكەوتن)یكرد.. بزانە كاروباری نێوخۆیی وێرانەو.. خۆیشی لە بارودۆخێكی پەرێشاندایەو.. وزەو تواناكانی پەرشو بڵاون.. گەرچی واش خۆی نیشاندەدات گوایە هێشتا بەهێزە.. یاخود تۆ خۆت وای هەستپێدەكەیتو.. حسابی ئازایی و بەهێزیشی بۆ دەكەیت.

لەم حاڵەتەدا هەموو مەبەستێكی دوژمن وەدەستخستنی كاتە بۆ كۆكردنەوەی هێزەكانی.. یان پاراستنی ئەو دەستكەوتانەیە بەدەستیهێناون.. یاخود سەرلەنوێ خۆئامادەكردنێكی عەسكەرییە تا لەنكاو لێتدات.. یان ئەوەتە دوژمن پەیی بەوەبردووە وزەو توانای جەنگیت لەهی ئەو زێترو گەورەترە.. وێڕای ئەو زیانانەی لە پێكدادانێكدا.. یان لە زنجیرە پێكدادانێكدا لێتكەوتووەو تێیانا سەرنەكەوتوویت.

دوژمـن لـەم حاڵەتـەدا مەبەسـتێتی ئـەو دەسـکەوتانەی لـە تـەوە دەسـتیکەوتوون بیانپـارێزێ‌و.. هـەلی تۆڵەسـەندنەوەو گەڕانـەوەی مافەکانت‌و ئازاردانیـت بـۆ نەڕەخسـێنێ.. لەبـەر ئەوەیـە دوژمن داوای شەڕوەستانت لێدەکات."

٢٨- ئەگەر هەستتکرد.. دوژمن گالیسکە چەکدارەکانی بەر لە هەر هێزێکـی دیکـەی سـوپاکەی جووڵانـد.. دیـارە خـەریکی نەخشـەی شەڕهەڵگیرساندنە.

( چانگ-یۆ ) وتویەتی:

"لـە کتێبـی (پێکهاتـە عەسکەرییەکان لەسـەر شێوازی جموجووڵی رێچکە ماسیی نێو دەریا[٣١])دا هـاتووە: ماسـیی گچکە شوێن ماسیی گـەورە دەکـەوێت.. هـەروەها لـە جموجـووڵی سوپاشـدا.. پیـادە دووی گالیسـکە چـەکدارەکان دەکـەون‌و.. نایـەڵن دوژمـن‌و چـەکە قورسەکانیشی زەفەریان پێبەرن."

٢٩- ئەگـەر سووسـەی ئـەوەتکرد.. دوژمـن بـەخێرایی بـۆت دەکشـێ‌و.. بەبێئـەوەی هێشـتا لەگەڵتـدا بەشـەڕهاتبێ.. چـەکە قورسەکانی نێو گالیسکە چەکدارەکانی نمایشپێدەکات (چوون تانك‌و فڕۆکـەی ئـەم رۆژگارەمـان).. گوایـە وای نیـازە لەگەڵتـدا بکەوێتـە

---

[٣١]- کتێبێکی عەسکەریی (چین)یی دێرینە.. دەچێتە خانەی ئەو سەرچاوە زۆروزەبەندانەی لە (چین)ی دێریندا.. لەمەڕ هونەری جەنگ نوسراون.

شەڕەوە.. وەلێ بەم لە راستیدا بەتەمای ئەوەیە هاریکاریی و کۆمەکی پێبگات.[32]

٣٠- ئەگەر سووسەی ئەوەتکرد.. نیوەی هێزەکانی دوژمن بەرەوپێش دێن و.. نیوەکەی دی بەرەودوا دەکشێنەوە.. زۆر پێدەچێ بەنیازی چاووڕاوو چاوبەستەگیی بێت و.. ئەو مەبەستە شەڕەنگێزییانەی پەردەپۆشکات.. کە دەیەوێت بەهۆیانەوە لەناکاو لێتدات.

٣١- ئەگەر تێبینی ئەوەتکرد.. سەربازانی دوژمن شانیان داداوەتەسەر چەکەکانیان.. بزانە کفت و برسی و تینوون.. یان بەگشتی پرزەلێبڕاون.

٣٢- ئەگەر هەستتکرد.. ئەوانەی لە ئۆردووگەی دوژمندا بەرپرسی ئاو هێنانن..بەرلەوەی ئاو بگەیەننەوە ئۆردووگەکەیان.. بۆخۆیان هەڵپەی ئاوخواردنەوەیانە.. بزانە سوپاکەیان بەدەست بێ ئاوییەوە دەناڵێنێ.

---

[32]- لێرەدا مەبەستی دانەر روون نییە.. ئاخۆ مەبەستی ئەوەیە: دوژمن چاوەڕوانی هاریکاری و کۆمەکە لە دوورەوە بۆی بێت!.. یان دوژمن هێزەکانی بەسەر ناوچە هەڵبژێرراوەکاندا دابەشدەکات و.. بەنیازی چاوبەستەگییە لە جۆری خۆڵ لە چاوکردنی چاودێران.. تا بەو خۆ دەرخستنەی لە جموجووڵە عەسکەرییەکەیداو.. بەبێ پێکدادانی عەسکەرییانەی بەپەلە.. گێچەڵ یان بەد لێکدانەوە بۆ مەبەستەکانی بکرێ !؟.

٣٣- ئەگەر هەستتکرد.. ئەو هەلە دانسقەو لەبارانەی بۆ پرۆسەی عەسکەریی دوژمن دەرەخسێن و.. نایانقۆزێتەوە.. دیارە شەکەت و کەنەفتبووە.. یاخود ئەوانەی سەرکردایەتیی سوپاکەیان دەکەن.. گەمژەن و لە پرەنسیپەکانی هونەری جەنگ بێئاگان.

٣٤- ئەگەر تێبینیتکرد.. تەیروتواڵ بەسەر ئۆردووگەی دوژمنەوە دەسووڕێنەوە.. ئەگەر لەوەوبەریش هیچ هەواڵێکی وردو دروستت لەمەڕ جموجووڵی ئەوێت پێنەگەیشتبوو.. بزانە ئۆردووگەکەی چۆڵە.

(چانگ-هاو) وتوێتی:

"مەبەست لەم تێبینیانە ئەوەیە.. دەبێ سوپای کشاو چاودێری هەر دیاردەو خولیاو خوتوورەییێك لە کەشوهەوای دوژمندا بکات.. جا ئیدی ئەوانە چەند بێبەهابن و.. چەندێکیش لەلایەن ئەوانەی سەلیقەو ورییاییان لە چاودێریکردنی عەسکەریانەدا نییە.. سەرنجڕاکێش نەبن.. گرینگ نییە.. چونکە ئەمە چاودێریکردنێکە.. پێویستی بە چابووکی زەین و.. سەلیقەی خوڕسك و.. بایێخپێدانی بەردەوام و.. هەوڵدان بۆ تەفسیرکردنی هەردیاردەییێك لەوانە.. لە سنووری لۆژیکێکی عەسکەریانەی پەسەندەوە هەیە."

٣٥- ئەگەر تێبینیتکرد.. ئۆردووگەی دوژمن لە شەودا.. بە هەراوزەنایە.. چۆڵەچراکانیان بە ورشەوپرشەیە.. زۆر پێدەچێ دوژمن لێتبترسێ.[٣٣]

---

[٣٣]- خۆش ئەوەیە.. (بلووتارك)ی گەورە مێژوونووسی رۆمانی.. لە نووسینەکانیدا لەمەڕ جەنگەکانی (ئەسکەندەری مەکدۆنی).. ئێماژە بەوە

**(مۆ-تۆ) وتویێتی:**

" ئەگەر هەراوزەنا بەرزو.. رۆشناییێکانی ئۆردووگەی دوژمن لە شەودا بە ورشەو درەوشاوەبوو.. نیشانەی ئەوەیە ورەی سەربازەکان لاوازە.. هەوڵدەدەن بەخۆیان بسەلمێنن گوایە بەهێزن‌و.. ئیدی دەسدەکەنە چەقەنەو هەراوزەنا تا ترسی نێو هەناویان بڕەوێننەوە."

٣٦- ئەگەر سووسەی ئەوەتکرد.. ئاشووبە وەنێو ریزەکانی دوژمن کەوتووە.. بزانە سەرکردەکەیان بێجەوهەرو بێشکۆیە.

**(چانگ-هاو) وتویێتی:**

"بێنیزامی لە ریزەکانی سوپادا.. گەندەڵیی سەرکردایەتی دەخاتەڕوو.. بێنیزامی لە سەروبەندی هێرش‌و.. کاتی بەرگری‌و.. وەختی کشانەوەو.. ساتی ئامادەباشیی بۆ هەڵکوتانەسەرو هەلاتنی هەنووکەیی.. کارێکی نێگەتیڤانەی بەسەر هێزی سوپاوە دەبیّ‌و.. لەو کاتانەدا زۆر لە وزەو توانای زاتیی سەربازو ئەفسەرانیش دەکێشێتەوە."

---

دەدات.. ئۆردووگەی فارسەکان -لە سەرەتای شەڕی (گۆگمەئیللا)دا.. کە ئەسکەندەری تیا سەرکەوت- رووناك‌و بە ورشەورش‌و هەراوزەنای قەرەباڵغ بوو.. ئەسکەندەر بەم فێڵی خۆ بە بەهێز نیشاندانەی فارسەکان هەڵنەخڵەتا.

[شەڕی (گۆگمەئیلا)یە.. هەر ئەو شەڕە بەنێوبانگەی ئەسکەندەرە لە نزیك شاری هەولێردا روویدا.. (و.ك)

٣٧- ئەگـەر ئـالاّو بەيرەقـەكانى دوژمنـت دى.. بەملاوئـەولادا بـە ناڕێكى دەشەكێنەوە.. بزانە ئۆردووگەكەى ئاژاوەى تێكەوتووە.

(مۆ-تۆ) وتوێتى:

"كاتێ هێزەكانى مير (شوانگ) سوپاى دوژمنـى لـە (چانگ-شـۆ)دا بەزاند.. سەركردەى سوپا داواى لە مير كرد.. ڕێگـەى بـدات راوەدووى سوپاى بەزيو بنێ.. مير لێيپرسى:

- بۆچى ؟

سەركردەى سوپا وەلاّميدايەوە:

- گاليســـكە شـــكاو دەبيـــنم بەملاوئـــەولادا بلاّوبوونەتـــەوە.. بەيداخەكانيشـيان دەبيـنم.. تەنانـەت لـە كـاتى شەكاندنەوەشـدا هـەر ناڕێـك و گێـڕن.. باشـتر وايـە تـا دوژمـن شـپرزەيەو نەكەوتۆتـەوە خـۆى تەفروتووناى كەين."

٣٨- ئەگـــەر ئەفســـەرە پێخســـيرەكانى ســـوپاى دوژمنـــت بـــە دەمـارگرژىو شـلّەژاوى دىو.. هەسـتتكرد لــە پێخســبريدا ســووكو بێشەخسـييەتو ئـارام لەبەرهـەلّگيراونو.. لــە چـاوانيانـدا زەليلــىو ملكەچـى ديـارە.. لەمانـەوە بزانـە سـوپاكەيان وێـڕاى ئـەوەى لـە پيـاوو تفاقدا زۆر گەورەوگرانيش بێ.. وەلێ ورە رووخاووبێهێزو پرزەلێبڕاوە.

(چانگ-يۆ) وتوێتى:

"زۆرى پيـاوو تفـاق گـرينگ نييـە.. بـەلّكو گـرينگ لـە بـە بـەرزى ڕاگرتنـى ورەو مەعنەوياتدايـە.. لـە بەركـەمالّيى نيـزامو شـكۆمەندێتى نێو لايەنە بەرپرسەكانى سەركردايەتى سوپاى كشاودايە."

٣٩- كاتى تێبینى دوژمن دەكەیت.. لەجیاتى گژوگیا گەنم دەكاتە ئالفى ولاخەكانى.. سەربازەكانى لەگەڵ هەموو ژەمە خۆراكێكدا گۆشت دەخۆن.. دەفرى خواردەمەنییەكانیان بە هەنگەڵیانەوە هەڵنەبەستووە.. خۆیان لە پەناوپەستێودا ناشارنەوە.. باكیان بە شەڕو مەترسى نییەو هەڵنایەن.. ئیدى بزانە سوپاى دوژمن دەخوازێ شەڕێكى گیانفیدایانەى یێكلاییكەرەوەت لەگەڵدابكات.

(وانگ-هسى) وتویێتى:

"لەجێى گژوگیا گەنم كردنە ئالفى ولاخەكان و.. لە هەموو ژەمێكدا گۆشت دەرخواردانى سەربازان.. ئەمانە هەمووى بەڵگەى ئەوەن.. سەركردایەتى سوپا بەنیازە وزەو تواناى عەسكەریى خۆى بۆ شەڕێكى یێكلاییكەرەوە ئامادەو بەهێزبكات.. ئەمجۆرە شەڕانە پێویستیان بە بەهێزگردنى ولاخ و پیاوەكان بەهۆى باشترین خواردنەوە هەیە.

ئەگەر سوپاى دوژمن فاپوقاچاغى خۆراكى فەرامۆشكردو.. لەولاوە فڕێیدان.. دیارە جگە لە مەرگى نێو نەبەرد هیچى دى مەبەست نییە.

ئەگەر سەربازانى سوپاى دوژمن.. گاڵتەیان بە گیانى خۆیان هات و.. لەودیو پەردەو پەناوپاسارەكانەوە خۆیان حەشار نەدا.. ئەمە واتاى وایە سەربازان نە هەر خولیاى بردنەوەى جەنگن.. بەڵكو دەخوازن لەپێناوى بەرگرى و سەركەوتنى شەڕى یێكلاییكەرەوەدا گیانى خۆیان بەختكەن."

٤٠- ئەگەر تێبینی سەربازانی دوژمنت کرد.. لە دەستەو گرووپی گچکە گچکەدا گرددەبنەوەو.. لەنێو خۆیاندا چرپەچرپیانە.. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە.. سەرکردایەتی بڕواو متمانەی سەربازەکانی دۆڕاندووە.[34]

٤١- ئەگەر سەرکردایەتی سۆزو بایێخێکی لەنکاوو زیاد لە پێویستی بە سەربازەکانی دا.. بەبێ هیچ هۆو پاکانەیێك..ئەوا ئەمجۆرە رەفتارە دەچێتە خانەی بەرتیلدان بە هەستو سۆزی سەربازەکانو.. مانایشی وایە سەرکردایەتی لە ڕووی هێزو توانای عەسکەرییێوە گەیشتۆتە دواقۆناغی پەرێشانی.

ئەگەر سەرکردایەتی لە مامەڵەکردنی سەربازەکانیدا.. لەپڕو بەوپەڕی دڵڕەقییێوە کەوتە پەتپەتیپێکردنو زەبروزەنگ نواندن بەرامبەریان.. دیارە پرەنسیپە عەسکەرییە دروستەکانی نێو سوپاکەی لەدەستداوە.

لەنگەر لەدەستدانی سەرکردایەتییێکان.. لە هەردوو حاڵەتدا - بردنەوەو دۆڕاندندا- نیشانەی لاوازییە.

---

[34]- ئاخاوتنو قسەوباسە هاوچەرخو دێرینە چینییێکان لەمەڕ ئەم بڕگەیەی کتێبی (هونەری جەنگ).. زوربەیان لەوەدا یێکدەگرنەوە.. کە مەبەستی دانەر ئەمەیی خوارەوەیە:

ئەگەر چرپەچرپ کەوتە نێو دانیشتنەکانی گرووپە گچکەکانەوە .. مانای وایە.. یان رەخنە لە سەرکردایەتی دەگرن.. یاخود بەتەمان لەشەڕ هەڵبێن.

٤٢- ئەگەر ئەفسەرەکان بەبێ سەبەب لەگەڵ سەربازەکاندا هێجگار توندوتیـژبوون.. دوابەدوای ئـەوە.. ئەفسـەرەکان هـەر لـە خۆیانـەوەو بەبێ هیچ هۆیێك سۆزو بایێخێکی زیاد لە پێویستیان بۆ سەربازەکان دەربڕی.. دیارە سوپا نە نیزامی تێدا ماوەو.. نە متمانەو بڕوای نیوان سەربازو سەرکردە بەرپرسەکانی ماوە.

سـەرباز خۆیشـی توانـای ئـەوەی هەیـە بەرامبـەر سـەرکردەکانی بەدڕەفتاری بکات.. تا تووڕەیان بکاتو.. ئەوسا لـە مامەڵـە زبرەکـەیان بێزاربێ.

٤٣- ئەگەر زانیت ورەی سەربازەکانی دوژمن.. زۆر بـەرزو پتـەوە.. وا باشترە لەو سەروبەندانەدا لەگەڵیدا بەشەڕەوە تێوەنەگلێیت.

بەڵکو باشتریشە لە بەرامبەری نەکشێیتەوەو هەڵنەیەیت..

پەسـەندترین رەفتـاریش لـەم هەڵوێسـتەدا : کـەمێ ددان بەخۆتـدا بگرە.. تا ڕاستیت بۆ دەردەکەوێت.. ئایا هـۆی ئـەم مەعنـەویاتو ورە بـەرزەیان چـییە.. ئـاخۆ راسـتە یـان سـاختەیە.. ئەوسـا بڕیـاری پێکـدادان.. یـان بـەرگریی.. یـان پاشەکشـەو گەرانـەوەی رێکوپێـك دەدەی.. یـان هـەوڵی کـات بەدەستخسـتنو.. فشـۆڵکردنەوەی ئـەو بەخۆنازینو خۆ بەمەعنەویات بادانەوەی دوژمن دەدەیت.

٤٩- لـە گێـژاوو کێشمەکێشـی جەنگـدا.. زۆروزەبەنـدەیی پیـاوو تفاق هیچ فەزڵو خەسڵەتێکی عەسکەرییانەی شەڕی پێکلاییکەرەوەی پێنابەخشێ.

باشتر وایە لـە پێکدانـە عەسکەرییە پێکلاییکەرەوەکانـدا.. بەتـەنێ پشـت بـە گـەورەوگرانی سـوپاکەت نەبەسـتیت.. بـەڵکو پشـت بـە باقی

فاكتەرە هونەرییێکان و.. فاکتەرەکانی دیکەش -لەبەشی دەیەمدا باسیاندەکەین- ببەستیت.[35]

٤٥- ئامانجەکانی سەرکەوتنی عەسکەرییانەو.. پرەنسیپەکانی راپەڕاندی. لەمانە زێتری گەرەك نییە: وردبینیی لە ناسینی هێزو توانای دوژمن و.. پێکهاتەکانی و ئاستی بەرگەگرتنی.. یان بەرگەنەگرتنی لە مەوقیعە (جەگرافییە)کانداو.. ئیدی سوپای کشاو هەر ئەوەندەی لەسەرە.. دەچێ خۆی کۆدەکاتەوەو.. لەو کەرتەدا لە هێزەکانی دوژمن دەدات.. ئەگەر تێیدا ئازارێکی گەورەی پێگەیاند. وزەو توانا و جموجووڵی عەسکەریی دوژمنی گۆتکردو.. سەرکەوتن بووە خەڵاتی ئەو سوپایەی دەزانێ بەباشی هێزە عەسکەرییێکەی بەکاربێنێت.. نەك ئەوەی خاوەنی گەورەترین هێزی عەسکەرییە.. سەرکەوتن هەر بۆ ئەوەیە هونەری جەنگ شارەزایە.. نەك،ئەوەی بەتەنێ پیاوو تفاقی زۆرە.

٤٦- ئەگەر سزای ئەو سەربازانەت دا رەفتاری عەسکەرییانەی ناچیزەیان لێوەشاوەتەوە.. بێئەوەی پێشوەخت دڵسۆزیی ئەو

---

[35]- هەروەکو مێژوونووسی کلاسیکی (پرۆکۆپیوس) لە کتێبەکەیدا لەمەڕ (مێژووی جەنگەکان)

History Of Wars :Procopius 

دەڵێت: هێز بەتەنێ لە ژمارەو تفاقدا نییە.. بەڵکو لە (بەتوانایی وردیی رێکخستنداو.. لە سەرکردایەتی بەسەلیقەداو.. لە مەعنەویاتی فیکرو بوێری لای هەر سەربازێگ)دایە.

سەربازانەت مسۆگەركردبێت.. سزادان لەم حاڵەتەدا دەبێتە مایەی هەڵگەڕانەوەو یاخیبوون.

ئەگەر سەربازان دڵسۆزییان لا نەماو مەیلی یاخیبوون کەوتە کەللەیانەوە.. ئەوا خێریان نە بۆ خۆیان دەبێتو.. نە بۆئەو سوپاو میللەتەی بەرگریی لێدەکەنو شکۆمەندیی بۆ بنیاددەنێن.

ئەگەر سەربازان زۆر دڵسۆزانە پابەندی ئەرکە عەسکەرییەکان بوون.. وەلێ لە سزادانی لەسەر هەق هەڵاتن.. بەرەو سەرپێچیکردنی نیزامی عەسکەری.. لەسەروبەندی شەڕو بەر لە شەڕو دوای شەڕیش.. ئەمجۆرە سەربازانە بۆ ئەرکی پاراستن و بەرگری لە میللەت هیچ خێرێکیان بە نێوچەوانەوە نییە.

٤٧- کەواتە دەبێ نیزام بەسەر سەربازاندا بسەپێنرێو.. ئەوانەی گاڵتە بە نیزام دەکەن تەمێبکرێنو.. هەروەها دەبێ سەرباز لەوە تێبگات.. نیزامو سزا بۆ بەرژەوەندیی سەرباز خۆی پێویستە.. سەرباری بەرژەوەندییمیللەت.. کە بۆ بەرگری لێی.. یان بۆ بەزاندنی دوژمنو گێڕانەوەی مافەکانیو بۆ بنیاتنانی سەروەریی نەتەوەش.. هەموو ئاواتو ئومێدەکانی بەوەوە بەستووە.. سەرکەوتنیش هەر بۆ ئەمجۆرە سەربازو سەرکردایەتیانەن.

پیاوی عەسکەریی ئەرکی مەزنی لە ئەستۆیە.. ئەرکی پاراستنی مافەکانی میللەت لە بەرامبەر دوژمنەکانی.. سەرباز خۆیشی بەشێکە لەو میللەتە.

٤٨- کاتێ ئەفسەر پرەنسیپەکانی نیزامی عەسکەرییو ئەرکی سەرکردایەتی.. بەوریاییو دادپەروەرانەوە بەسەر هەموو کەسیکی

هێزە چەکدارەکاندا جێبەجێدەکات.. ئەوا پێوەندیی نیوان هەردوولا ڕاستو ڕەواندەبێت.. هەردوولا لە ئەرکە سەربازییێکەدا هاوبەشن.. ئەفسەر ئەرکی خۆی بۆ سەپاندنی نیزام دەبینێو.. سەربازیش ئەرکی خۆی لە پابەندبوونو پێڕەوکردنی نیزامدا دەبینێ.

لەم هاوئاهەنگیو هاوبەشیکردنەی ئەرکە عەسکەرییێکاندا.. هێزی سوپای کشاو.. هێزی سوپای مۆڵگەخواردوو.. هێزی سوپای پارێزەر.. هێزی ئەو سوپایەی لە هێرشدایە بۆ سەر ئەو دوژمنەی مافەکانی نەتەوەی زەوتکردووە.. یان هەڕشە لە مافەکانی دەکات.. لەو هاوئاهەنگییەدا ئەم هێزە ڕاستو دروست دەبێتەوە..

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١-هەڵکەوتی زەوی جەنگ بەم شەش جۆرە پۆلێندەکریّ:

دەشت (تەختایی): ڕێگەوبانی زۆری بەسەرەوەیەو.. بۆ جموجووڵو هاتوچۆ ئاسانو بیّ گیروگرفتە.

رەقان.. سەختان: بۆ هاتوچۆی پیادە زەلامو وڵاخو گالیسکە ناڕەحەتە.

مۆلەق: ئەو زەویەیە نە تۆ نە دوژمن هیچکامتان دەستتان بەسەریدا نەگرتووە.

دژوار: دەکەوێتە نێو دۆڵو بە چیای بڵند دەورەدراوە.

مەرگئاوەر.. هاتونەهات: بە چیاو روبارو نشێویو زۆنگاوو هەڵدێری خلیسك تەنراوە.

بەرین: هەردوو سوپای شەڕکەر تێیدا دوورەپەرێز بەرامبەر یێکدی دەوەستن.

٢- لە دەشتاییدا وزەی هەردوو سوپا بۆ کۆنترۆڵکردنی زەوییێکە چونییێکدەبن.. کامیان پێش ئەویدی بکەوێتو.. هێڵو ڕێگەکانی هاتوچۆو تەموینو جموجووڵی عەسکەریی لەم خاکەدا زامنکرد.. ئەوا لە مەیدانی شەڕدا خەسڵەتی باشترو هەلی لەبارتری بۆ دەرەخسێت.

٣- لە زەوی رەقەندا.. سوپا لە سەروبەندی کشان بەرەو دوژمندا.. دەتوانیّ پێیدا تێپەڕیّو بڕوات.. وەلیّ لە گەڕانەوەو هەڵاتنی ناچاریی ژێر زەبری دوژمن.. ئەوا دووچاری ناڕەحەتیی دەبێت.

هەمدیسان لە کاتی شالاّوو هەلاّتنە هەنووکەییێکان (کر و فر)ی سەروبەندی شەڕیشدا..

لەم چەشنە زەوییە سەخت و ڕەقەنەدا.. ئەگەری سەرکەوتن ها بەلای ئەوەی دەسپێشخەری هێرشەو.. بەرلەوەی دوژمنەکەی کەوتبێتە خۆی غافڵگیری دەکات.

ئەگەر دوژمن لەو جۆرە زەوییەدا لەوپەڕی ئامادە باشیدا بوو.. هێرشبردنە سەری جۆرێکە لە سەرەڕۆیی و سەرچڵی و جەربەزەیی.. لە باشترین حاڵەتیشدا دەسکەوتی عەسکەریانەی هیچوپووچ نەبێ چیدی لێچاوەڕوان ناکرێ.. چونکە ئەگەر هێرش و شەڕەکەت نەبردەوە.. ئەوا کشانەوە بەم زەوییە ڕەقانەدا گران لەسەرت دەکەوێت و.. لەوانەشە بەرەو دۆڕان و تەنانەت فەوتانیشت ببات.

٤- لە زەوی مۆلەقدا.. لایەنی باش و خراپ (ئەرێیی و نەرێیی) بۆ هەردوو تەرەف چونییێکن.

لەم تەرزە خاکەدا.. وریای خۆتبە !.. دوژمن بۆ شەڕ هەڵتنەفریوێنێ و.. وەنێو تەڵەوداوی خۆیت نەخات.

لەم حاڵەتەداو بۆئەوەی تۆ ئەو لە خشتەبەریت.. وا باشترە لەسەر کشانی خۆت بەردەوامبیت و.. لەو شوێنانەدا لەگەڵیدا بەشەڕبێیت.. کە لە رووی _تۆبۆگرافی- و عەسکەرییێوە بۆ تۆ لەبارو پەسەندترە تا بۆ دوژمن.

**( چانگ-یۆ ) وتوێتی :**

"لە کتێبی (پڕەنسیپەکانی جەنگ)ی (لی-شینگ)دا هاتووە:

"ئەگەر لەو زەوییەی سوپای کشاوو سوپای دوژمنی تێدا بەیێکدەگەن.. خەسڵەتی باشی بۆ هیچکامیان تێدا نەبوو.. زیرەکی لەوەدایە.. چۆن خۆت وا نیشاندەدەیت گوایە لە دەستی هەڵدێیت و.. ئەویش فریوخواردوانە وەدووتدەکەوێت.

ئیدی چاوەڕوانبە تا نیوەی هێزەکانی ئەو زەوییە مۆڵەقە دەبڕن.. ئەوجا شاڵاوێکی لەنکاوی بۆ دەبەیت."

٥- ئەگەر ناچار بوویت زەوییێکی دژوار بگریت.. ڕێگەکانی چوونەدەرەوەی لە دوژمن بڕەو.. چاوەڕوانی نزیکبوونەوەی بە.

ئەگەر دوژمن خۆی ئەو زەوییە دژوارەی بەر لە تۆ گرتبوو.. ڕێگەکانی دەرچوونیشی لێبریبووت.. لێگەڕێ با بۆخۆی بێت.. وەدووی مەکەوە.

هەر لەم حاڵەتەدا.. ئەگەر دوژمن ڕێگە دژوارەکانی دەرچوونی بەباشی نەگرتبوو.. تۆ ڕێی چوون و دەرچوونیشی لێبگرە.

لە خاکی مەرگئاوەردا.. هەوڵبدە بەر لە دوژمن نێوەندە گرینگە ستراتیژییەکان کۆنترۆڵ بکەیت.. لە بەرزاییە روو لە خۆرهەڵاتەکاندا[٣٦] دامەزرێ و.. چاوەڕوانی جموجووڵی دوژمن بکە!

---

[٣٦]- دانەری (هونەری جەنگ) لە بەکارهێنانی چەمکی خۆرهەڵات یان هەڵاتنی خۆردا مەبەستی لە (باشوور)ە.. وەك لە پەراوێزێکی پێشووتردا ئیماژەی پێدراوە.. هەروەها دانەر وشەی (سێبەر)یشی بەواتای (باکوور) بەکارهێناوە.. پێدەچێ لەم رۆژگارەماندا خۆبەستنەوە بەم سەمتە جوگرافیانەوە هێندە بایێخدار نەبێ.. چونکە مەبەستی ئەم دانەرە دێرینە.. لەم ئیماژانەدا هەمان مەبەستی ئەمڕۆ نییە.

ئەگەر دوژمن پێشتکەوت و.. ئەونێوەندە (ستراتیژی)یانەی لێگرتیت.. لەگەڵیدا مەکەوەرە شەڕەوە.. بەڵکو بە کشانەوەت تەفرەیبدە.. با وەدووتکەوێ و ئەو نێوەندە پۆزەتیڤانەی جێبێڵێ.

**(چانگ-یۆ) وتویەتی:**

" دەشێ.. نرخ و بەهای ئەو نێوەندە (ستراتیژی)یە گرینگانە.. لەو خاکە مەرگئاوەرانەدا لەچاو خاکی دەشتاییدا.. چەندین جار گرینگترو بایێخدارتربێت.. کەواتە لەو خاکی هات و نەهات و مەرگئاوەرەدا.. زۆر پێویستەو دەبێ لە گرتنی ئەو نێوەندە ستراتیژیانەدا وەپێش دوژمن بکەویت."

٧- ئەگەر زەوییەکە (زەوی مەیدانی شەڕ) فراوانبوو.. دووری نیوان تۆو سوپای دوژمن لێوەی بەقەدەر یێکبوون.. هێزی عەسکەریی دوژمنیش هاوشانی هێزەکانی تۆبوو.. کارێکی گران و نابەجێیە تۆ دەسپێشخەری شەڕکردن بیت لەگەڵیدا.. چونکە (بەهۆی دووری مەسافەی نیوانتانەوە) بەتەواوی نازانیت ئاستی ئامادەباشیی و دامەزراوی هێزەکانی دوژمن لەو بنکە ستراتیژییە گرینگانەی بۆ بەرگری و هێرشبردن هەڵیبژاردوون.. چەندەو چەند نییە.

٨- ئەمانە ئەو پرەنسیپانەن.. ئەو شەش جۆر (هەلومەرج)ەی تەبیعەتی زەوی دیاری و دابیندەکەن.. ئەرکی سەرکردایەتی عەسکەریش ئەوەیە.. زۆر بەوردی هەڵکەوتەو تەبیعەتی زەوییەکە تاوتوێ بکات و.. ئەوپەڕی توانایشی بۆ تێگەیشتنی (تۆبۆگرافی)یانەی خاکەکە بخاتەکار."

(مای-یاو-چان) وتویێتی:

"هەڵکەوتەی خاك.. بنچینەی ئەو کۆڵەکانەیە بۆ نەخشەدانانی سەرکەوتنی عەسکەریانە بە هانای دوژمنەوە دێت."

٩- ئەگەر سەربازەکان شکان و کشانەوە و ناچاری هەلاتن بوون.. هەلاتنەکەشیان ناڕێك و شپرزە.. هەناوی سەرباز پڕ جەخارو.. دڵیان پڕحەسرەت و.. هەستیان بە بەزین بریندارو.. سەرباری ئەمانەش لەنێو ریزەکانیدا هەڵگەڕانەوە و یاخیبوونی تێکەوتبوو.. گوناه و تاوانی ئەم حاڵەتە لە ئەستۆی سەرکردەی سوپادایە.

ئەم نەهامەتیانە لە سەروبەندەکانی گەڕانەوە و کشانەوە و بەزین و هەلاتندا.. ئافاتگەلێکی سروشتی نین.. بەڵکو دەرئەنجامی شپرزەیی و بێسەروبەریی ئەرکی سەرکردایەتییێکانن.. چۆن بە رێکی و بەرنامەداری و نەخشەسازییێوە حساب بۆ کشان و هێرشبردن و سەرکەوتن دەکەن.. دەبوایە ئەئاواش حسابیان بۆ کشانەوە و گەڕانەوە و هەلاتنیان بکردایە.

١٠- ئەگەر ورەی سەربازانی هەدوو سوپای بەشەڕهاتوو چونییێکبوون.. هەروەها جۆری ئەو چەکانەی بەکاریاندێنن و.. ئەو پێداویستیە جۆراوجۆرە عەسکەریانەو.. ئاستی مەشقی هونەری و.. گشت ئەرك و پیشە عەسکەرییێکانی دی لە ئاستێکی هاوشانی یێکدیدا بوون.. بەلام ژمارەی سەربازی لاییێکیان دە هێندەی ژمارەی سەربازی دوژمنەکەی بوو.. بێگومان چارەنووسی سوپای کەم سەرباز بەزین و تێکشکاندنە.. (بەهۆی ئەو رێژە کەمەیەوە: ١ بە ١٠).

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"ئەگەر بارودۆخەکە ناچاری کردیت بۆ دوژمن بچیتە مەیدان و.. هێزەکەی ئەو دە هێندەی ئەوی تۆ بوو.. دەبێ بەر تێوەگلان لەگەڵیدا.. چەند شتێکی گرینگ هەن رەچاویان بکەیت.. لەوانە: ئاستی سەلیقەی (ستراتیژی) لای سەرکردایەتی سوپای دوژمن.. ئاستی جوامێری و ترسنۆکی لەنێو ریزەکانیدا.. وەزعی کەشوهەوا.. خەسڵەتەکانی هەڵکەوتی ئەو خاکەی دوژمن مۆڵگەی تیا خواردووە.

ئەمجا دەبێ بزانی ئایا ئازووقەی سوپاکەی فرەو تەواوە.. یان سەربازەکانی برسین و تفاقەکانیشیان هیچ وپەەچن.. ئاخۆسەربازانی دوژمن بەتاقەت و حەوسەڵەن.. یاخود بێتاقەت و شەکەت و پرزەلێبڕاون !؟"

١١- ئەگەر سەربازانی نێو سوپای دوژمن بەتاقەت و توانابوون و.. ئەفسەرەکانیان لاوازبوون.. ئاکامی ئەمە بە کارەساتی یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەییەکی زۆری نێو سوپاکە دەشکێتەوە

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"واتای ئەو بڕگەیە (بڕگەی ١١) ئەوەیە: سەربازو عەریفەکان جوامێرو سەنگین و کەللەڕەقبن و.. ئەفسەرەکانیش بە سەرکردەکانیشەوە..بێشەخسییەت و بوودەڵەبن.

لە سەروبەندی بنەماڵەی (تانگ-شینگ)دا.. (تیان-بۆ)ی سەرکردە.. سەرکردایەتیی هەڵمەتێکی دژ بە دوژمنان لە کەرتی (دانگ-تینگ-شۆ)دا کرد.

ئـــەم ســـــەرکردەیە لەلایــــەن ســــەربازان و هاونیشـــــتمانیانی (سقیل)یشەوە بێحورمەت و سووکبوو.. سوپا و ئۆردووگەکانی بوونە مۆڵگەی بەرەڵڵایی و هەموو رەفتارێکی دژ بە نیزامی عەسکەرییانە.. سەرکردە جڵەوی لە دەست دەرچوو.. خۆی و ئەفسەرەکانیشی لای سەربازان و خەڵکیش بێحورمەتبوون.. بۆیێ هەرچی هەوڵێکی بۆ هەڵمەتبردنە سەر دوژمن دا مایەپووچ دەرچوو.. دواجار ناچاربوو خۆی سەرببڕێت."

١٢- ئەگەر ئەفسەرەکان لە جوانترین ئاستی ئاکارو توانا و کەسێتی بەهێزدابوون.. وەلێ سەربازەکان لەئاستێکی کڵۆڵ و کەساسی ئەخلاقی و تێنەگەیشتنی ئەرکە عەسکەرییەکاندابوون.. ئەم سوپایە و لە ئەو حاڵەتەدا هێندە بێسوودە.. وەك لە خانەی نەبواندابێ وایە.

١٣- ئەگەر ئەفسەرانی پلەبەرزی نێو سەرکردایەتی.. کۆمەڵە کەسانێکی تووڕەوتڕۆ بوون و.. لە هاوەڵانی سەرکردایەتی خۆیان و لە سەربازان و لە خەڵکیش هەڵگەڕانەوە..

ئەمجۆرە سوپایە هەر لەگەڵ دوژمن بەشەرهات.. ئەنجامی شەڕەکە حەتمەن بە بەرژەوەندی دوژمن دەشکێتەوە.

ئەم تەرزە گەورە ئەفسەرە تونەتەبیعەت و تووڕەو تڕۆیانە.. بەبێ کۆشش و لێهاتوویی عەسکەریانەی خۆیان بەو پلەو پایانە گەیشتوون.. ئەمانە بە فاکتەری سیاسی و شێوازی دیکە پێگەیشتوون.

ئەمجۆرە ئەفسەرانە گرفتو ئاژاوە بۆ ئەهلی کارەکە دەنێنەوە.. بۆ ئەو پیشەکارانەی بەرپرسن و خاوەنی مەعریفەو توانای عەسکەریانەن.. هەروەها کێشەو ئاژاوە بۆ ئەوانەی ژێردەستیشیان دەنێنەوە.. وەك گچکە ئەفسەرو سەربازەکان.

درێوترین نموونەی ئەفسەر.. ئەو ئەفسەرە گەوج و دەبەنگانەن خۆیان بە لێزان و پسپۆڕ دادەنێن.. ترسنۆکن و فیشالی جوامێری لێدەدەن.. یان هەر بەجارێ وەحشی و بێئەخلاقن و.. خۆیان لەپشت ئەو نیشانە عەسکەرییانەدا دەشارنەوە کە بە هەق و لێهاتوویی خۆیان وەریان نەگرتوون.. بەڵکو لە بارودۆخێکی کلۆڵیدا وەریان گرتووە کە زۆر لەسەر کەرامەتی سوپا و.. بەرژەوەندییێکانی نەتەوە کەوتووە.

(تساو-تساو) وتوێتی:

"ئەفسەلای لەم بابەتە خۆی بەو شتەوە هەڵدەکێشێ هیچی لێنازانێ و.. ملکەچی سەرۆکەکانی نابێ.. بەو بیانووەی گوایە ئەویش وەك ئەوانەو.. هیچی لەوان کەمتر نییە.. یاخود ئەو سەرۆکانە هێندەی ئەو ئەفسەرانەی بارودۆخی کلۆڵی هێناونی و.. پایەی گرینگیان لە پێکهاتەی سوپا و سەرکردایەتیدا داونەتێ.. هێندەی ئەمانە دەسەلاتیان نییە.

ئیدی هەر کاتی پێکدادان لەگەڵ دوژمندا هاتەپێشەوە.. ئەمجۆرە ئەفسەرە چەپەلانە.. خۆیان بە ئازاو جوامێرو دڵسۆز نیشاندەدەن.. لە کاتێکدا ئەمانە دواهەمین کەسێکن ئەم خەسڵەتانەیان تێدابێ و بۆ ئەم ئەرکانە بشێن.

ئەنجامیش بەزینی خۆیان و سوپاکەیەو.. هەروەها شەرمەزاریش هێنانە بەسەر ئەو وڵاتەی ئەم پلەو پایانەی بەبێ لێهاتوویی و بەناهەق پێبەخشیون.

١٤- ئەگەر کەسێتی سەرکردە لاوازو ئەخلاقی جێی گومان و خۆی بێورەو.. نەشیزانی بە باشی نیزام بەسەر هێزە چەکدارەکاندا بسەپێنێ.

ئەگەر فەرمان و بەیان و رێنماییێکانی تەمومژاوی بوون و.. لە دانایی و بەسەلیقەیی هونەری جەنگ و تەبیعەتی سەربازو بارودۆخ و پێچوپەناکانی رەوشی عەسکەریی بەتاڵبوون..

ئەگەر سەرکردە لە فەرمانەکانیدا راراو.. لە رەفتارەکانیدا شپرزەبوو و ئاژاوەیشی خستە زەینی ئەفسەرو نێو ریزەکانی سوپاوە.

ئەگەر پێکهاتە عەسکەرییێکانی فشۆڵ و هیچ وپووچ بوو..

ئەمجۆرە سەرکردایەتییانە کۆست و کارەسات بەسەر ئەو هێزە چەکدارەدا دێنێ لەژێر رکێفیایەتی و.. بەسەر ئەو نەتەوەکەی خۆیشیدا.

١٥- ئەو سەرکردەیەی نازانێ.. یاخود ناتوانێ پێشوەخت ئاگاداری هێزو تواناکانی دوژمن بێت.. هەروەها ئەو سەرۆکەی ناتوانێ پیاوی گونجاو بۆ ئەرکی گونجاو هەڵبژێرێ..ئەوە سەرکردەییێکە کەژاوەکەی پڕە لە کەنەفتی و بەزین.. نەك سەرکەوتن بەسەر دوژمندا.

( تساو-تساو ) وتوێتی :

"خەڵکی وڵاتی (هان) بایێخێکی زۆریان دەدا بە هەڵبژاردنی پیاوانێ لە ئەفسەران و سەربازان بۆ هێزە چەکدارەکانیان.. تیپی (سوارچاکان لە هەر سێ روبارەکە) ناونابوو (هاوەڵانی شمشێر).. خەڵکی میرنشینی (قۆ) پوختەی سەربازە هەڵبژاردەکەیان ناونابوو (چارکارانی گرفت).. خەڵکی میرنشینی (چێ)یش تیپی بروسکەیان ناونابوو (سوارچاکانی چارەنووس).

لە میرنشینی (تانگ)دا.. باشترین سەربازەکانیان ناودەنا (پاڵەوانانی گەروو و بازوو)[37]

واش باوبوو سەرکردەی سوپا خۆی.. لە یێکەمین هەلێکی لەباردا دوای مۆڵگەدانی سوپا.. بۆ خۆسازدانی چوونە نێو شەڕەوە.. ئەرکی هەڵبژاردنی مەغاویر (سەربازانی دەستەبژێر)ی دەگرتەئەستۆ.

"سەرکردە لەنێو دەهەزار سەربازو ئەفسەردا.. هەزار ئەفسەرو سەرباز لە باشترین پیاوەکانی بۆ تیپەکانی مەغاویر هەڵدەبژێرێ و.. لەوانە دە (١٠) تیپی تایبەتی پێکدەهێنێت."

( چانگ-یۆ ) وتوێتی :

هەر دەبێ تیپە مەغاویرەکان لە جەنگدا بەکاربهێنرێن.. لەبەرئەوەی:

---

[37]- پێدەچێت ئەم پاڵەوانانە لای دانەری (هونەری جەنگ).. ئەو جۆرە (مەغاویر)انە بن.. ئەرکی پێشڕەوی سوپایان لە ئەستۆ دەگرت و.. لە یێکەمین جەنگاوەرانێ بوون کە بە هەراوزەنا هێرشیان دەبردە سەر دوژمن.

یێکـەم: وەکـو سـەرەڕم وانو.. لـە جـۆشوخرۆشو ئازایـەتیو توانای شەڕکردنی ئەمانەوە.. باقی سوپا ترسی دەشکێو ورەو تینی شەڕکردنی تێدەزێ.

دووەم:چـونکە لـە توانـای مـەغاویردا هەیـە وەك دەمەتیژەکـەی شمشێر.. بە کورتترین کاتو بەهێزترین لێدان.. دوژمـن لـە پـەلوپۆ بخات."

١٦- هێنـدەی پێوەنـدیی بـەم شـەش حاڵەتـەی تەبیعـەتی زەوییـەوە هەیـە .. گـرینگترین بنچـینەکانی ئـەرك.. دەبـێ سـەرکردایەتی زۆر بەوردی رەوشـەکە هەڵسـەنگێنێ.. بەرلـەوەی لەگـەڵ دوژمنـدا بـە هـیچ شەڕێکەوە تێوەگلێ.

١٧- چونکە تەبیعەتی زەوی کارێکی گرینگ دەکاتە سەر ڕێبازی شـەڕەکە.. ئـەو سـەرکردایەتییەی زانیـاریی تـەواوی هـەبێو.. دەسـەڵاتێکی باشیشـی بەسـەر هەڵکـەوتی خـاکی شـەڕەکەدا گرتبـێ.. ئەوا لە زوربەی حاڵەتەکاندا هەلی سەرکەوتنی بۆ دەرەخسێ.

١٨- هەنـدێ جـار (بەنموونـە) سـەرکردەی هێرشـەکە.. لـە پایتەختـەوە.. یـان لـە پاشـاوە.. (یـان لـە سـەرکردایەتیی بـاڵای هێـزە چەکدارەکانەوە)..فەرمانی پێدەدرێت.. دەست بە شەڕ بکات.

ئەگەر ئەم سەرکردەیە بینی تەبیعەتی خاکەکە بۆ سەرکەوتن لەبار نییـە.. بـۆی هەیـە فەرمانەکـە پشـتگوێ بخـاتو.. هـەروەها بەپێچەوانەیشەوە.

١٩- بەرزو بەهادارترین نموونەی سەرکردەی عەسکەریی ئەوەیە ناوبانگو شکۆمەندیی شەخسیی خۆی مەبەست نییە.. بەڵکو سەرکەوتنی نەتەوەیی مەبەستە.

( لی-شوان ) وتوێتی :

"ئەمجۆرە سەرکردە عەسکەرییە.. ناخوازێ لای پاشای وڵات.. یان لای شالیاری جەنگ.. پلەوپایەی تایبەتمەندی هەبێت.. بەڵکو دەیەوێت ئەرکی عەسکەریی خۆی بە پەسەندترین شێوە راپەڕێنێ."

( مۆ-تۆ ) وتوێتی :

"ئەمجۆرە سەرکردە عەسکەرییە خاوەن شەخسیەتو بیروڕا سەربەخۆو ئازادە کەمو دانسقەن."

٢٠- پێوەندیی سەرکردە بە سەربازانەوە.. دەبێ وەك پێوەندیی باوكو کوڕبێت.. ئەگەر دڵسۆزانە بایێخی بە کاروباریان دا.. ئەوا ئەوانیش رێزو خۆشەویستیان بۆی دەبێو.. تا مردن پشتگیری دەکەن.

سەرکردەی وا.. بۆئەوە سزایان نادات تا سامو هەیبەتی خۆی بنوێنێ.. سزادان لای ئەو بە مەبەستی دوورخستنەوەی ئاکامە خراپەکانی کەمتەرخەمیو بەرەڵاییە بەسەریانەوە.. سەربازیش هەر بە ئەزموونو سەلیقەی خۆڕسکی خۆی.. دەزانێ ئەو سەرکردەیە لە مامەڵەکردنو بەتەنگهاتنەوەیاندا چەنێ دڵسۆزە.

( مۆ-تۆ ) وتوێتی :

"لە سەروبەندی شەڕوشۆڕی (میرنشینە بەشەڕهاتووەکان)دا.. نێودارترینو لێهاتووترینو سەرکەوتووترینو لە هەموویان براوەترین

سەرکردە لە جەنگەکاندا.. (فۆ-چیێ) بوو.. ئەم سەرکردەیە.. شەوانە کونو قوژبنی ئۆردووگەکەی دەگەڕا.. بە دەستی خۆی خۆراکی بۆ ئەو ئەفسەرانە دەبرد لە شەڕدا دوژمن پێکابوونیو.. بەخۆی دڵنەوایی دەکردن.

ئەم سەرکردەیە سادەو بێفیزبوو.. خۆی ئازووقەی خۆی هەڵدەگرت.. بەردەستەکانی بۆ کاروباری تایبەتیی خۆی بەکارنەدەهێنا."

**(چانگ-یۆ) وتویێتی:**

"لە (لیستی ئاکاری عەسکەریی)دا هاتووە: دەبێ سەرکردە یێکەم کەس بێ لەنێو هەموو سوپاکەداو.. بەرلە ئەفسەرو جەنگاوەرانی دی.. هەست بە ماندوێتی بکات.. تا بزانێ سوپاکەی تا چ رادەیەك بەرگەدەگرێ.

لە قرچەی هاویندا سەرکردە.. نە سێبەرێکی خۆشتر لەوەی سەربازەکان پەنای وەبەردەبەنو.. نە دەوارێکی باشتر لە هی ئەوان بۆخۆی تەرخاندەکات.

لە ساتە خەتەرناکەکاندا.. دەبێ سەرکردە سەربازێ بێت لەنیو ریزی سەربازەکاندا.. وەك ئەوانیش هەست بە سامناکیی شەڕەکە بکات.

ئەگەر سەربازەکان تینووبوون.. دەبێ سەرکردە ئاو بۆخۆی قۆرغ نەکات.. نابێ باشترین خۆراك بۆخۆی دانێو سەربازەکانی خۆراکی خراپو پاشاخوڕ بخۆن.

دەبێ سەرکردە ددان بەخۆیدا بگرێو.. سوپاکەی بەتەواوی خۆی دامەزرێنێ.. ئەوجا سەرکردە لە دەوارەکەیدا بحەوێتەوە."

٢١- ئەم ئاکارە عەسکەریانە.. ئەرکگەلێکی سەرکردایەتین.. بڕیارو ڕەفتاری توندوتۆڵو بوێرانەو پێداگرتنی گەرەکە.

ئەگەر سەرکردە لە نازهەڵگرتنی سەربازەکاندا زێدەڕەویکرد.. ئیدی ناتوانێ نیزام بەسەریاندا یسەپێنێ.. سەربازان ئەم لاواندنەوەیە خراپ لێکدەدەنەوەو.. بە لاوازیی شەخسیەتی سەرکردەی دادەنێن.. لەم حاڵەتەدا سەربازان وەك منداڵی نازپێدراو گرۆزیدەکەن.. نازهەڵگرتنو لاواندنەوە خوویان شەڕدەکاتو.. پابەندی نیزام نابنو.. فەرمانەکانی سەرکردە پشتگوێ دەخەن.

( چانگ-لی ) وتوێتی:

"ئەو سەرکردەیەی لایەنی توندوتۆڵی فەرامۆشدەکاتو.. جڵەوی سۆز بۆ سەربازان شلدەکات.. هەڵەدەکات.. چونکە هەیبەتی نامێنێو.. سەربازانیش چوون منداڵی بەناز مەیلی سەرپێچی فەرمانیکان دەکەن.

سەرکردە مەزنەکان.. ئەوانەن خۆشەویستیو ترسو ڕێز پێکەوە بەسەر سەربازەکانیاندا فەرزدەکەن.

جارێکیان سەرکردەی بەنێوبانگ (تساو-تساو) فەرمانیدا.. نابێ وڵاخی سەربازو ئەفسەرەکان توخنی کێڵگەی گەنمی ناوچەکە بکەونو مەزراکە بشێوێنن.. دەنا لە سزای ئەوەدا سەریاندەبڕێ.

وا رێکەوت سەرکردە خۆی ئاگەداری نەبوو.. ئەسپەکەی وەنێو کێڵگەکە کەوتبوو.. گوڵە گەنمەکانی دادەپاچی.. سەرکردە فەرمانی بە جەللاد دا.. ملی سەرکردە خۆی بپەڕێنێ.

گەورە ئەفسەران وەنێوکەوتن و لێی پاڕانەوە.. ئەو فەرمانە قورس و گرانە بەسەر خۆیدا جێبەجێ نەکات.

سەرکردە ناچاربوو بە قسەیان بکات.. وەلێ جەختی کرد دەبێ (هەر بۆ تەمێکردن) سەری پاك بتاشن.. تا بۆ سەربازەکانی ببێتە پەند (نموونە)و.. ئەمەیش بەڵگە بێت بۆئەوەی دەبێ سەرکردە خۆی یێکەمین کەسێ بێت.. فەرمانە عەسکەرییێکان بەر لەوان جێبەجێ بکات.

نهێنی مەزنیی سەرکردە ئەمانەیە:

ئەگەر ئەوەی بۆ خۆتت دەوێ بۆ سەربازەکانیشت بۆێ.. ڕێزیان مسۆگەردەکەی.

هەموو شێوازەکانی ترس و توندوتۆڵیی بەسەر سەربازەکاندا فەرزکە.. بەمەیان سڵەمینەوەیان لێت و گورجوگۆڵییان لە راپەڕاندنی فەرمانەکانتدا زامندەکەیت."

٢٢- ئەگەر سەرکردە لەوە دڵنیابوو.. سوپاکەی دەتوانێ دەست لە دوژمن بوەشێنێ.. وەلێ سەرکردە لەوە بەگومانبوو سوپای دوژمن لە بەرگریکردندا دەسەپاچە بێت.. یان ئاخۆ بەرامبەر دەستوەشاندنەکە ئەویش دەتوانێ تێیسرەوێنێ یان نا!؟ ئەوا بەختی سەرکردە لەمەڕ سەرکەوتن نیواو نیوە (پەنجا دەر سەد).

٢٣- ئەگەر سەرکردە زۆر لەوە دڵنیابوو.. هێزی دوژمن هێندە لاوازە.. پاکانە بۆ سەرکردە دەکات دەستبکاتە هێرشبردنە سەری.. بەڵام بەهۆی ڕەوشی نالەباری (تۆبۆگرافی) زەوی شەڕەکەوە.. ئەو کارە لە بەرژەوەندیی ئەم نییە.. ئەگەر کردیشی بەختی لە سەرکەوتندا هەر نیوانیو (لە سەدا پەنجا) دەبێ.

٢٤-لەبەرئەوە سەرکردە عەسکەرییە مەزنەکان.. ئەوانەی خاوەنی ئەزموونو کولتووری عەسکەرییانەی ڕەسەنن.. بەتەنگ ئەوەوەن لە هێرشبردنە سەر دوژمندا.. خۆیان لە سەرچڵێتی بپارێزن.. دەبێ سەرکردەی هێرشبەر هەر زوو لەوە دڵنیابێت.. لە زۆرو زەبەندەیی داهاتو بەرزیی ورەو زۆرزانیی عەسکەریانەو گورجوگۆڵیی جموجووڵو لەباریی ڕەوشی (تۆبۆگرافی) خاکی شەڕەکەوە.. لە هەموویاندا بەسەر دوژمندا باڵادەستە.

٢٥- کەواتە ئامۆژگاریم بۆ پیاوە عەسکەرییەکان:

دوژمنەکەت بناسە.. خۆیشت بناسە.. بەتەواوی بێگومانبە ئامانجەکانی سەرکەوتن مسۆگەر دەکەیتو.. چ لە شاڵاوو هەڵاتنی هەنووکەییداو چ لە هێرشەکانداو چ لە بەرگریکردنیشدا.. دووچاری زیانو ئازار نابیت.

هەموو ئەوانەش بزانە لەمەڕ هەڵکەوتنی زەوی (تۆبۆگرافی)و باری کەشوهەوا.. پێویستن بیانزانیت.. ئەگەر دڵنیابوویت هەموویان بۆت سازو لەبارن.. ئەوا سەرکەوتنت مسۆگەرە.

# بەشی یانزەهەم

## تەبیعەتی زەوی و هەلومەرجی شەڕ[38]

[38]- لە دەقە ئەسڵییەکەی ئەم بەشەداو بەشی سیانزەهەمیشدا.. هەندێ ناتەبایی لە ناونیشانی بەشەکەو.. هەندێ لە بڕگەو واتاکاندا هەیە.. چەندین وتەبێژو بەرچڤەوانی ئەم بەشە ناونیشانی (نۆ نموونە لە تۆبۆگرافیای زەوی)یان بۆ هەڵبژاردووە.. ئەمەیش بۆ جیاکردنەوە لە بەشی پێشوو (دەیەم).
هەروەها هەندێ ناتەبایی و تەنانەت وێکچوون و تێکەڵ و پێکەڵی دیکەیش لە بڕگەکانی ئەم بەشەدا هەیە.. ئێمە پشتمان بەو دەقە بەست.. جەنەراڵ گریڤیت لە چاپی زانکۆی ئۆکسفۆرددا ساڵی ١٩٦٠ بەکاریهێناوە.

(سۆن-تزو) فەرموویەتی:

١- دەتوانین جۆرەکانی ئەو زەویانەی دەکرێنە (شەڕگە).. "بۆ ئامانجەکانی بەگەڕخستنی سەرباز لە جەنگدا".. بەسەر نۆ بەشدا پۆلێنیان بکەین:

(١) زەوی لەبار بۆ پرۆسەی راوەدوونان.

(٢) زەوی لەبار بۆ شەڕە سەر سنوورییێکان

(٣) زەوی لەبار بۆ شەڕە پێکلاییکەرەوەکان.

(٤) زەوی لەبار بۆ شەڕی پێکدادان.

(٥) زەوی لەبار بۆ شەڕە ئاراستەکراوەکان.. یان بۆ شەڕە چڕوپڕو هەمەلایەنەکان.

(٦) زەوی لەبار بۆ شەڕە گرینگەکان.

(٧) زەوی لەبار بۆ شەڕە سەختەکان.

(٨) زەوی لەبار بۆ شەڕی گەمارۆدان.. یان ئانلۆوقەدان.

(٩) زەوی لەبار بۆ شەڕی مەرگ‌و ژیان (گیانفیدایی)

٢- ئەگەر سوپای ویلایەتێك لە ناوچەکەی خۆیدا شەڕیکرد.. لەوەدا پرۆسەی شەڕی راوەدوونان دەگرێتەبەر.

(تساو-تساو) وتوێتی:

"لەمجۆرە شەڕانەدا سەربازو ئەفسەران پەرۆشی خێزانەکانیان‌و.. تامەزرۆی گەڕانەوەن بۆ لایان."

٣- ئەگەر سوپا مەرزەکانی دوژمنی سووکە بەزاندنێك بەزاند.. هەلومەرجی شەڕ مۆرکی عەسکەرییانەی تەواو ناگرێتەخۆی.. چونکە هەندێ سەربازو ئەفسەر خەیاڵ‌و هۆشیان هەر لای گەڕانەوەیە..

لەبەرئـەوەی سـنوورەکان لـە خـاکی نیشـتمانەوەو.. لـە مەڵبەنـدی خۆشەویستانەوە نزیکن.

٤- ئەگەر سوپا لە خاکێکدا جەنگا.. تایبەتمەندێتی نەبەردەکەی بۆ تـۆو بـۆ دوژمنیش وەك یێکبـوو.. لـەمجۆرە هەلومەرجـەی شـەڕدا.. بڕیاری یێکلاکەرەوەی نیوانیان دەدرێت.

٥- ئەگەر شەڕگە (نەبەرد) بەئاسانی بەدەستتەوەبێتو.. بە هـەمان ئاسانیش دوژمـن پێیبگـات.. ئـەمجۆرە هەلومەرجانـەی شـەڕ.. شـەڕی پێکداران دەسەپێنێ.

**(مۆ-تۆ) وتوێتی:**

"لەنێو ئەمجۆرە خاکەی شەڕدا.. مەوداکان بەریـندەبنو.. دەرفـەتی جموجـوـوڵ ئاسـاندەبێت.. هـەردوولا دەتـوانن هەڵکوتنەسـەرو هـەڵبێنو.. خۆیـان بـۆ بـەرگریکردن قایمکـەنو.. هـەنگاوەکانی هێرشبردنیش دابینکەن.

٦- ئەگـەر ویلایـەتێك لـە سـێ لاوە بـە دوژمـن ئابڵووقـەدرابوو.. هەلومـەرجی شـەڕ تێیـدا وای لێـدەخوازێ بەرەنگاربوونـەوەو پێکدادانەکان ئاراستەکراوبن.. یاخود چڕوپڕبن.. سـوپای زاڵبـوو لـەم شەڕە ئاراستەکراوانەدا..مەچەك پتەوو دەسەلاتفراوان دەبێت.

٧- ئەگـەر سـوپای هێرشـهێنەر لـە ناوچـەو نێـو خـاکی دوژمنـدا شـووڵی لێهەڵکێشـاو.. لـەدوای خۆیـەوە شـارو دێهـاتی پـڕ لـە نـەیار بەخۆی جێهێشت.. ئەمە دەبێتە مایەی خولقاندنی بارودۆخێکی پڕ لـە گرفتو چەڵەمەی گەورەو ترسناك بۆ سوپا کشاوەکە.

(تساو-تساو) فەرموویەتی:

"هەلومەرجی بەرەودوا کشانەوەی سوپای شوول لێهەڵکێش و هێرشهێنەر.. لەمجۆرە خاك و ناوچانەدا.. هەلومەرجێکی گەلێ سەخت و خەتەرناکەو.. بە مەرگەساتیش تەنراوە.

٨- ئەگەر سوپای هێرشبەر.. شاخ و داخ و جەنگەڵ و دۆڵ و نشێوی و زۆنگاو و شەپروکوشتارو لێژایی فرە هەڵدێری بڕی.. ئەمجۆرە زەوییە عاسی و رەقەنە.. هەلومەرجی شەڕەکانیشی بۆ سەخت و نالەبار دەکات.

٩- زەوی سەخت و تەقتەق.. بۆ پرۆسەی هەڵمەتبردن و هەڵاتنی بەدەستوبرد ناشێ.. دەرفەت بۆ دوژمن ئاسان و لەباردەکات.. بە هێزێکی گچکەوە بێت و.. لە هێزێکی گەورەو گرانی سوپای بۆ ناوچەکە کشاو بدات.. لەمجۆرە زەوییانەدا بارودۆخی شەڕ بەلای شێوەی گەمارۆ و ئابلۆوقەداندا دەشکێتەوە.

(مۆ-تۆ) وتوێتی:

"لەمشێوە شەڕانەدا.. بۆسەنانەوەو پاشقولگرتن و هەروەها بەزاندنی دوژمنیش ئاساندەبێ."

١٠- ئەو زەوییەش دوژمن تێیدا ئەوپەڕی توانای لەپێناوی تێدا مانەوەیدا بەختدەکات.. هەلومەرجی شەڕ تێیدا دەبێتە شێوازی گیانقیدایانە.

(لی-شوان) وتوێتی:

"ئەگەر پێشت چیاو پاشت دەریا.. یان روبار بوو.. دەربازگەی لای راست و چەپیشت سەخت و عاسیبوو.. ئازووقەو چەکەمەنیشت

روو لە کزیو نەمانبوو.. ئەوا ناچاریت شەڕهەڵگیرسێنیو خۆکوژیانە بجەنگیو.. لە کوشتاردا خاووخلیچکی نەنوێنی.. دەنا بەشت مردنێکی سووكو سەلیمو.. چارەنووسیشت کۆتاییێکی ناموشەڕەفانە دەبێت."

١١- کەواتە باشتر وایە.. لەنێو ولاتەکەتدا درێژە بە شەڕ نەدەیت.. یان لە راوەدوونانیدا خاووخلیچك نەبیت.. زۆریش درێژە بە شەڕی سەر سنوورەکانی ولاتەکەتو ولاتی دوژمنەکەت نەدەیت.. (چونکە سۆزو پەرۆشیی سەربازەکان بۆ کەس‌وکاریان.. ورەی بەرزیان دەشێوێنیٚ)

١٢- ئەگەر دوژمن لەو مەڵبەندانەدا خۆی قایمکردبوو.. هێزو توانای شەڕی یێکلاییکەرەوەو زاڵبوونی پێدەبەخشێت.. هێرشی بۆ مەبە.

لەو خاکەی بۆ شەڕی پێکداهەڵپڕژان لەبارە.. لێگەڕیٚ هێزەکانی سوپاکەت بەبیٚ رێکخشتنی پێوەندییێکی ستراتیژی لە یێکدی جوێبنەوە.. با پێوەندییێکی وردو لێزانانەی عەسکەریی هەڵس‌وکەوت سووکەڵەو گورجوگۆڵانەی لە هەموو لاییێکەوە پەیوەست بە یێکەوە.. لەنیواندا هەبێت.

١٣- لە هەلومەرجی شەڕی ئاراستەکراو -سنووردار-دا.. یان چڕوپڕ -هەمە لایەن-دا.. کاتیٚ نەبەردەکە (زەوی شەڕەکە) بەسەر سیٚ بەرەدا دابەش ببوو.. هەرچەندێکت بۆ لوا هەوڵبدە هاوپەیمانانو پشتیوانان لە ویلایەتە هاوسێکانەوە بۆ خۆت پەیدا بکەیت.

ئەگەر جەنگ وای ناچاری کردیت.. وەنێو خاکی دوژمن بکەویت و.. سوپا کشاوەکەت تا قووڵایی خاکەکەی ڕۆچوو.. پەتپەتی بە دانیشتوانەکە مەکە.. چونکە لەوخاکەدا بە هەلومەجی شەڕی سەختەوە گلاوە.. خەڵکەکە گرفت و چەڵەمەت بۆدەنێنەوە.

١٤-لە زەویی سەختدا بەردەوام بکشێ.. لە زەویی ئابڵووقەدراودا با سەلیقەی عەسکەریی ڕێنماییت بکات.. لەو زەوییەشدا گیانفیدایی گەرەکە.. بۆ چرکەساتێك لە قوربانیدان دوامەکەوە.

١٥- لە خاکی ڕاوەدوونانـدا.. یێکەمین ئەرك یێکبوون و پێکەوە لکانی نیوان سەرکردایەتی و سەربازانە.. بۆ پتەوکردنی ڕیزو توندوتۆڵیی وره لەپێناوی بەزاندنی دوژمن.. یان پەرتپەرتکردنیدا.

١٦- لەسەر سنوورەکان یێکەمین ئەرك ئەوەیە.. نەیەڵیت سوپاکەت پەرشوبڵاوبێتەوە.. بگرە دەبێ یێك لەپاڵ ئەویدیدا بێت.

(مای-یاو-چان) وتوێتی:

"لە قۆناغی کشاندا.. با هەموو هێزەکانی سوپا پێوەندییان پێکەوە هەبێت و لێکنەترازێن.. لە حاڵەتەکانی وەستان و باروبارخانە خستندا.. یاخود لە کاروباری خۆقایمکردن و دامەزراندندا.. پێویستە پێوەندیی نیوان گشت هێزەکان بە بەردەوامی توندوتۆڵبێت.

١٧- لەسەر زەوی شەڕە یێکلاییکەرەوەکاندا.. دەبێ ددانبەخۆدا بگیرێ تاکو پێوەندیی پاشەنگی سوپا بە پێشەنگ و بەهەردوو باڵەکانیشەوە توندو تۆڵ دەبەستنەوە."

(چانگ-هاو) وتویەتی:

"ئەمە ئەوە دەگەیەنیّ: ئەگەر دوژمنەکەم.. بۆئەوەی دەست بەسەر زەویی شەڕە یێکلاییکەرەکەدا بگرێت.. پشتی بە زۆری ژمارەکانی قایمبیّ.. دەبیّ هەر زووبەزوو بە گەورەترین هێزی عەسکەریمەوە بچم بۆ دەستبەسەراگرتنی پاشەنگی."

(چانگ-هاو) وتویەتی:

"مەبەست لە گەیشتنە ناوچە گرینگەکانی ئەو خاکەی بۆ شەڕە یێکلاییکەرەوەکان لەبارن بەر لە دوژمن."

١٨- لەو خاکەدا بۆ یێکدادان دەشیّ.. یێکەمین ئەرکم ئەوەیە زۆر بەتەنگ ئەو خۆدامەزراندن و خۆقایمکردنەوانەوە بم بۆ شالآوو هەلآتنی هەنووکەیی بەهانامەوە دیێن."

١٩- لە خاکی چڕوپڕدا.. یان ئەو زەوییەی چارەنووسی گشت پرۆسە عەسکەرییێکە لەخۆیدا کۆدەکاتەوە..یێکەمین ئەرکێکت دڵنیابوونە لەوەی هاوپەیمانگەلێکت هەیەو.. تەنگانەدا بەهاناتەوەدێن.

(چانگ-یۆ) وتویەتی:

"لەم حاڵەتەداو لە پرۆسەی عەسکەریانەی شەڕی چڕوپڕ.. یان دەستنیشانکراودا.. بەرلەوەی بچمە نێوجەنگی چارەنووسەوە.. دەبیّ لە هێزی سوێندخوارەکانم و.. پێوەندییە دۆستانەییێکانم لەگەڵ خزم و پشتیوان و هاوەڵانم دڵنیابم.. هەروەها لەوەش دڵنیابم کاتیّ تووشی گێچەڵی دوژمن بووم بەهانامەوە دیێن.. لەتەك ئەو کەسوکارو پشتیوانانەدا هاوپەیمانێتی فەرمی (رەسمی) دەبەستم و.. بە هەموو

شێوەییێك دەمیان چەوردەكەم.. بەباشیش پابەندی رێكەوتننامەكان دەبم و لەوەدا فێڵیان لێناكەم.. لە هەموو روویێكیشەوە تاقییاندەكەمەوە.. تا تەواو دڵنیادەبم لەوەی رۆژی تەنگانەدا بەهانامەوە دێن."

٢٠- لە زەوی خەتەرناكدا.. یێكەم ئەرك زامنكردنی گەیشتنی خۆراك و ئازووخەیە بە بەردەوامی.

٢١- لە زەوی سەختدا.. بە پەلە پێیدا تێدەپەڕم و.. بەر لە راگەیاندنی شەڕ بە مودەتێك.. مەبەست و ئاخاوتنە راشكاوەكانم لەمەڕ جموجووڵەكانم دەشارمەوە.

٢٢- لە زەوی گەمارۆ.. یان ئابڵووقەسازدا.. بەر لە هەڵگیرسانی شەڕ لەگەڵ دوژمندا.. هەوڵدەدەم رێی بەهاناوەهاتن و كشانەوەی لێببەستمەوە.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"یێكێ لە بنەماكانی فیكری رەسەنی عەسكەرییانە ئەوەیە.. لە پرۆسەی ئابڵووقەدانی سوپای دوژمندا.. بەئەنقەست دەروازە (دەربازگە)یێكی بۆ دەهێڵمەوە لێوەی هەڵبێ.. نەوەكو لە هەڵاتن و دەربازبوون هیوابڕاو ببێت و.. دواجار لە بەرگریكردن و هەوڵی گەمارۆ شكاندندا گیانفیدایانە لێم ببێتە شێری مەیدان.

ئەگەر دوژمن سوودی لەم دەبازگەیەم بینی.. هەر زوو خۆمی بۆ دەنێمەوە.. تا یێك لەدوای یێك تێیانسرەوێنم.

ئەگەر منیش وەنێو ئەو زەوییە كەوتم و.. دوژمن لە هەموو لایێكەوە ئابڵووقەی داو.. بینیم بە ئەنقەست دەروازەیێكی بۆ هەڵاتن و

کشانەوە بۆ هێشتوومەتەوە.. تاکو لە خشتەمبەریێو لێوەی هەڵبێم..
لەم حاڵەتەدا دەبێ ئەو دەروازەیە لە خۆم داخەم.. بۆئەوەی سەربازەکانم بە شەڕێکی گیانفیدایانەی ناچارییەوە تێوەگلێنم.. بۆئەوەی لە شەڕی بەرگریکردن و گەمارۆشکاندندا شێرانە بجەنگێن."

٢٣- لە خاکی مەرگەساتدا.. سەربازەکانم تێدەگەیێنم تروسکایی ئومێدی قوتاربوون لە هیچ لاییێکەوە دیارنییە.. تەبیعەتی سەرباز وەهایە.. هەر کاتێ زانیی لە هەموو لاییێکەوە گەمارۆدراوە.. ئازاو بوێردەبێ.. هەر زانیشی ئەگەر بە پێخسیریکراوی کەوتە داوی دوژمنەوەو.. دوژمنیش وای تەمایە خراپترین ئازاری بدات.. ئەوا جوامێرانە دەجەنگێ.

سەرباز لە حاڵەتی ئومێدبڕاندا.. زێتر گوێڕایەڵی فەرمانەکان دەبێو.. پەرۆشانەتر دەچێتە مەیدانی جەنگەوەو.. باشتریش بۆ دۆزینەوەی ڕێچارەو تێکشاندنی ئابڵووقەی دوژمن بیردەکاتەوە.

٢٤- دەبێ سەرکردایەتی عەسکەریی.. لە گشت ئەو نەهامەتیو کلۆڵییانەی بەهۆی تەبیعەتی زەوییو کاریگەریی لەسەر هەلومەرجی شەڕەکە چەشتوویانە.. هەر دەبێ نەرمو نیانبێ.

دەبێ لەم نەرمو نیانیەشیدا.. زۆر بەتەنگ هەلومەرجەکانی شەڕەکەوە بێت.. ئەم بەتەنگهاتنەوەیەش.. بەبێ تاوتوێکردنی تەواوی گشت پێچوپەناکانی جەنگو ئامادەکاریی سەربازەکانەوە نەبێ نابێ.. هەروەها بەبێ تۆژینەوە لەمەڕ وزەوتوانا و دووریو نزیکیانو.. پێکەوەلکانو پێوەندیی هاتوچۆو.. تێگەیشتنی قووڵ لە تەبیعەتی جەنگاوەرو.. خاڵەکانی لاوازییو بەهێزیی دەروونییان لەنێو ڕەوشە

جیاجیاکانی شەڕو.. چەندین ڕەوشی جۆربەجۆری تەبیعەتی ئەو زەوییەی لەسەریدا دەجەنگێ... بەبێ تۆژینەوی هەموو ئەمانە نەبێ نابێ.

٢٥- پیاوانی دێرین.. خەسڵەتی لێوەشاوەیی عەسکەریانە بەوە دیاریدەکەن:

هەوڵدانێکی سەرکەوتووانەیە بۆ لێک‌ابڕانی پاشەنگی دوژمن لە پێشەنگەکەی و.. ڕێگەگرتنیش لەوەی هێزە گەورەو گرانەکان لەتەك هێزە گچکە کەم ژمارەکاندا یێکبگرنەوە.. سەربازی جوامێرو خاوەن ئەزموون و بەسەلیقە بەتەنگ ئەوانەی خوارەوەی خۆیان —سەربازە کەمتوانا و کەمئەزموونەکان)ەوە دێن.

٢٦- شارەزایی عەسکەریی لەوەشدایە.. ئەگەر هێزەکانی دوژمن توندوتۆڵ پێکەوە لکابوون و.. پابەندی یێکدی بوون.. بە خولقاندنی چەند بەرەیێکی پێکدادان.. وا لە هێزەکانی بکەیت پەرش و بڵاوببنەوەو.. بە دەردێکی وایشی بەریت نەتوانێ جارێکی دی هێزەکانی لە بەرامبەرت راستکاتەوە.

( مینگ ) وتویێتی:

"شەڕی لاوەکی فێڵبازانە بۆ دوژمن بخولقێنە.. کاتێ لای ڕۆژهەڵاتەوە بۆی دەکشێی.. لای خۆرئاواوە خۆتی بۆ دەرخە.. هەروەها بەپێچەوانەیشەوە.

لە کاتێکدا هێزەکانت بۆ لێدانی دوژمن لە باشووریوە ئامادەدەکەیت.. هەر بەئەنقەست وای فریوبدە گوایە لە باکوورەوە لەگەڵیدا بەشەڕدێیت.. جۆرێ ترس و پشێویش وەنێو ریزەکانی بخە..

بۆئەوەی هێزەکانی پەرش‌و بڵاوببنەوەو.. بەتەواوی نەزانیٚ کام بەرە بۆ بەرگریی پەسەندترەو.. کامیان بۆ هێرشبردن !"

چانگ-یۆ) وتویٚتی:

"لەو شوێنە نوستوو و فەرامۆشکراوەی دوژمن چاوەڕوانی هێرش بۆ هێنانت لێناکات.. بە هەموو هێزێکتەوە.. بە باشترین چەك‌و شارەزاترین هێزی عەسکەریی لە هونەری شەڕدا.. لەنکاو و بەگورجی لێیدە."

٢٧- گەورە سەرکردەکان.. سەربازەکانیان لە باشترین شوێنی شەڕی لەنکاوی یێکلاییکەرەوەدا کۆدەکەنەوە.. ئەگەر شوێنەکەیان بۆ شەڕو لێدان پیٚ لەبار نەبوو.. ئەوا سەقامگیری‌و خۆدامەزراندن‌و ددانبەخۆداگرتن‌و هەڵبژاردنی جێوڕێی گونجاو و هەلومەرجی شیاو.. بەپەسەند دەزانن.

٢٨- ئەگەر یێکێکتان پرسیی:

کام ڕێگە باشە بۆ جڵەوگیریی ئەو هەڵوێستەی دوژمن تێیدا هێزگەلێکی توندوتۆڵی هەیەو.. بەتەمایە بەوە بمفەوتێنیٚ!؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: بە لێدان.. یان بە گرتنی ئەو شوێنە یان ئەو هێزو چەکەمەنیانەی دوژمن شانازییان پێوە دەکات.. لەوێدا غەفڵگیری بکە.. ئیدی زوربەی دابینکارییێکانی تێکدەدەیت‌و.. سەرکەوتن بۆ تۆ دەبێت.

٢٩- خێرایی هۆکارێکی بنەڕەتییە لە جەنگدا.. نائامادەیی سوپای دوژمن لە کیس خۆت مەدە.. بە ڕێگەوبانێکی نائاساییی‌و دوور لە چاودێری بجووڵیٚ‌و.. لەو شوێنە قەرەباڵغانەشدا لێیدە کە

هێشتا بۆ بەرگریی خۆی تێیاندا قایم نەکردووە.. چونکە لە ڕێگەوبانێکی ئاساییەوە نەبێت چاوەڕوانی ئەمەت لێناکات.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"ئەوپەڕی بلیمەتیی سەرکردایەتی و.. پوختەی زۆرزانی عەسکەرییانە لە خێرایی و گورج و گۆڵیدایە."

چانگ-یۆ) وتویێتی:

"سەرکردەی قاڵبوو ئەوپەڕی شانازی بەوەوە دەکات.. لە جموجووڵدا چەند بەدەست وبردە.. هەروەکو ئەو -گورجوگۆڵی و بەدەستوبردیە-ی کە ڕەگەزێکی گەوهەریی جەنگە.. سرووش (وەحی)ێك بیّ و لە ئاسمانەوە بۆی نازڵ بووبیّ وەهایە."

٣٠- پرەنسیپە گشتییێکانی سوپا وایە.. ئەگە لە کشاتیدا بەرەو قووڵایی خاکی دوژمن دەستی نەپاراست.. مەیلی سەربازو ئەفسەرەکانی بەلای یێکگرتنی توندوتۆڵانەدا دەشکێتەوەو.. ورەشیان بەرزتر.. بەم پێیە وزەوتوانای دوژمن بۆ بەرگریی.. یان بۆ ڕەتدانەوەی هێرشەکە کەمتردەبیّ.

٣١- ئەگەر زۆر وەنێو قووڵایی خاکی دوژمن کەوتبوویت و.. خاکەکەی دەوڵەمەندو بە بەرهەم بوو.. تالآنی بکە.. بۆئەوەی لەسەر حسابی دوژمن ئازووقەو زەخیرەی خۆت زێتر بکەیت و.. دوژمنیش توانای ئەوەی نەمێنیّ جارێکی دی بە ئاسانی زەخیرەو تفاقی خۆی نوێبکاتەوە

٣٢- هەمیشە هەوڵبدە باشترین خۆراك بدەیتە سوپاکەتو.. چاکترین تفاقو زەخیرەشی بدەریّ.. لە قۆناغەکانی کشاندا.. یان بەرگریدا شەکەتو کفتی مەکە.

با پێوەندییەکانی نێو ریزەکانی سوپا خۆی.. پێوەندیی گیانیی قووڵبن.

با پلانەکانی کشانت لای دوژمن زۆر نهێنی بێت.. نەوەك پەی بە نەخشەکانت بەرێت.

٣٣- هێزەکانت لە جێگەییێکی وا دابنیّ.. ئەگەر رووبەرووی مەرگیش بوونەوە.. بەئاسانی نەتوانن فیراربکەن.. چونکە ئەگەر سەرباز باکی لەمەرگ نەما.. هیچ لەمپەرێکی رۆحیو هیچ هێزێکی زەبەلاح خۆی لەبەردا ناگریّ.

ئەم جەختی مەرگە.. لەم حاڵەتە ناسکەدا تاکە چەکێکی مەعنەویی کاریگەرە.. بۆ پێکەوە گرێدانی ئەفسەران بە سەربازانەوەو.. هەر لایەنێکیشیان ئەوپەڕی وزەو جوامێریو سەلیقەو توانای خۆی بۆ بەختدەکات.

ئەگەر بێگومان بوون دەربازبوونیان نییە.. ترسیان دەرەوێتەوەو.. گیانفیدایانە رادەوەستنو بەرەنگاریدەکەن.

تا زێتریش بچنە قووڵایی خاکی دوژمنەوە.. هەڤاڵبەندیو هۆگربوونی یێکدیو برایەتی نیوان هێزە چەکدارە کشاوەکان پتەوتر دەبن.. لە ناخی دڵو هەناویانەوە هەستدەکەن.. لە پشت بە یێکدی بەستن زێتر هیچ چارەییێکی دییان نییەو.. دەبیّ لە هیچ

نەسلەمێنەوەو.. بە ورەو گیانێکی یێکگرتووی پۆلایینەوە بەرامبەر دوژمن بجەنگن.

٣٤- لەم حاڵەتانەدا.. سەربازان پێویستیان بە کەسێ نامێنێ تێ‌وتاو وەبەر هەناویان بنێ.. یان بەوردی چاودێریی نیزام بکات.. یاخود گوێرایەڵی بۆ فەرمانی عەسکەریان بەسەردا فەرزبکات.. بەمجۆرە بەختی سوپا لە سەرکەتندا سواردەبێ.

٣٥- لە هەڵمەتە عەسکەرییێکانمدا.. بەوە شادمانبووم ئەفسەرانێکم لەتەکدا بوون.. وەدووی دەوڵەمەندبوون نەدەکەوتن.. لەبەرئەوە نا رقیان لە پارەو سامان بوو.. بەڵکو فەزڵی ئەرکەکەیان بەسەریدا دەدا.. باکیشیان لە مەرگ نەبوو.. لەبەرئەوە نا ژیانیان دەبوغزاند.. بەڵکو رەزامەندیی ئاسمانیان دەویست.

(وانگ-هسی) فەرموویەتی:

"ئەگەر سەربازو ئەفسەران بەتەنێ وەدووی سامان‌و تالانی‌و زێدەمووچەو پلەدارییێوە بن.. کەڵکی ولاتپارێزیان پێوە نامێنێ.. لە شەڕیشدا هەر پاراستنی گیانی خۆیان بەلاوە مەبەستە.. نەك وەلانانی مەترسییێکانی دوژمن.

٣٦- ئەو رۆژەی نەفیر بۆ کشانی سوپا لێدەدرێ.. چەند دڵۆپێ فرمێسك دەڕژێنە سەر گۆناکان.

(مۆ-تۆ) فەرموویەتی:

"لەبەرئەوەی گشتیان گفتیان بە مەرگ داوە.. ئیدی دەبێ یان دوژمن ببەزێنن.. یان دوژمن بیانبەزێنێ‌و.. لاشەکانیشیان بکەنە پەیینی کشتوکاڵ.. یان قەل‌و داڵ بیانخوات."

٣٧- ئەگەر سوپا خۆی لە هەڵوێستێکدا بینییەوە کەڵکی هەڵاتنی پێوە نەبوو..ئازایەتی وەنێو هەناوی جەنگاوەران دەکەوێ و.. مەیلێکی قووڵی نەمرێتیش دایاندەگرێ.. ورەو مەعنەویاتیان بۆ ململانێ لەپێناوی مانەوەی ئابڕوومەندانەدا.. دەگاتە لوتکە.

٣٨- سوپا لە بندەستی سەرکردەی بەسەلیقەدا.. هەر بە ماری چیای (شانگ) دەچێ.. ئەگەر دات بە سەریدا بە کلکی تێتدەسرەوێنێت.. ئەگەر داتە کلکیدا سەریت لێڕاستدەکاتەوە.. خۆ ئەگەر کێشاتە ورگی.. بە سەرو کلکی بەگژتا دێت.

٣٩- ئەگەر یێکیکتان پرسی:

-مەعقوولە سوپاهێندە نەرمو نیان و.. هێندەیش توانای لەڕوودا وەستاندنەوەی هەبێت؟

وەلامەکەم:

-بەڵێ.. سوپای نموونەیی هەموو ئەمانەی لەبارجا هەیە.

لە مێژووی میرنشینەکانی (قۆ)و کۆمەڵەکانی (یویە)دا نموونەمان هەیە.. گشتیان کەس و هاوخوێن و.. لە هەمانکاتیشدا یێکبینە دڕدۆنگ و ناکۆك.. وەلێ هەرکاتێ دوژمنێکی بێگانە لەڕوویاندا وەستایەوە.. هەموو بەرامبەری یێکدڵ و یێکگیان و یێکدەست لێناگەڕێن تا تێکینەشکێنن.

٤٠- بۆ سوپا هەر هێندە بەس نییە پشت بەتەنێ بە چەکەمەنی و تفاقەکانی ببەستێ -وەك: ئەسپی رەسەن و مەزنە گالیسکەی چەکدارو خۆقایمکاییە تۆکمەکانی بەرگری لەخۆی-.. ئەمانە هیچیان

کار مەیسەرناکەن ئەگەر سەرکردەی سوپا وریا و بەسەلیقەو.. ورەی سەربازان بەرزو توانای تەواوی شەڕیان نەبێت.

٤١- ئامانجی کارگێڕیی عەسکەرییانە.. گەشەپێدانی ئاستی وزەو توانای هێزە جۆربەجۆرەکانی سوپایە.. بە شێوەیێکی ئەوتۆ سەرکردایەتی بتوانێ لەتەك تەبیعەتی زەوییێکەدا بیانگونجێنێ.. هەروەها هێزە بروسکئاساییێکانیش (مەغاویرو هێزە گورجوگۆڵ و بەدەستوبردەکانی دیکەی شەڕ).. لەگەڵ هێزە ئاساییێکانی دیکەی سوپادا بگونجێنێ.. بەم نەرمو نیانیو هاوئاهەنگییە.. سەرکردایەتی دەتوانێ لە زوربەی ئەو هەلانەی تەبیعەتی زەوی بۆی دەرەخسێنێو.. لە وەزەو توانای سوپاکەیشی بەباشی بەهرەمەندبێت.

(چانگ-یۆ) وتویەتی:

"ئەگەر سەرکردە توانی تەحەکوم لە هەڵکەوتەی زەویدا بکات.. ئیدی ئەگەر سوپا لەڕووی پیاوو تفاقیشەوە لاوازبوو.. هەر دەرفەتی سەرکەوتنی لەبەردەمدا دەمێنێ.

پوختەی قسە ئەوەیە.. ئەگەر سەرباز خاوەنی ورەی بەرزو مەشقی تەواوو تفاقی عەسکەریی تۆکمە بێت.. دەرفەتی لەڕادەبەدەرو چاوەڕوان نەکراوی وا بۆ سەرکردایەتی هەڵدەکەوێت.. بتوانێ تەحەکوم بە چارەنووسی شەڕەکەوە بکات."

٤٢- لە ئەرکەکانی سەرکردە.. هێمنی.. دووری لە پۆخڵەوات (بەرزیی ئاکار).. بەویژدانی.. خۆدابینکردن دەمارساردیدا.

لە هێمنی سەرکردەدا.. نهێنی نەخشەو.. نهێنی جموجووڵەکانی سوپا دەپارێزرێ.

لە ئاکاری بەرزی سەرکردەدا.. ورەبەرزیی سوپا دەچەسپێ.

لە بەویژدانیی سەرکردەدا.. یاساو نیزام لەنێو ریزەکانی سوپادا بەتەواوی چێ دەبن.

لە خۆراگریی و دەمارئارامیدا.. متمانە لە هەناوو روخساری سەربازاندا شەوقدەداتەوە.

(وانگ-هسی) وتوێتی:

"سەرکردەی هێمن سرووش (ئیحا)ی نهێنیپارێزی بە سەربازان دەدا.

بەویژدانێتی سەرکردە ئێماژەی نیزامیان دەداتێ.

ئەو سەرکردەیەی تووڕەو تڕۆ نییە.. متمانەی سەربازانی بەدەستدێنێ.

٤٣- لە ئەرکەکانی سەرکردایەتی بالا.. نابێ درێژدادڕانە نەخشەکان بۆ هەموو بەردەستەکان باسبکات.

(تساو-تساو) وتوێتی:

"سەربازان لە ئاهەنگی سەرکەوتندا بەشداریدەکەن.. بەڵام نەخشەکان دانانێن.. ئەوەیان ئیشی ئەوان نییە."

٤٤- دەبێ سەرکردە دژی شتە پڕوپووچ (خورافیات)ەکانی نێو سەربازەکان بوەستێتەوە.. تاکو گومان و ڕاڕایی لە دڵ و دەروونیاندا بسڕێتەوە.. چونکە مردن هەقەو.. هەرچی خورافیاتیش هەیە لەبەردەم ئەم هەقیقەتە (مردن)دا پووچەڵدەبنەوەو.. ئیدی تەنیا تەنیا

تاكــه پێوەنــدییێك دەمێنێتــەوە.. ئــەویش لــەنێوان جــەنگاوەرو ئاسماندایە.

(تساو-تسۆ) وتویەتی:

"مەهێڵە سەربازان لەمەڕ پەرجوو (مۆجیزە)و ئەو بەندوباوانەوەی پێوەندییان بە بنچینەکانی تەبیعەتی شتەکانەوە نییە بئاخڤن.. بەمە سەرچاوەکانی گومان‌و دوودڵی‌و شەعوەزە لە ئەرکە عەسکەرییەکان جیادەکەیتەوە."

٤٥- سـەرکردەی بەسـەلیقە.. بـە ئەنقەسـت سـەبارەت نەخشـەو پلان‌و گۆڕانکاریی‌و هەموارکردنە رووکەشەکانی.. ئێماژەی وا دەدات سەر لە دوژمن بشێوێنیّ.. تاکو دەرفەتی ئەوەی نەداتیّ بەوردیی لە خواست‌و مەبەست‌و نەخشەکانی تێبگات.

(چانگ-یۆ) وتویەتی:

"خـۆت لـەو تەکتیکانـەی لەوەوبـەر پێڕەوتکـردوون بـەدووربگرە.. ئەگـەر توانیـت شـێوازێکی نـویّ دابهێنـە.. بـەردەوام هـەموارکردنیش بخـەرە نێـو هەنـدیّ لـە بنـەماکانی پیشـە عەسـکەرییەکەوە.. تەنانـەت وەنێـو ئـەو رەگـەزە باوانەیشـی بخـە.. لـە بنـەماکانی فیکـری عەسکەیشـدان.. بەمـەیش ئـەرکی نوێکردنـەوەی خـۆت‌و سـوپاکەت وەدەسـتدێنیت‌و.. ریّ لـە دوژمنـیش دەبەسـتیتەوە نـەتوانیّ لـەو کاروبارانەی زووتر راتپەڕاندوون.. بکۆڵێتەوە.

ئـەم نوێبوونەوەیـەش تـەنیا بـۆ ئـەو سـەرکردانە دەرەخسـێت.. هـەردەم وابـزانن فکریـان پێویسـتی بـە زێـترو زێـتر زانیـاری‌و زانسـت

هەیـەو.. قسـەی خـەڵکی وەردەگـرن‌و.. لاقرتـێ بـە بـیرو بۆچـوون‌و ئامۆژگاری‌و رێنمایی خەڵکی دی ناکەن."

٤٦- هونـــەری ســـەرکردە ئەوەیـــە.. بزانـــێ بەباشـــی ســـەرباز کۆبکاتـــەوەو مەشـــقیان دادات‌و وزەو توانـــای عەســـکەرییانەیان وەبەردەستبخات‌و.. ئەوجا فڕێیانداتـە نێو وەزعێکی عەسکەرییانەی وەهـاوە.. هـیچ چـارەییێکیان نـەبێت جگـە لـە سـەرکەوتن بەسـەر دوژمندانەبێت.

٤٧- سـەرکردە فـەرمان بـە ئەفسـەران بـدات.. بـە رێوبانـە نائاساییێکان.. یان رێگە زووتر نەزانراوەکاندا بکشێن.. سەرکردە بەمە سـەر لـە دوژمـن تێکـدەدات.. تـاکو نـەتوانێ چاودێریی جموجووڵی سوپاکە بکات.

٤٨- سەرکردە کاری ئەوەیە.. بە باشی سوپا بگەیەنێتە نێو خاکی دوژمن.. ئەوجا سوپاکەی تێبەردەدات.. وەك چۆن نیشانگر تیرەکەی لەنێو ورگی کەوانەکەیەوە دەگرێتە نێچیر.

٤٩- دەبـێ سـەرکردە بـۆ ئـەم مەبەسـتە.. گالیسـکەکانی گەڕانـەوە بسـووتێنێ‌و.. رێگـەکانی هـەڵاتنی سـوپا کشـاوەکەی تێکوپێکبـدات.. چـوون شـوانێك رانەکـەی وەپـێش خـۆی دەدات.. ئـاوایش سـەرکردە سـوپاکەی بـەلای راسـت‌و بـەلای چـەپداو.. بـەو رێگەوبانـە چـاك‌و لەبارانـەی لـەوەڕی باشـیان تێدایـە دەبـات..( لـەوەڕی عەسـکەریی لەپێناوی سەرکەوتنی سەربازەکاندا).

٥٠- ســـەرکردە هـــەرزوو.. ئـــەو شـــوێنە جیاوازانـــەی هێـــزە جۆربـــەجۆرەکانی تێـــدا خڕدەکاتـــەوە.. دیاریـــدەکات.. هـــەروەها

مەڵبەندەكانی شاڵاوو هەڵاتنی هەنووكەییش (نەك ڕێگەكانی فیرارو هەڵاتنی سەربازی لاوازو ترسنۆك).. ئەمەیش بەپێی نەخشەیێكی عەسكەرییانە دیاریدەكات.

بە واتاییێكی دی.. سەركردەی بەسەلیقە.. كۆمەكی سەربازەكان دەكات تا سەردەكەونە سەرەوە.. ئەوجا پەیژەكەیان لەژێر پێ دەردێنێ.. لێدەگەڕێ بەخۆیان بەرەو شكۆمەندیی وەسەركەون.

٥١- سەركردەی كەودەن.. ئەوەی ئاگای لە دابینكارییێكانی دوژمن.. نەخشەكانی دوژمن.. وزەوتوانای دوژمن نییەو.. لە پەیمانبەستنی پێشوەختو لەسەر بنچینەییێكی پەسەند.. لەتەك كەسوكارو پشتیوانانو هاوەڵانیشیدا نییە.

ئەو سەركردەیەی نازانێ تەبیعەتی زەوی چییەو.. شاخو دۆڵو هۆڕو زەلكاوو پێچوپەناكان بەریان بە كوێوەیە.. لە ڕێنماییكردنی وردی جموجووڵی سوپاكەیشیدا ئفلیجەو.. ئاگای لە جموجووڵی سوپای دوژمنیش نییەو.. دەبێت پەنا وەبەر شارەزایانی هەمە بەهرە ببات.

بەختی سەركەوتنی سەركردەی نەفامو بێئاگا بە هەر یێكێ لەو پێداویستییانە.. بەختێكی كلۆڵە.

(تساو-تساو) وتوێتی:

"لەمەوبەر بەوردیو شرۆڤەی هەموو ئەمانەم.. بەڵام جار لەدوای جار دووپاتكردنەوەیان.. بۆ فیكرو كاروباری عەسكەرییانە شتێكی پێویستن."

٥٢- هەڵمـــەتی عەســـکەرییانە بۆســـەر دوژمنێکـــی بـــەهێز.. دابینکاریی بەردەوامی گەرەکە.. بۆئەوەی نەهێڵرێ هێزەکانی گردوکۆ بکاتـــەوە.. نەشـــهێڵرێ پشـــتیوان و هاوپـــەیمان و هاوکارەکـــانی کۆبکاتـەوە.. جـەنگ وەدووی زۆرزانیـی سیاسـەت دەکـەوێ.. سیاسـی فاشیل سـەرکردەیێکی عەسکەریی فاشیلە.. سیاسـەت ئـەوە نییـە لـە هەموو بەرەکاندا دوژمن بۆ خۆت دابنێیت.. بەڵکو ئەوەیە هەموو جۆرە هاوەڵێك لە خۆت کۆبکەیتەوە.

(مای-یاو-چان) وتویێتی:

" ئەگـەر بـەنیازبووی شـەڕەکە لەگـەڵ دوژمنێکی بـەهێزدا یێکلایـی بکەیتـەوە.. دەبـێ نـەهێڵیت بتـوانێ پـەنا وەبـەر هاوەڵـە بـەهێزەکانی بـــەرێت.. یـــان داوای بـــە هاناوەچـــوونیان لێبکـــات.. ئەمـــەیش بـــە پێڕەوکردنێکـــی دانایانـــەی سیاســـی وا دەبێـــت.. ئاشـــتەوایی لەتـــەك هاوەڵە بەهێزەکاندا بکەیت.. تا دوژمن نەتوانێ هانایان وەبەربدات."

٥٣- بێگومـان بـۆ ئـەم کـارە دەبـێ ئـەو وڵاتـەی خـۆی بـۆ شـەڕی یێکلاییکـەرەوەی دوژمنێکـی بـەهێز تـەیارکردووە.. هـەر زووبـەزوو لەگـەڵ هـاوەڵانی دوژمنەکەیـدا بکەوێتـە چەندوچوونەوە.. بـۆ جـۆرە رێکـەوتن و دڵڕاگـرتن و شـتی تایبەتمەنـد بەخشـین پێیـان.. بۆئـەوەی مەیلیان زێتر بەلای تۆدا هەبێت تا دوژمنەکەت.

(تساو-تساو) وتویێتی:

"هەڤاڵبەندییێکان نابێ لەگەڵ ئەو هێزە هەلپەرست و بێمەبدەئانەدا ببەسترێن.. کاتی پێویست پشتت تێدەکەن.

هەڤاڵبەندییەکان بۆ ئەوەشە.. ئەو هەڤاڵبەندییانەی دوژمنیش هەیەتی پووچەڵیان بکەیتەوەو.. لەگەڵیاندا رێبکەویت و.. بە هەر جۆرێ بێ فریویان بدەیت و مەیلیان بەلای خۆتدا بەری.

ئەمەیش هەر لەو رێگەیەوە دەبێت.. رێزی هێزە دەرەکییەکان وەدەستخەیت و.. لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا سەقامگیرو سەرڕاست بیت و.. فرت و فێڵیان لەگەڵدا نەکەیت..."

(مۆ-تۆ) وتوێتی:

"ئەو سەرکردەیەی بەتەنیا پشت بەوزەو توانا عەسکەرییەکەی دەبەستێ و.. گرفت و کێشەی سیاسیانە لەسەر ئاستی گشت بەرەکانی ناوەوەو دەرەوە دەخولقێنێ و.. دوژمنایەتی ئەمپەڕو ئەوپەڕیش دەکات.. ئەنجامی ئەو سەرکردەیە هەر تێشکانە.

ئەوە لەوجۆرە سەرکردانەیە.. هەر خولیای تێرکردنی ئارەزووەکانی و مانەوەیەتی لە حوکم و دەسەلاتدا.. بە هیچ پڕنابێتەوەو.. هیچیش دادی نادات.. هەرچەند هیزی عەسکەریی زێتر بێت و.. ژمارەی جەنگاوەرو چەکەمەنی و تفاقیشی زۆربێت.. دوژمن وڵاتەکەی هەر داگیردەکات.. جا ئیدی بەتەنیا بە هێزی خۆی بێت.. یاخود بە هاریکاریی ناحەزانی ئەو سەرکردەیە بێت.. کە لە پەیوەندییە نێوخۆییەکانی بەرامبەر خزمانی‌خۆی.. یان بەرامبەر وڵاتانی دی.. رەفتاری سیاسی چەوتی نواندووە."

٥٤- بێئەوەی لەوەوبەر کرابێتە عادەت و.. تەنانەت بۆ ئەوانەی میزاجیشت حەزی پێیان نییەو.. چارەیانت ناوێن.. تایبەتمەندی

باشیان پێببەخشە.. چونکە جەنگ جۆرێ نەرمو نیانیی –جیڕی– لێت گەرەکە.

ئەگەر بارودۆخی دابینکردنە عەسکەرییێکە سەپاندی.. فەرمانی وا وا دەربکە بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبن.. ئەمجا جڵەو دەگریتەدەست.

**(چانگ–یۆ) وتویێتی:**

"یاساکانی ئەخلاق لە هەموو شتێکدا –سیاسەت.. دادگە.. جەنگ– داوای پاداشتو سزا دەکەن.. ئەگەر لەو کارەدا دادپەروەر بوویتو زووبەزووش راتپەڕاندو.. لەسەر ئەم دیدو رەفتارو ویژدانە مایتەوە.. ئەوسادەتوانی ببیتە جێی متمانەی خزمو بێگانە."

٥٥– سەربازەکان بەپێی ئەرکەکانیان رێکبخە..بێئەوەی لە هەموو تەفاسیلەکانی نەخشەکانت ئاگاداریان بکەیت.. وزەو توانا عەسکەرییێکانیشیان بەپێی داخوازییێکانی هەڵوێستەکە بخەرەکارەوە.. بێئەوەی باسی ئەو مەترسییە گەورانەی لە رێگەیاندایە بۆ بکەیت.. ئەمجا بەرەو ئەو شوێنە مەترسیدارانەی پیشەی جەنگو پێداویستییێکانی سەرکەوتن گەرەکیانە بەڕێیانکە.. ئەوسا سەرباز دەزانێ.. ململانێی لەپێناوی مانەوەدا لەسەر ئەوە بەندە دوژمن تێشکێنێت –نەك لە دەستی هەڵبێت.

ئەگەر سەربازانت فڕێدایە نێو جەرگەی مەرگەوە.. ئەمە نابێتە گەمەییێك بۆ بەدیهێنانی سەروەریی شەخسی بۆ تۆ.. بەڵکو ئەرکێکە لە ئەرکەکانی ململانێ لەپێناوی بە ئابڕوومەندێتی مانەوەی نەتەوەدا.. سەربازانیش بەشێکی رەسەنی نەتەوەنو.. خولیای

سەربازیش وەهایە.. سەروەریی بەدەستخات و پارێزگاریی گیان و قەوارەی خۆی بکات.. کە قەوارە و کییانی نەتەوەیشە.

بەخراپی سوپا بۆ مەرامە شەخسی و سیاسەتە تایبەتەکانت بەکارمەهێنە.. با بۆ سیاسەتی نەتەوە و بەرژەوەندییەکانی نەتەوەبێت.. ئەوجا بڕوانە سوپا و بزانە چۆن لەنێو کەڵبەکانی مەرگەوە سەرکەوتن دەردێنێ

٥٦- ئەوپەڕی زۆرزانیی عەسکەریی لەوەدایە.. خۆت وا دەرخەیت گوایە دوژمن لەخشتەی بردوویت و.. کاروبارە عەسکەرییەکانت پێبەپێی خواست و ئارەزووی ئەو دەکەیت.

٥٧- سەرکردەی سەرکەوتوو ئەوەیە.. لە دووری هەزار فرسەخەوە بە لێدانێکی کوشندە لووتی دوژمن دەشکێنێ.. ئەمە وادەگەیێنێ.. بەرلەوەی دوژمن بۆ رووبەڕووبوونەوەی نزیك خۆی وردە وردە بە فێڵ کێشتبکات.. تۆ دەبێ بەجۆرێ نەخشە عەسکەرییەکەت سازکەیت.. بتوانیت لە شوێنە بەهێزەکاندا وزەو توانای عەسکەریی دوژمن تێکبشکێنیت.. هەروەها ئەمەش وا دەگەیێنێ.. بە لێدانی لە ناکاو جموجووڵی کشان و هاتنەپێشەوەی ئفلیجکەیت.

٥٨- ئەو رۆژەی بڕیاری هێرشی عەسکەریی تێدا دەدرێ.. ئەحکامی عورفی راگەیەنەو.. هەموو فەرمانەکانی پێشوو بسڕەوە.. هەموو پێوەندییێکیش بە نوێنەرانی دوژمنەوە بېڕە.. وریای ئەو راگەیاندن و ئاخاوتنانەشیبە بۆ سەرلێشێواندن دەریاندەبڕێ.. ئەنجومەنی شوورا لەپەرستگە جەمبکە.. تاکو ئاسمان بەرەکەتی سەرکەوتنت پێببەخشێت.

٥٩- ئەگەر دوژمن هەلێکی بۆ رەخساندی.. یان دەرفەتێکی وا تێکەوت بۆت لەباربێ و لەنکاو زەفەری پێبەریت.. خۆت مەخلافێنەوهەلەکە لەکیس مەدە.. راڕاو دوودڵ مەبەو.. بەدووی بڕوبیانووی وادا مەگەڕێ گوایە بڕیاری پێشترت نەداوە.. لەپڕ بۆی بچۆو دەست بەسەر شتێکی ئازیزیدا بگرە.. یان مەوقیعێکی کاولکە.. یان ئەو تفاقانەی بەتەنگیانەوەیە تێکیانبشکێنە.. یان پەلاماری هێزێکی تایبەتمەندی بدە.. ئەم نکاوکاریە دەبێتە کارئاسانی لە بەدیهێنانی ئەو نەخشانەی زووتر بۆ دوژمنت کێشابوون.

٦٠- بنچینەی فیکری عەسکەریی ئەوەیە.. وەدووی هەموو شێوازەکانی تۆژینەوە بکەوی تاکو بزانی دوژمن چی لەژێرسەردایە.. بەمەیش تۆ (نەك ئەو) دەتوانیت جڵەوی چارەنووسی جەنگەکە بگریتەدەست.

٦١- سەرەتا وا خۆت نیشاندە.. چوون کیژۆڵەییێکی پاکیزە شەرم لە موغازەلەو دەسبازی دەکات.. تۆیش ئەئاوا شەرم لە جەنگ دەکەیت.. هەر ئەم فێڵەت لای دوژمن بەڕاست گەڕا.. کتوپڕ وەك هەڵمەتی پڵنگ بۆسەر نێچیر هەڵکوتە سەری و.. ئەوساکە دەبینی بەم دەستوبردو گورجوگۆڵیەت چ سوێیێکت بە جەرگی دوژمندا کردووە.

**( سۆن-تزو ) فەرمووێتی:**

١- پێنج جۆر ئاگر هایشتن هەیە:

یێکەم: بۆ سووتاندنی مرۆڤی بەرەی دوژمن.

دووەم: سووتاندنی ئەمبارو گەنجینەی ئازووقە.

سێیەم: بۆ سووتاندنی چەکەمەنی و تفاقی (مەیدانی).

چوارەم: سـووتاندنی ئـەو زەخیرەیـەی لەپشـتەوە خسـتوێتی (بـە چەکەمەنی و خۆراکەوە).

پێنجەم: بزانی چۆن مووشەکە ئاگرهاوێژەکان بەکاردێنیت.

٢- ئـاگر بـەکارهێنان پێویسـتی بـە دەفرێـك و بێلێـك (پێمـەڕەییێك) هەیە.

**( تساو-تساو ) وتوێتی:**

" پشـت بـەو زانیاریانـە ببەسـتە لەمـەڕ (بنکـەکانی مۆڵگـەخواردنی دوژمن و.. تفاق و ئازووخەو جبەخانەو زەخیرە.. لەنێو مەیـدان و پشـت مەیدانیشـــەوە) کۆتکردوونەتـــەوە.. ئـــەم زانیاریانـــە هەواڵـــدزان دەیانهێنن.. یان لە خائینەکانی نێو دوژمنەوە دەستتدەکەون."

**( چانگ-یۆ )وتوێتی:**

"ئاگر (یـان مووشـەکی ئاگرهاوێـژ) بـەکارهێنان.. بـەپێی بارودۆخ و کەشوهەوا دەگۆڕرێ."

٣- دەبـێ ئـەو بێڵـەی بـۆ مووشـەکی ئاگرهاوێـژ بـەکاردەهێنرێ.. هەمیشـــەو لـــە هـــەموو حاڵەتێکـــدا لەبـــەر دەســـتی ســـوپادابێت و.. لەوەبەریش هەر زوو ئامادەکرابێت.

٤- مەرج نییە هەموو (ئانوسات)و (رۆژاننێك) بۆ بەكارهێنانی مووشەكی ئاگرین لەباربێت.. سوودەكانی ئاگربارانكردنیدوژمن لە ساتەكانی جەنگدا.. پابەندە بە كەشوهەواو بارودۆخی شەڕەكەوە.

٥- مەبەستمان لە (ئانوسات)ی لەبار.. قرچەی گەرمایە.. مەبەستیش لە (رۆژانێك) بەپێی بڕیارو دەسنیشانكردنی گەردووناسانی نێو سەركردایەتی سوپایە.[٣٩]

٦- ئاگر بارانی دوژمن پابەندی ئەو گۆڕانكارییكاریانەیە لە میانەی شەڕدا روودەدەن.

٧- ئەگەر ئاگر لە ئۆردووگەی دوژمندا كەوتەوە.. دەبێ گورجوگۆڵانە تەنسیقی كارە عەسكەرییەكانت بۆ ئازاردانی دوژمن لە دەرەوەی ئۆردووگەكەیدا بكەیت.. مەبەست لە دەستپێكردنی پرۆسە عەسكەرییەكانی سوپاكەتە.

بەڵام ئەگەر ئاگر كەوتنەوەكە ترس و لەرزو پشێوی لە ئۆردووگەی دوژمندا نەخستەوە.. ئەوا لەپێكداادانی عەسكەریانەدا پەلەپەل مەكە.. ددان بەخۆتدا بگرە تا هەقیقەتی رەوشەكەت بۆ یێكالادەبێتەوە.

---

[٣٩]- ئەم رێنماییە دێرینە.. ئەمڕۆكەش بۆ چەندین جۆرە چەكی نوێ دەستدەدات.. وەك هێزی ئاسمانی (فڕۆكەو هتد....)و.. پێویستە لە بۆردماندا باری كەشوهەواو بلاقۆكی جەووی رەچاودەكرێ.. هەروەك چۆن لە رۆژگاری دێریندا بڕیاری (گەردووناسانیان) پشتی پێ نەگرت.. بێگومان زانستی گەردوون شتێكەو.. تەواو لە كەلووناسی و سیحرو جادوو جیاوازە.

٨- ئەگەر ئاگرەکە ئەوپەڕی جەزرەبەی بە دوژمن گەیاند.. ئیدی نۆرەی هێرشبردن دێت.. خۆت ماتڵمەکەو دەستبکەرە راپەڕاندنی ئەو شاڵاوە عەسکەرییانەی بۆ لەنێوبردنی دوژمن نەخشەت بۆ کێشاون.. دەنا بۆ مودەتێ ئارامبگرە.

٩- ئەگەر هەلومەرجی شەڕ وای لێتویست.. ئاگر بەردەیتە مەرزەکانی ئۆردووگەی دوژمن.. پێویست ناکات چاوەڕوانبیت ئاگر نێو ئۆردووکەش بتەنێتەوە.. دەستوبردکەو لێیدە.. تاکو هەر نەخشەییەکی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئاگربارانەکەت هەبێت لێی تێکدەیت.

بە هەر حاڵ.. کارێکی وا بکە ئاگر بەکارهێنانەکانت.. ناوبەناو و بەپێی کات و ساتە شیاو و لەبارەکانت بن.

١٠- ئەگەر ئاگر کەوتەوە و.. سەمتی (با) بۆت لەبار نەبوو.. لێگەڕێ و لەخۆتەوە دەست نەدەیتە کاری عەسکەریانە.. چونکە لەم حاڵەتانەدا ئاگرەکە تفاق و سوپاکەشت دەشێوێنێ.

١١- ئەگەر لە رۆژدا (با) هەڵیکرد.. بەزۆری لە دەمەوئێوارەدا دەیخات.

١٢- پێویستە سوپا زۆر بە وردی و چاکی هەر پێنج شێوازەکەی ئاگر بەکارهێنان بزانێ و.. لە چاودێریکردنی بارودۆخ و ئان و ساتە لەبارەکانی بەکارهێنانی ئاگردا.. بۆ هەر یێکێ لەو پێنج حاڵەتە نەکەوێتە هەڵەوە.

١٣- زیرەكی لەوەدایە.. بەڕێی هێرشبردنەوە ئاگر بەكاربێنیت.. سەركردەی لێزان ئەوەیە شێوازێكی وا دەگرێتەبەر.. هەموو وزەی ئاگرەكە بۆ لەنێوبردنی دوژمن لەكاردابێ.

١٤- ئاو (لافاو) بەكارهێنان وەك چەكێكی دوژمن شكێن پشتی پێنابەسترێ.. ئاو دوژمن جوێدەكاتەوە.. بەڵام تێكیناشكێنێ.. ڕێوجێییش بۆ خۆ لە ئاو پاراستن زۆرە.. (بەنداو هەڵبەستن.. ئاراستەكردنی لافاو بەرەو شیوو دۆڵەكان... هتد.. ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی راستەوخۆ كاری تێنەكاتو وەبەر هەموو نارەحەتییێكانی نەكەوێ.)

١٥- ئەوەی لە فیكرو لێزانێنی عەسكەریدا گرینگە.. بزانیت چۆن هەموو هەلومەرجەكان لە گشت ئان‌وساتێكدا وەگەڕبخەیت.. پشتگوێخستن‌و وەگەڕنەخستنی ئەم زیتەڵیی‌و تاقەت‌وتوانا‌و زانینەكات بەفیڕۆدانەو.. كەنەفتی‌و ئفلیجی سەركردایەتی‌و پەرش‌و بلاْوكردنەوەی وزەو توانای سەربازركانیشە.

١٦- لە دێر زەمانەوە دانایان فەرموویانە:

ئەركی پاشا دابینكردنی كاروبارە (عەسكەرییێكانە)و.. ئەركی سەركردەیش راپەڕاندنیانە..

(هەر یێكە لە بواری پسپۆڕییێكەیدا).

١٧- سەركردەی عەسكەریی دەبێ جڵەو بۆ غایلەو ختوورە عەسكەرییێكانی شل نەكات‌و.. خۆی لە شەڕێكەوە نەگلێنێ لە بەرژەوەندیی نەتەوەدا نەبێ‌و.. مەبەستەكانی سەركردە تێیدا بۆ بەدەستهێنانی سەروەریی شەخسیی خۆی بێت.

١٨- كارێكی هەڵەیە.. پاشای وڵات هەر لەبەرئەوەی رقی لە نەیارێكی خۆیەتی.. بچێ شەڕێ هەڵگیرسێنێ.

كارێكی هەڵەیە.. سەركردە شەڕێ بنێتەوە.. هەر لەبەرئەوەی لە سەركردەییێكی وڵاتی دوژمن بە رق و كینەیە.. رق و كینێ پێوەندیی بە بەرژەوەندییێكانی وڵات و نەتەوەوە نەبێت.

چونكە كینەی شەخسیی بە جەنگ و تۆڵە تیمار ناكرێ.. راستە پاشا یان سەركردە ئۆخەی دەكەن.. وەلێ وڵات و نەتەوە تێوە دەگلێن.. وڵات تووشی بەڵادەبێ و نەتەوە نەهامەتیی دایدەگرێ.

ئەو زیانانەی لە وڵات و نەتەوە دەكەون.. بە زەمەنێكی دووروودرێژ نەبێت قەرەبوویان ناكرێتەوە.. وڵات و نەتەوەش بارگیرێ نین.. هەر كاتێ پاشا یان سەركردە.. ئارەزوو غەرەزێكی شەخسیی لە كەللەدا بوو.. بێت و سواری ببێت.

سەركەوتنی شەخسیی پاشا.. یا سەركردە.. لە جەنگێكدا نەتەوە هیچ هەوەجەییێكی تێنەكەوتبێت.. سەركەوتنێكی كلۆڵانەیەو.. زۆرگرانیش دەكەوێ.. كوژراوان جارێكی دی زیندوونابنەوە.. هیچ مرۆڤێكیش هەر بۆ دامركاندنەوەی غەرەزو كینێكی نێو هەناوی خۆی..

مافی لەنێوبردنی گیان و ژیانی نییە.

١٩- كەواتە پاشای هێمن و بەنەزاكەت ئەوەیە.. بەتەنگ ئاگاداریكردن و پارێزگاریی بەرژەوەندییێكانی نەتەوەو سەلامەتیی وڵاتەوە بێت.

سەركردەی عەسكەریی رەسەن و بەسەلیقە.. هەڵپە هەڵپ ناكات و..
وزەو توانای سەربازان ناخاتە قەمچی مەبەستە زاتییێكانی خۆیەوە.

ئەركی سوپا پاراستنی سەلامەتیی نەتەوەیە.. ئەركی پاشایش سەرەوكاریكردنی بەرژەوەندییێكانی خەڵكییە.

ئەگەر سوپا ئەركەكانی خۆی زانی و.. پاشایش بەباشی سەرەوكاریكرد.. سەلامەتیی نەتەوە بەركەماڵ دەبێ و.. بەرژەوەندییێكانیشی گەشەدەسەنن.

# بەشی سیانزەهەم

## هەواڵگـــریی[40]

---

[40]- یان (ئیستیخباراتی عەسکەریی) یان (بەکارهێنانی هەواڵدن).. ئەمەی دواییان لە هەندێ لە تەرجەمەکانی کتێبی (هونەری جەنگ)دا.. کراوەتە نێونیشانی ئەم بەشە -بەشی سیانزەهەم-.

(سۆن-تزو) فەرمووبەتی:

١- کاتێ سەدهەزار پیاو بە سەرباز دەگیرێن و.. بۆ مەسافەی دوور دوور دەنێررێن.. مەسرەفی ئەوانە لە ئەستۆی گەل و بەسەر گەنجینەی وڵاتەوەیە.. خەرجیی تەنیا رۆژێکی ئەمجۆرە هەڵمەتە عەسکەرییانە سەد پارەی زێڕە.

بێگومان ئەم خەرجییانە دەبنە مایەی هەندێ بارگرانی بەسەر تواناو تاقەتی نێوخۆو دەرڤەی وڵات و نەتەوەوە.. خەڵکی بۆ گواستنەوەی زەخیرەو پێداویستییکانی دی سوپا دەکەونە نارەحەتییەوە.. ئەم نارەحەتییە لەڕووی دەروونیشەوە حەوتسەد هەزار کەسی دی نێو خێزانی سەربازەکان دەگرێتەوە.

(تساو-تساو) وتوویەتی:

"لەنێو کۆمەڵی کۆندا خیزان لە هەشت کەس پێکدەهات.. هەر کاتێ سەربازگیری عەسکەرییانە بۆ جەنگ بهاتایە ئاراوە.. لە هەر خێزانێ پیاوێکیان دەبرد.. ئەندامانی دی ئەو خێزانە دەکەوتنە ژێر باری وەدەستخستنی هۆکارەکانی گواستنەوەو تفاق گەیاندنە ئەو ئۆردووگەیەی کەسەکەی خۆیانی لێیە.

بەمجۆرە کشتوکاڵکاری و پیشەسازیی ئەندامانی دیکەی خێزانەکەیش پەکیاندەکەوت.

ئەگەر ژمارەی پیاوانی هەڵەتە عەسکەرییێکە سەدهەزاربن.. بارگرانیی شەڕەکە حەوتسەد هەزار هاووڵاتی دیکەش دەگرێتەوە.

٢- ئەگەر پێداویستییێکانی جەنگ.. لە ململانێ و خۆ تەیارکردن و شەڕی یێکلاییکەرەوە لەگەڵ دوژمنێکی سەرسەختی خوێنەخوێدا.. ساڵانێکی زۆری خایاند..

لەم حاڵەتانەدا چەند دەستەو نموونەییێك لە خەڵکانی داخلەدڵ دەردەکەون.. بەهۆی ئەوەی سەرکردایەتی لە عەلاوە و پلەو پاداشتپێدان پشتگوێیخستوون..

یان هەر خۆیان بەتەبیعەت شەیدای زێڕن..ئەوانە ناموسیان بە سەد پارچە زێڕ دەگۆڕنەوە.. یاخود هەر گەمژەن و هیچ لەبارەی مەرامەکانی دوژمنەوە نازانن و.. مەیلی بەجۆشی شەڕیان تێدا نییە.

ئەمجۆرە نموونەو دەستەو تاقمانە.. پێوەندییێکی قرچۆکیان بە سەلامەتیی نیشتمان و ولاتەوە هەیە.. هیچ مەیلێکیشیان بەلای شەرەفی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا نییە.

٣- لەبەر ئەوە پاشای زرنگ.. یان سەرکردەی دانا.. لەکاتی دابینکاریی بۆ بەزاندنی دوژمن.. هەوڵدەدا بەر لە دەستپێکردنی عەمەلیاتی عەسکەرییانە.. زانیاریی (ئاگاداری..هەواڵزانین)ێکی پێشوەختی لەمەڕ رەوشی دوژمن هەبێت.

**( هو-یان-هسی ) وتوێتی:**

"لە کتێبی ولاتی (چاو)دا.. بەنێوی (کاروباری ئەفسەری عەسکەریی).. بەشێکی تایبەتیی لەمەڕ کاروباری (بەڕێوەبەری گشتیی هەواڵدزیی) تێدایە.

ئیشــوکاری ئــەم بەڕێوەبــەرە سەرپەرشــتیکردنی کاروبــاری هەواڵدزییە لەنێو وڵاتی دوژمندا." [41]

٤-ئەوەی لە (زانینی پێشوەختی ڕەوشی دوژمن) مەبەستمانە.. ئەو زانیاریانەن لە ئاسمانەوە بۆ کەس نایەنە خوارەوە.. نە لە ئەستێرەگەریدایەو نە لە بەئاگایی مێژووی کۆنینەدایە.. ئەم زانیاریانە دەبێ تەڕو تازەبن و.. لە کەسانێکیشەوە وەرگیرابن زۆربەباشی لە ڕەوشەکانی دوژمن ئاگاداربن.

٥-پێنج جۆر پیاوی هەواڵدز (جاسووس) هەن.. پێویستە بخرێنەکار:

هاووڵاتیانی نێو میللەتی دوژمن.

بەکرێگیراوانێ لە دەزگەییێکی نێوخۆی دوژمن.

بەکرێگیراوانێ خزمەتی دوژمن و نیشتمانیش دەکەن.. (بەکرێگیراوی جووتسەرە).

بەکرێگیراوانی کاتیی.. دەتوانرێ دوای بەجێهێنانی ئەرکەکانیان دەسبەرداریان بن.

بەکرێگیراوی درێژخایەن.

---

[41]- هەندێ لە توێژەرانی یێکەمین تێکستی کتێبی (هونەری جەنگ).. لەو بڕوایەدان: ئەم بڕگەیە جەختکردنێکە لەسەر بایێخی هەواڵدزیی سەبارەت ڕەوشی دوژمن.. گەرچی فەرمایشتە ئایینێکانی (کۆنفۆشیۆس) دژی جاسووسیکردنە بەسەر خەڵکییەوە.. هەواڵدزیی لە خانەی بوختان دادەنێت.. ئایینەکان نەهی لێدەکەن.

٦- دەبێ بەڕێوەبەری گشتیی هەواڵدزی.. هەر پێنج جۆرەکە لە یێك کاتدا بەکاربێنێ.. بێئەوەی هیچکامیان ئاگاداری کاری ئەویدی بێت.. دەبێ نە شێوازی کارکردنو نە بواری چالاکی ئەویدی نەزانێت.

ئەم پێنج چەشنە دەزگەییێك پێکدەهێنن بەنێوە (نهێنپارێزی پیرۆز) یان (پەردەپۆشە پیرۆزەکە)و..ئەمە دەزگەییێکە سوڵتان شانازیی پێوەدەکات.

٧- جۆری یێکەم لە هاووڵاتیانی ژێر دەسەڵاتی دوژمن پێکدێ.

٨- جۆری دووەم دەستەییێکن لەوانەی لەنێو دەزگەی عەسکەریی دوژمندا پلەو پایەی رەسمییان هەیە.

**(مۆ-تۆ) وتوێتی:**

"لەنێو چینی دەسەڵاتداردا.. دەستەییێکی رەوشتبەرز هەن.. دەوڵەت خراپەی بەرامبەر کردوون.. یان پشتگوێیخستوون.. یاخود لەبەر هەر هۆییێك بێ ئازاریداون.

دەستەییێکیش هەن دوای ئەوەی چەند هەڵەییێکیان لێوەشاوەتەوە.. زۆر بەتوندی سزادراون.. دەستەییکی چڵێسو چاوچنۆك هەن.. وەدووی سەروەرییو سامان وەدەسهێنان کەوتوون.. وەلێ بەئاسانترین رێگە.

دەستەییێکی بەتواناش هەن.. هەرچەندە شایانی پلەوپایەی بەرزیشن.. بەڵام دەوڵەت هیچ بەتەنگیانەوە نایەتو.. لەپلەییێکی زۆر نزمدا فڕێدراون.

دەستەبێکیش هەن کاروانی ژیان تێپەڕاندوون.. لێ بەتەمای دەسەڵاتو پلەوپایەی بەرزی بەپەلەن..

دەستەییێك هەلپەرستیش هەن.. دەخوازن دۆخە نائاساییێکە بۆ پترکردنی دەسەلاتیان.. یان کەڵەکەکردنی سامان یان بۆ تۆڵەسێنی لە دوژمنەکانی نێو دەسەلاکەیان بقۆزنەوە..

هەروەها دەستەییێکیش هەن هەر بەتەبیعەت خەریکی دووڕوویی و یاری لەسەر دووپەت کردنن.. یان لە ئان‌وساتە ناسك‌و شلۆقەکاندا گرەوو گەنجەفە بە موقەدەراتی نەتەوەوە دەکەن.. ئەگەر چی ئەو لاساری‌و جەربەزەییانەی ئەم دەستەیە.. بەرژەوەندییێکانی نەتەوە بخاتەبەر مەترسییێکانی دوژمنیشەوە.

دەبێ بەڕێوەبەی گشتیی‌هەواڵدزی.. حاڵەتە تایبەتییێکانی هەر یێکێ لەم دەستەو تاقمانەی نێو خاکی دوژمن تاوتوێ بکات‌و..هەوڵی پێوەندی پێوەکردنیان بدات.. بۆئەوەی هەر دەستەییێك بەپێی خاڵە لاوازە شەخسییێکانیان‌و مەبەست‌و ئارەزووکانیان هەڵفریوێنیێ‌و.. بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیاری‌و هەقیقەتانەی بەڕێوەبەری هەواڵدزی لەدور وزەو توانای دوژمن مەبەستێتی کۆیبکاتەوە.. یان بۆئەوەی ناکۆکی بخاتە نێو ریزەکانی دوژمنەوە.

٩- بەکرێگیراوی جووتسەرە.. ئەو جاسووسەی دوژمنەیە ئێمەیش بەکاریدێنین‌و.. دەشزانین هەواڵدزی دوژمنە.

(لی-شوان) وتویەتی:

"ئەگەر دوژمن هەواڵدزەکانی نارد تا بزانێ وزەو توانام چەندەو چەند نییە.. یان چەند ئامادەکاری‌و چەند دابینکاریم کردووە.. هەوڵدەدەم لە بەرتیلپێدانی ئەو هەواڵدزانەدا دەستبلاوو میهرەبانبم.. تاکو بیانکەمە هەواڵدزی خۆم بەسەر دوژمنەوە."

١٠- ئـــەو بەکرێگیراوانـــە (یـــان هەواڵدزانـــە)ی دەشـــێ دوای بەکارهێنانیان وازیان لێبهێنرێ.. ئەوانە گەرچی بەکرێگیراوێکی سەر بەخۆمانن.. وەلێ بەئەنقەست سەبارەت بەخۆمان چەند زانیارییێکی هەڵـەیان دەدەینـێ.. (تـاکو ئەگـەرەکیش کەوتنـە دەسـت دوژمـن و بەتۆپزی ئیعتیرافیان پێکردن.. با ئیعتیرافەکانیان لەو زانیارییە هەڵانە واوەتر نەبن کە لە ئەسڵا بۆ ئەم مەبەستە داومانەتێ.)

(تۆ-یۆ) وتوێی:

"جاروبـار واتـەواتێکی پڕلـە زانیـاری هەڵـە دەخەینـەوەو.. لێدەگـەڕێین بـەکرێگیراوانمان بـە واتەواتەکـە بـزانن.. بـەڵام نـەزانن هەڵەیە.. ئیدی کاتێ ئەو بەکرێگیراوانە لەنێو خاکی دوژمندا چالاکی دەکـەن و.. بـە یێخسـیری وەدەسـت دوژمـن دەکـەون.. ئەگـەر کەوتنـە نهێنی درکاندن.. ئەوا هـەر ئـەو نهێنیانـەیان لایە لـە ئەسڵدا هەڵـەن و.. دوژمن باوەڕیان پێدەکات و.. کاروبارەکانی لەسەر بنچینەیێکی هەڵـە چێدەکات.. ئێمـەیش دەتـوانین بێئـەوەی دوژمن پێبزانـێ کاروبـاری راستەقینەی خۆمان بە دڵنیاییێوە هەڵسووڕێنین.

کـاتێ دوژمـن بـەوەی زانـی چـۆن لەخشـتەمانبردووە.. ئـەوا بـەکرێگیراوە یێخسـیرەکان لەسـەر درکانـدنی ئـەو زانیارییـە هەڵانـەی ئەسڵەن ئێمە داومانەتێ.. دەکوژێ."

(چانگ-یۆ) وتوێتی:

"لە سەروبەندی بنەماڵە فەرمانڕەواکەماندا.. (تساو)ی سەرکردەی سوپا.. زیندانییێکی هێنا فەرمانی ئیعدامکردنی درابوو.. بەرگی رەبەنێکی ئایینی لەبەرکردو.. بە تۆپزیی پارچە مۆمێکی پێقووتداو..

ڕەوانەی ناوچەی (سانگۆت)ی کرد.. هەر ڕەبەنی ساختە پێی نایە خاکی دوژمنەوە.. دەسگیریانکرد.. خەبەری دانیٚ پارچە مۆمێکی قووتداوە.. زۆریان بۆ هێنا مۆمەکە لەگەڵ پیسایێکەیدا دانیٚ.. پارچە مۆمەکەیان کردەوە.. نامەیێکیان تێدا بینی لە (تساو) سەرکردەی سوپاوە.. ئاراستەی (سەرۆکی نەخشەدانانی هەڵمەتە جەنگییێکان)ی سوپاکەی کردبوو.

زەعیمی سوپای دوژمن پیاوێکی دڵڕەق و هەمەجی بوو.. بە نامەکە زۆر تووڕەبوو.. فەرمانیدا سەری گەورە وەزیرەکەی بڕن و.. فەرمانی ئیعدامکردنی ڕەبەنە جاسووسەکەیشی دەرکرد.

"ئەمجۆرە بەکرێگیراوانە لەوانەن دەتوانریٚ دوای بەکارهێنانیان خۆیان لێقوتار بکریٚ.. بوارەکانی بەکارهێنانی ئەم هەواڵدزانە زۆرن.

لە هەندیٚ حاڵەتدا.. لەلایەن خۆمەوە دوو نوێنەر بۆ دانوستانی ڕێکەوتن دەنێرمە لای دوژمن.. ئەوجا لە ئانوساتی دانوستانەکەدا هێرشێکی لە نکاوی بۆدەبەم."

١١- بەکرێگیراوانی جۆری (درێژخایەن).. ئەوانەن بۆ خۆم بەتەنگ سەلامەتییانەوەم.. چونکە گەڕانەوەیان بۆلام و هێنانی ئەو زانیاریانەی لە خاکی دوژمنەوە کۆیانکردۆتەوە پێویستمە.

**(تۆ-یۆ) وتوێتی:**

"پیاوانێکی نایاب بۆ ئەم ئەرکە هەڵدەبژێرین: زیرەکبن.. بەهرەداربن.. خاوەن ئاوەزێکی دانا و بەتوانابن و.. شەخسیەتێکی بەجەوهەری ئەوتۆی هەبێت بتوانیٚ پێوەندیی بە خاوەن دەسەڵات و زانیاریزانەکانەوە بکات و.. خۆی بگەیەنێتە لای پیاوماقووڵان و

وەجاخزادەکـانی وڵات.. ئەوانـەی لـەنێو جومگـەکانی دەسـەڵاتو حوکمدا پلەوپایەدارن .

بـەمجۆرە ئـەم چەشـنە بەکرێگیراوانـە.. دەتـوانن لـە نزیکـەوە چـاودێری کاروبـاری دوژمـن بکـەنو.. زانیـاریی زۆر وردو هەمەلایەنەشـیان لەمـەڕ دابینکارییێکـانو وزەو توانـاو مەبەستەکانیشییێوە دەستبکەوێ.. کاتێ ئەو بەکرێگیراوانە زانیاریی تەواو سەبارەت رەوشی دوژمن کۆدەکەنەوە.. دەگەڕێنەوە لامان تاکو پێمـانی بگەیـەننو بۆمـانی شـەرحکەن.. لەبـەر ئەمـە ئـەوجۆرە بەکرێگیراوانـەمان ناونـاون (بـەکرێگیراوانی درێژخایـەن)و.. تـا لـە تواناماندابێو پێمانبکرێ بەتەنگ سەلامەتیانەوە دەبین."

(مۆ-تۆ)ش وتویەتی:

"ئەم بەکرێگیراوانە لەوجۆرە گرینگانەن.. بەردەوام دێنودەچنو هاشۆدەکەنو راپۆرتەکانیان دەکەنە پەیامو بۆمانی دەنێرن.. ئەمجۆرە لـەنێو ئـەو پیـاوە هوشـیارانەی خۆیـان وەك گێـل نیشـاندەدەن هەڵدەبژێرین.. ئەو پیاوە زرنگانـەی گەمژە دەنوێنن.. لەنێو پیاوانی دڵئازادا.. لەنێو ئەوانەی دەتوانن لە رەفتاردا نەرمو نیان.. لەرەوشتدا چـابووك.. لـە شـاردنەوەو سـەرلێتێکدانی بەرامبـەردا بەسـەلیقەو زۆرزانـبن.. سـەرباری بـوێریو جـوامێری شەخسـیی بـۆ ئـەو کـاتو هەڵوێسـتە شـلۆقو ناسـکەکانەی ئازایـەتیو توانـاو هێمنیـت لێدەخوازن.

لە پێداویستییێکانی ئەمجۆرە بەکریگیراوانە.. دەبێ چەردەییێکی باش زانیارییان لەمەڕ چینو توێژەکانی کۆمەڵ هەبێت..جا ئیدی ئەو

چین‌و تویژانە چەندێ نزم‌و کەمبەهابن گرینگ نییە.. هەروەها دەبێ لەژێر زەبری برسێتی‌و سەرماو پیسی‌و ئازارو چەوساندنەوەدا خۆڕاگربن."

١٢- پتەوترین پێوەندیی.. پێوەندیی نێوان ئەفسەران‌و سەرکردەی بالای هێزە چەکدارەکان‌و..ئەو هەواڵدزانەیە.. یان ئەوشارەزایانەی نێو دەزگەی هەواڵگری عەسکەرییە..بەخشندانەترین خەرجیش هەر بۆ ئەو هەواڵدرانەیە.. تاکو بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانیان بەباشی خەرجیکەن.. وردترین نهێنییێکانی سوپا ئەوان پێیدەزانن.. هەروەها بەرپرسانی هەموو ئەو هەواڵگرانەی لە بەرژەوەندیمانن ئاگایان لێیەتی.

(مای-یاو-چان) وتویێتی:

"هەواڵدزان‌و بەرپرسانی هەواڵگریی عەسکەریی..رێنماییێکانیان راستەوخۆ لە رەشمالی سەرکردەی بالاوە وەردەگرن.. ئەمانە کەسانێکن زۆرترین پێوەندییان بە سەرکردەی بالاوە هەیەو.. مایەی ئەوپەڕی متمانەن لەلای"

١٣- بۆئەوەی بەباشی سوود لەم هەواڵدزانە وەربگیرێ.. دەبێ ئەو کەسەی لە سەرکردایەتی سوپادا لێیان بەرپرسە.. پیاوێکی داناو زرنگ بێت.. خاوەنی دڵ‌و دەروونێکی مرۆڤدۆست‌و پڕلە مەیلی دادپەروەری بێت.. ئەوەی رەنگ‌وڕوو و زمانشیرین‌و بەسەلیقە نەبێت ناتوانێ سوود لە وزەو توانای هەواڵدزان وەرگرێت‌و.. ناشتوانێ پرسوڕایان لدور ئەو زانیاری و ئەزموونانەی هەیانە لەگەڵدا بکات.

(مۆ-تۆ) وتویێتی:

"بەرلە هەر شتێ.. دەبێ جەخت لەسەر نێوچەوان و رەفتارو رەوشتی ئەوەی بۆ هەواڵدزی هەڵیدەبژێرین بکرێت.. تاکو بزانین دڵسۆزی و راستگۆیی و زیرەکی چەندە.. ئەوساکە دەیخەینە کارەوە.

هەندێ بەکرێگیراو لەوانەی بەبێئەوەی بەوردی لە رەوشی دوژمن تێبگات.. لە ئەرکەکەیدا هیچی بەخەیاڵدا نایەت.. جگە لە سامان کۆکردنەوە نەبێت.. ئەمانە جگە لە قسەی بۆش و پڕوپووچ و بێمانا هیچی دیکەمان بۆ ناهێنن.[٤٢]

شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەمجۆرە هەواڵدزانەدا.. ئەوپەڕی وردبینی و وریایی و.. هەروەها ئەوپەڕی فێڵبازیشی گەرەکە.. هەوڵدانیش بۆ ساغکردنەوەی ئاستی راستگۆیی و ساختەکاریی لە راپۆرتەکانیداو.. هەڵهێنجانی هەقیقەتەکانیش لە پێچ وپەنای ئەو قسە بۆشانەی گەلێجار ئەم هەواڵدزانە پەنای وەبەردەبەن".

(مای-یاو-چان) وتویێتی:

"خۆت لەو هەواڵدزەی لەوەوبەر بەکارتهێناوەو دوایی وەلتکردووە بپارێزە.. نەوەك بەرژەوەندی و نەخشەکانت لێبشێوێنێ."

١٥- ئەگەر ئەو نەخشەو دابینکارییە نهێنیانەی سەرکردایەتی کاروبارە عەسکەرییەکان سازیکردوون.. لای دوژمن ئاشکرابوو..هەواڵدزیش لەم کەتنەدا بەرپرسیار بوو.. دەبێ ئیعدام بکرێ.. ئەوانەیش ئەم نهێنیانەی لا درکاندوون لەگەڵیدائیعدامکرێن.

---

[٤٢]- بەمجۆرە هەواڵدرانە دەوترێت (کارگەی کاغەز)

(چانگ-هاو )وتویەتی:

"پاكانـەی كوشـتنیان هـەر بـۆ دەمبەسـتیانەو.. بۆئەوەیشـە نەهێڵرێت دوژمن بەو نهێنیاتە بزانێت."

١٦- وا باوە.. ئەگەر بڕیارتدا لە هێزەكانی دوژمن بدەیت.. یان شـارەكەیان بۆردمانبكـەیت.. یـاخود بەرپرسـەكانیان تیرۆربكـەیت.. پێویسـتە پێشـوەخت نـاوی سـەركردەی بـەرپرس و.. نـاوی گـەورە ئەفسـەرو.. ناوی عەریفـەكانی سـەربە دەوارەكـانی سـەركردەو گـەورە ئەفسـەرو... نـاوی پاسـەوانانی دەروازەی ئۆردووگەكـەو.. نـاوی پاسەوانانی تایبەتی سەركردەو گەورە گەورە ئەفسەران... بزانیت.

بەرلـەوەی دەسـتبدەیتە هـەر یێكـێ لـەو كارانـە.. كـە لـە نەخشەدانان و راپەڕاندنیاندا پێویستیان بە وردبینیـە.. دەبێ فـەرمان بە هەواڵدزانت بدەیت.. بە وردی ئەو زانیاریانەت بۆ كۆبكەنەوە.

(مۆ-تۆ ) وتویەتی:

"ئەگـەر مەبەسـتت ئـەوەبوو شـەڕی هێرشـبردن بكـەیت.. دەبـێ پێشـوەخت نـاوی ئەوبەرپرسـانەی لـەنێو ریزەكـانی دوژمنـدان و.. پێوەنـدییان بـە دابینكـاریی هێرشـبرنەكەتەوە هەیـە بزانیـت.. ئـاخۆ ئەوانـە ژیـرن یـان سـەرەخەرن!؟ لێـزان و بەسـەلیقەن یـان هەڵەشـە !؟ تەوەزەلن یان ترسنۆكن یان.. یان...

دوایئـەوەی لـەوە دڵنیـادەبین .. بـەپێی ئـەو زانیارییـە راسـت و دروسـتانەی كۆمانكردوونەتـەوە.. ئـەوجا نەخشـەكانی هێرشـبردن دەكێشین.

کاتێ پاشای (هان) بڕیاری هێرشبردنه سەر (وای-باو)ی دا.. سێ سەرکردەی بۆ هەڵمەتی عەسکەریی هەڵبژارد.. کۆیکردنەوەو لێیپرسین:

-سەرکردەی باڵای سوپای دوژمن کێیە؟

وەڵامیاندایەوە:

- سەرکردە (ڤۆ-چێ)یە.

**پاشا وتی:**

- هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمی دێت.. ئەو پیاوە نییە ڕووبەڕووی سەرکردەی باڵامان بوەستێ.. ئەی سەرکردەی سوارچاکانی دوژمن کێیە؟

وەڵامیاندایەوە:

- سەرکردە (ڤانگ-شینگ)ە

**پاشا وتی:**

- ئەوەیان کوڕی (ڤانگ-ڤۆچێ)ی گەورە سەرکردەیە.. ئەوە سەرکردەییەکی لێوەشاوەیە.. وەلێ لە ئاستی سەرکردەی سوارچاکانی سوپاکەماندا نییە.. ئەی سەرکردەی جەنگاوەرە پیادەکانی سوپای دوژمن کێیە؟

- سەرکردە (کوان- ینگ)ە

**پاشا وتی:**

- ناگاتە ئاستی (تساو-تساو)ی سەرکردەی ئێمە.. لە سەرکردایەتی دوژمندا کەسی وای تێدا بمانترسێنێ.. کەواتە پشت بە ئاسمان با دەستپێبکەین."

١٧- پێویستە ئەو هەواڵدزانەی دوژمن بۆئەوەی ناردوون جاسووسیت بەسەرەوە بکەن.. بیانقۆزیتەوەو مەیلیان بەلای خۆتدا راکێشیت.. یان بە بەرتیلپێدان هەڵیانفریوێنیت.. تاکو لە کاروباری هەواڵگریو هەواڵدزیدا بکەونە خزمەتتەوە.. هەرچی زانیارییەکت گەرەکە فەرمانیان پێبدە بۆت کۆبکەنەوەو.. لەتەکیاندا نەرمونیانبە.. بەم شێوازە هەواڵدزی (جووتسەرە) بەکاردەهێنرێت.

١٨- هەواڵدزی جووتسەرە بەزۆری جاسووسێکی وڵاتی دوژمنە.. یان پلەو پایەدارێکی نێو مەڵبەندی سەرکردایەتی سوپاکەیانە.. ئا لەوانە بەکرێگیراوی (جووتسەرە) چێ دەکرێت.

(چانگ-یۆ) وتوێتی:

"لەبەرئەوەی هەواڵدزی جووتسەرە بەباشی ئاگاداری رەوشی وڵاتەکەیەتی.. پێوەندییێکی بەردەوامیشی بەکەسانی نەفس نزمو.. ئەفسەرانی لە سوپاو وڵات بەقینەوە هەیەو.. هەمووشیان باش دەناسێت.. کەواتە ئەم هەواڵدزە جووتسەرە دەتوانێ بەکرێگیراوانی دیکەیش بدۆزێتەوەو.. بیانخاتە خزمەت ئەو لایەنەی رایانگرتووە."

١٩- هەواڵدزی جووتسەرە بۆئەوەیش دەستدەدات.. زانیاریی چەواشەو هەڵە لە توّوە بۆلای دوژمنیش بەرێت.. بەمەیش وایلێدێت.. دوای ئەوەی کارت پێی نامێنێت.. بچێتە خانەی ئەوانەی بۆ هەتاهەتایە لە کۆڵی خۆتی داماڵیت.

(چانگ-یۆ) وتوێتی:

"لەبەرئەوەی هەواڵدزی جووتسەرە دەتوانێ پەی بەوە ببات.. دوژمن تا چەند دەتوانێ ئەو زانیارییە جۆربەجۆرانە بقۆزێتەوە..

ئەوساکە تۆ زانیاری پڕلە هەڵەی وای دەخەیتە بەردەست تا بیگەیەنێت.. دوژمن پەرۆشی قۆزتنەوەی بێت.. ئیدی لێیدەگەڕێیت بۆ خۆی دووچاری چارەنووسی خۆی بێت.. بە ئەشکەنجەدانبێت.. یان کوژران بەدەستی دوژمن."

٢٠- هەواڵدزی جووتسەرە بۆ ئەوەش باشە بە کاری درێژخایەنیشەوە وەگەڕبخرێت.. بەمەرجێ بەباشی هەڵیسووڕێنیت.. یان کارەکەت لەڕووی زانیاریی کۆکردنەوەوە وای سەپاند تەمەنی ئەم بەکرێگیراوە درێژە بخایەنێ.. ئەوسا پێویستە سەلامەتی بپارێزیت.

٢١- پاشای وڵات دەبێ زۆر بە وردی ئاگاداری کاروباری ئەم پێنج جۆرە هەواڵدزانە بێت.. هەروەها هی ئەوانەیش کاروباری هەواڵگرییان لە هەموو ڕوویێکەوە لەئەستۆدایە.. سەلامەتیی وڵات لەسەر هەڵە یان پشتگوێخستنی کاروبارە وردو ناسکەکانی هەواڵگریی وەستاوە.

پاشای وڵات بۆ ئەم مەبەستە.. دەتوانێ هەواڵدزانی جووتسەرە بۆ چاودێریکردنیان دابنێ.. لەم حاڵەتەدا دەبێ پاشا زۆر بەتەنگ ئەم هەواڵدزە جووتسەرانەوە بێتو.. لە مامەڵەکردنیاندا زۆر وریابێت.

٢٢- لە زەمانی کۆندا چەندین ڕووداوو کەسێتی.. پیاوانێکی هەواڵدزیان گەیاندۆتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی.. بەنموونە: (ئی-چێ) فەرمانڕەوایی وڵاتی (یان)ی گرتەدەست.. لەوەوبەر بەکرێگیراوی وڵاتی (هسیا)بوو.. هەروەها (چاو)یش بەهۆی (لۆ-یۆ)ی

بەکرێگیراوەوە گەیشتە سەر تەخت.. ئەمیش لەوەوبەر هەواڵدزی ویلایەتی (یین)بوو.[٤٣]

**(چانگ-یۆ) وتویەتی:**

"(ئی-چی) بەرلەوەی فەرمانڕەوایی بگرێتەدەست.. بەکرێگیراوێکی ولاتی (هسیا) بوو..(تساو)یش بەرلەوەی دەستبەسەر دەسەلاتدا بگرێت..بەکرێگیراوێکی ولاتی (یان) بوو."

٢٣- کەواتە پاشای ژیرو سەرکردەی بەسەلیقە دەتوانن سەرەوکاریی دەزگە هەواڵگرییەکان بکەن و.. نەیەڵن لاقرتێ بە دەسەلات بکەن.. یان راوی بکەن.. یان خراپ بیخەملێنن.. یاخود کۆکردنەوەی هەموو ئەو زانیاریانەی ئەرکی هەواڵگریی بۆ مەیسەرکردنی کاروبار پێوستێتی پشتگوێیخەن.

کردەوکۆشە نهێنییەکان بۆ کاروباری جەنگ پێویستن.. سوپا بۆ هەموو پرۆسە عەسکەرییە سەرکەوتووەکانی پشت بە هەواڵگرییە راست و دروستەکان دەبەستێت."

**(شیا-لین) وتویەتی:**

"سوپا بەبێ دەزگەیێکی هەواڵگریی تۆکمەو دامەزراو.. بە پیاوێ دەچێ (کەڕو کوێر) بێ.. نە چاوی هەبێ نە گوێ."

---

[٤٣]- چەند وتەبێژو مێژوونووسێکی چینی کۆن نارەزاییان بەرامبەر دانەری کتێبی (هونەری جەنگ) دەربڕیوە.. بۆ ئەو ئیماژەیەی لەمەڕ ئەو فەرمانڕەوایانەی گوایە بەکرێگیراوبوون داویەتی.. یان بۆ گەیشتنە سەر تەختی دەسەلات هانایان وەبەر بەکرێگیراوان بردووە.. وەلێ راستییەکان هەر راستین و.. پاکانەو بیانووهێنانەوەی ئەو مێژوونووس و وتەبێژانەی لە هەقیقەتبێژی دەسڵەمێنەوە قوبووڵ ناکەن.

# HUNERÎ CENG

Danani
Son -Tzü

Wergêrani
Reüf Hesen

Slêmanî -2004

هەرشـ . . . . . ـەرکەرێکو دەرەجەدارێکی
عەسکەریی و حیزبـ ـیی هەڵدەسـ ـتێو . نە هەر
سەبارەت بەجەنگ بـ ـەڵکو لەمەڕ سیاسـ ـەت و
تەنانەت ژیانیش دەدەکاتەوە . بیکسـ . . ـەر
پێماندەڵێ : براله شەڕو سیاسەت ئەخلاقیان
تیا نییە . بێگومان مەبەستیان لەم بـ ـیانووە
گەوجانەیە . کـ . . . . ـەوا دەزاڵـ . . . . . ـن
فەلسـ ـەفەیە . دەخوازن شـ ـەرعییە بـ . ـە
بـ ـێمروەتی و تاوانکاری و دڕندەیی وەحشـ ـێتی
خۆیان بـ . . . ـدەن . جا ئیتر ئەم هەمە جێتییە
بەنێوی ڕێسای ئایین و ئاسمانەوە بـ ـێت . یان
بەنێوی عەلمانی و مۆدێرنە و یاسـ ـای زەمینەوە
بـ ـێت . لەدێرزەمانەوە وەك لەبـ ـەندو بـ ـڕگەو
ئیماژەکانی نێو ئەم کتێبەدا دەبینین لە لایەن
زەمین و ئاسمانیشەوە بەئەفرەتکراوە

نرخی [redacted] ناره